هەدیە لە ...

# دیـــــوانی

# میرزا ئەحمەدی داواشی

کۆکردنەوەی: حوسەین موحەممەدی

پیاچوونەوەی: حەبیب الله کەریمی






داواشی، احمد، ۱۲۷۹ - ۱۳۵۹.
دیــوانــی مــیرزا ئــەحمەدی داواشــی / کـوکردنە وەی حـوسەین موحەممەدی؛ پیاچوونە حبیب‌الله کریمی.
تهران: احسان، ۱۳۸۹.
۶۹۴ ص. ISBN: 978-964-356-497-1
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱. شعر کردی -- ایران -- قرن ۱۴. الف. کریمی، حبیب‌الله، مصحح. ب. محمدی، حسین، ۱۳۳۸ - ، گردآورنده. ج. عنوان.
PIR ۳۲۵۶/س۷۴۳د۲۳ ۸۱۵۱/۲۱فا
۱۳۸۹
کتابخانه ملی ایران ۲۳۲۴۲-۸۳م




**دیوانی میرزا ئەحمەدی داواشی**


| | |
|---|---|
| ✦ کۆکردنەوەی: | حوسەین موحەممەدی |
| ✦ پەخشکار: | نەشری ئێحسان |
| ✦ تیراژ: | ۲۰۰۰ دانە |
| ✦ چاپی: | یەکەم، سالی ۱۳۸۹ هەتاوی |
| ✦ مافی چاپ: | بۆپەخشکار پارێزراوە |
| ✦ قیمەت: | ۱۰۰۰۰ تمەن |

ISBN: 978-964-356-497-1
شابک: ۱-۴۹۷-۳۵۶-۹۶۴-۹۷۸



دفتر مرکزی:
تهران .خ انقلاب . خ صفی علیشاه،
کوچه تهرانی، پلاک ۳۴
تلفن: ۷۷۵۳۲۶۵۵

## پێرست


کورتەیەك لە ژیان نامەی خوالێخۆشبوو «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........ ١٣
پێشەکی و خۆناساندنی شاعێر ........................ ٢٣
موناجات و تەوحید .......................... ٢٥
شەوی بە دنیا هاتنی «پێغەمبەر» (ص) ................ ٣٥
یا «رسول‌الله» ........................... ٣٦
مەدحی حەزرەتی «موحەممەد» (ص) ................... ٣٧
قسەی سەنگ تەراش و حەزرەتی مووسا (ع) ............. ٤١
خاسش فەرماوان شێخ «مەولەوی» ..................... ٥٣
جەژن مێعراج ........................... ٥٤
وە تولووع تاعەت ........................... ٥٧
بینای بێ زەواڵ ........................... ٥٩
سەحرای «حجاز» ڕەوشەنەن ..................... ٦١
یا «الله» زارم ........................... ٦٢
بۆحەزرەتی «عەلی رض» ........................ ٦٥
تۆبەی گورگ ........................... ٧٠
حەجی ڕێوی ........................... ٧٦
دێهاتی و شاری ........................... ٨٩
وەتەن ........................... ٩٣

دێقان........................... ٩٥
زارع بێهۆشین........................... ٩٨
جەنگ و سوڵح........................... ١٠٣
ڕەفیقی ناکەس........................... ١٠٧
گلەگی باوك لە فەرزەن........................... ١٠٩
شەهید........................... ١١٢
پیری و جوانی........................... ١١٤
بەسەرهاتی قەڵای ڕۆخاو........................... ١١٩
بەدبەختی بەختم........................... ١٢٤
ئاغە وە حاڵم........................... ١٢٦
فەڵەك داخ و دەرد........................... ١٢٨
چەرخ ئەفلاکەن........................... ١٣٠
ئەجەڵ........................... ١٣٧
ئەگەر بەدکارم مانعم تۆوی........................... ١٣٩
ئاسیاوەکەی دڵ........................... ١٤٢
یاد وەتەن نەکەی........................... ١٤٣
ئامۆژگاری........................... ١٤٤
وە تەڵەی کەڵەك........................... ١٤٨
ئامۆژگاری بۆ یەك قومارباز........................... ١٤٩
حاجی بە تاڵە........................... ١٥٢
باسی مورشیدانی ئەهل حەق........................... ١٥٥
دانش........................... ١٥٨
کار........................... ١٥٩
هەندێ لە پێش بینیەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی»........................... ١٦٤

هەر وا بووگەو هەر وا ئەوێت .......... ١٦٤
تاکە شێعر .......... ١٦٧
ئافەرین .......... ١٦٩
ئەر هەی ماڵ خراو .......... ١٦٩
کاڵی گوڵاڵەت .......... ١٧٠
خودا حافزت .......... ١٧٠
ئەی چەرخ .......... ١٧٠
تۆوێت کەر قازی .......... ١٧١
مەجنوون وە بێ تۆ .......... ١٧١
سەرێ چەنی تۆ .......... ١٧٢
ئانە مەدەری .......... ١٧٢
عەقڵ وە کەلەس .......... ١٧٣
«لەیلا» فدای مەیل .......... ١٧٣
سەوزەم، ئەسیرم .......... ١٧٤
ئەگەر دوو دیدەت .......... ١٧٤
شەرت بۆ جە داخت .......... ١٧٥
هەندێ لە بیرەوەری یەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی» .......... ١٧٦
ئاغەی ماڵ وێران .......... ١٨٠
بەهار .......... ١٨٢
بەرزە چنارێ .......... ١٨٩
سیاپۆش .......... ١٩١
ئازیزم مەیلم .......... ١٩٦
دیدەم لە دووریت .......... ١٩٩
تەقازای ئیعدام .......... ٢٠١

ئازیز وە خاودیم.......................... ٢٠٢
ئازیزم شەوبۆ.......................... ٢٠٦
ئازیز نگاتەن.......................... ٢٠٨
یەك شەو ئارەزوو.......................... ٢١٠
میرزام وە قەڵوەز.......................... ٢١٢
خاترم وە خار بێ مەیلیت ڕێشەن.......................... ٢١٤
قیبلەم قەرارم.......................... ٢١٧
قیبلەم خەیاڵان.......................... ٢١٨
هیجران.......................... ٢١٩
ئازیزم پیری.......................... ٢٢٠
حەی و بەی و نەی.......................... ٢٢١
پەروین بێپەروا.......................... ٢٢٣
ئازیز خەیاڵان.......................... ٢٢٦
یەك ڕۆ چون مەجنوون.......................... ٢٢٧
ئازیز غەمانم.......................... ٢٣٠
قامەتم چون قەوس.......................... ٢٣٢
شەم جەماڵەنی.......................... ٢٣٤
شیرین شیرینی.......................... ٢٣٧
قیبلەم وە دەردم.......................... ٢٣٩
شیرینی و تاڵی.......................... ٢٤١
شۆخ و شەنگە کەم.......................... ٢٤٢
«سینی».......................... ٢٤٤
دیدەم دیدەی بەد.......................... ٢٤٦
شەم جەماڵە کەم.......................... ٢٤٨

وەسفی یار ........ ٢٥٠
جام جەم جەمین ........ ٢٥١
سۆسەن خاڵیٚ دیم ........ ٢٥٢
بۆی عەتر گوڵت ........ ٢٥٤
من سەرعی و لێوە ........ ٢٥٦
زەبوونم کەردەن ........ ٢٥٩
سووزانی جەرگم ........ ٢٦٠
شەکەرنۆشەکەم ........ ٢٦١
ڕەعنای شۆخ و شەنگ ........ ٢٦٢
سەوزە ........ ٢٦٣
قەسەم نامە ........ ٢٦٤
ئازیزم قاربی ........ ٢٧١
دیدەم بیٚ دەماخ ........ ٢٧٣
ئازیز غەمینەن ........ ٢٧٥
یەك زلانیٚ هات ........ ٢٧٦
شیرین تاڵی یەن ........ ٢٧٩
شنەفتم سادر کریان قەرارم ........ ٢٨٠
قوربان مەیلەکەم ........ ٢٨١
بیجاڕکەی بیجاڕ مەحبووبە جاڕەن ........ ٢٨٣
ئازیز وە حومام ........ ٢٨٦
شیرین خەیاڵیٚ ........ ٢٨٧
نازاران یەك تیر ........ ٢٨٩
چە دەردێم کێشان ........ ٢٩٠
خەیاڵت ئازیز ........ ٢٩١

جەغەم خەیاڵت! .......... ٢٩٣
غەمبارم ئیمشەو .......... ٢٩٥
قومری مات جە ڕات .......... ٢٩٧
دیدەم زەروور بی .......... ٢٩٨
چە زانان حاڵم؟ .......... ٢٩٩
ئەی دڵ تا وەکەی؟ .......... ٣٠١
شەماڵ وە گیرەن .......... ٣٠٢
گوڵان مونتەزیر .......... ٣٠٣
ئازیز خەیاڵم .......... ٣٠٤
شیرین و فەرهاد .......... ٣٠٥
ڕۆیشتنی «شیرین» بۆ سەر لەشی «فەرهاد» .......... ٣٠٥
دیدەم کەردەوە .......... ٣٠٨
شیرین بێزەکەم .......... ٣٠٩
قیبلەم وەلامان .......... ٣١٠
شنۆی سەحەرخێز .......... ٣١٤
عەرزم کەرد مەجنوون! .......... ٣١٥
گیان وە لەب یاوا .......... ٣١٦
ڕێزەی ئەڵماسە .......... ٣١٧
مەحبووب گوڵێوەن .......... ٣١٩
بێ‌مەیلی وەسەن .......... ٣٢٠
دوور کەفتەی وەتەن .......... ٣٢١
شەماڵ وە جایە .......... ٣٢٤
شەماڵ ئامانەن .......... ٣٣٦
شەماڵ غەمانم .......... ٣٤٢

شەماڵ زەروورەن ........ ٣٥١
شەماڵ و «ئاویەر» ........ ٣٥٤
وەسفی «ئاویەر»ی «کوردوستان» بۆیەکێ لە دۆسان ........ ٣٥٧
بۆکوردوستان ........ ٣٦٣
ڕوانسەر و گەرمەخانی ........ ٣٧٠
داستانی عەنتەرو مەیموون ........ ٣٧٢
شیم وە «توانکەش» ........ ٣٧٧
خاترەی یەك ڕۆژ سێزدە بە دەرلە تاقۆسانی «کرماشان» ........ ٣٨٣
شکار وە بەهار ........ ٣٨٧
شەماڵ ماڵەکەی ........ ٣٨٨
تاقەتم تاق بی ........ ٣٩٠
فەڵەك تۆ خانە خراوم کەردی ........ ٣٩١
«ئەحمەد» تیر ناز سەوزەش بەرد وە گڵ ........ ٣٩٢
ئازیز کەرد وەکێش ........ ٣٩٤
شەماڵ ناشادم ........ ٣٩٦
«شەهلا» ........ ٤٠٠
شەماڵ بۆ «نەوسوود» ........ ٤٠٢
نە هەر تەنیا تۆ ........ ٤٠٤
نامەکەت یاوا ........ ٤٠٦
دوور لە وەتەنم ........ ٤٠٧
قەدمش وە خەیر ........ ٤٠٩
تەسکین بەخشەکەت ........ ٤١١
سەرو سەهی تەرز ........ ٤١٤
هەر دڵ دەرد نەکا ........ ٤١٦

سروه مەعلوومەن بای بەهاریەن........ ٤١٨
«ئەحمەد» دەماغم........ ٤٢٠
نامەکەی نامی........ ٤٢٢
تەبریك نەورووز........ ٤٢٥
چون بولبوڵ پەی گوڵ........ ٤٢٦
ڕەفیق شەفیق........ ٤٢٨
ڕەفعەت پایە بای........ ٤٣٠
ناڵینم وێنەی نەی هەزار تەرزەن........ ٤٣٤
دانای خوەش مەزموون........ ٤٣٧
بێقیاسەنی........ ٤٣٩
بوزورگوارەنی........ ٤٤٢
نامەی ماموٚستا «سەیید تاهیری هاشمی»........ ٤٤٤
بۆ «میرزا ئەحمەدی داواشی»........ ٤٤٤
نامەی «میرزا ئەحمەدی داواشی بۆ «ماموٚستا سەیید تاهیر هاشمی»........ ٤٤٧
سولتان دەعوەتم کەرد وە «ڕوانسەر»........ ٤٥٠
زام غونچەی گوڵ........ ٤٥١
موبارەکت بۆ کەردی عەرووسی........ ٤٥٣
دڵ مەدەر بەدوان........ ٤٥٤
ئامیرزا نامەت........ ٤٥٥
ئیمشەو........ ٤٦١
نامەی ماموٚستا شێخ «موحەممە سەعید»ی نەقشبەندی بۆ «میرزا ئەحمەدی داواشی»........ ٤٦٢
وڵامی «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «شێخ موحەممەد سەعید نەقشبەندی» ٤٦٤
وڵامی «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «سەعید وەزیری»........ ٤٦٦

یا واپێم نامەی ........................................ ٤٦٨
شێعری بێنوختە لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٤٧١
مەرسیە لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «شێخ حسامالدّین» ............ ٤٧٣
شنۆی شەماڵێ بۆ «شێخ نصرالدین» «پاوە» ........................... ٤٧٥
مەرسیەبۆهۆنەری پایە بەرز «سیفالله یەعقووبی» «اللّە یارخانی» .......... ٤٨٥
مەرسیەلە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «خەلیفە سەیید عەنایەت» «ورا» ... ٤٨٩
مەرسیەبۆ «کەریم سوڵتان» ........................................ ٤٩٧
مەرسیە بۆ «غوڵام حوسەین خان ئەردەلان» ........................... ٥٠٢
مەرسیە بۆ «فەتاح بیگ» «وەڵەد بیگی ڕوانسەر» ....................... ٥٠٥
دوو سەرو سەهی باغچەی «ڕوانسەر» ................................... ٥٠٨
«جوانڕۆ» بێ تۆ .................................................. ٥١٣
مەرسیە بۆ «قاضی» پاوە ............................................ ٥١٧
گۆش دەن وە عەرزم ................................................ ٥٢١
خارغەم وەکۆم ..................................................... ٥٢٢
مەرسیە بۆ «عبدالرّحمن بیگ وەکیل» «جوانڕۆ» ........................ ٥٢٤
موعەمما لە «میرزا سوهراب» بۆ«میرزا ئەحمەدی داواشی» ................ ٥٤٣
جوابی موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «میرزا سوهراب» ........ ٥٤٤
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ شاعێری پایەبەرز «سیفالله یەعقووبی»
........................................................... ٥٤٦
موعەمما لە «سیفالله یەعقووبی» بۆ «میرزا ئەحمەدی داواشی» .......... ٥٤٨
وەڵامی موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «سیفالله یەعقووبی» ... ٥٤٩
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ................................ ٥٥٠
بۆ «سیفالله یەعقوبی» الله یارخانی .................................. ٥٥٠
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «سیفاله یعقوبی» ............ ٥٥١

موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٥٥٢
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٥٥٣
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٥٥٣
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٥٥٣
موعەمما لە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٥٥٤
مەرگی «شاهێن» ........................ ٥٥٥
جەنگنامەی «هەڵاڵە زەرد» ........................ ٥٦٧
مەرسیەی مامۆستا «شێخ محمّد سعید نقشبندی» بۆکۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٦٨٠
مەرسیەی مامۆستا سەیید «موحەممەد تاهر سەیید زادەی هاشمی» بۆکۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٦٨٢
بەشێ لە مەرسیەی «موحەممەد عەلی سولتانی» بۆکۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی» ........................ ٦٨٩

## بەناوی خودای بەخشەندە و مێهرەبان

## کورتەیەك لە ژیان نامەی خوالێخۆشبوو «میرزا ئەحمەدی داواشی»



خوالێخۆشبووی باوکم ناوی «ئەحمەد» کوڕی «موحەممەد» کە لە ساڵی ١٣٢٣ی مانگی‌دا لە شاری «ڕوانسەر» هاتوەتە دونیا. هەر بەمنداڵی دایکی مردوە وە لە ژێر چاودێری وسەر پەرشتی و بارهێنانی باوکی‌دا گەورە بوو، وە هەوەڵین مامۆستایەك دەبێ کە «میرزا ئەحمەد» وە «خورشیدنمای[1]» خوشکی لە خزمەتیا خوێندن وقورئان فێردەبن تا تەمەنی دە ساڵی ئەرکی فێر کردن و بارهێنانی بەئەستۆ ئەگرێ وە پاشان بۆ خوێندنی دەرس و زانستی عەرەبی و دینی ئەینێرێتە خزمەتی «مەلا حەسەنی جوانرۆیی» کە لەوسەردەمەدا لە گوندی «تەم تەم» سەر بەشاری «ڕوانسەر» دەرسی دینی وتوەتەوە. تا ماوەیە لە خزمەت ئەومامۆستا هەندێ لە عیلمی عەرەبی ئەخوێنێ، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ڕامیاری ئەو سەردەمە وە بەشداری باوکی لە خەباتی

---

١- خوشکی هۆنەر وە یەکێ لەژنانی شاعێرە و عارفەی کورد کە قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە وە دەرسی قورئان و ئامۆژگاری بە خوشکان وتوەتەوە.

گەلی کورد بە سەرکەردایەتی «سەردار ڕەشیدی ئەردەڵان» دژ بە حکوومەتی «ڕەزاخان» دەسی لە مەکتەب و مامۆستا دەبڕێ و لەگەڵ هێزی کوردانا لە شاخە بەرزەکانی «شاهۆ» بۆ ڕزگاری وڵاتەکەی تێ دەکۆشێ بەڵام بە هۆی عیشق و عیلاقەی زۆر بە زانست هەرگیز لە خوێندن و موتاڵای کتێبانی چاك و بە نرخ دەس ناکێشێ وە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پلەی زانستی خۆی زیادتردەکات. هەروەها لە پێشەوە گوتمان باوکی «میرزا ئەحمەد» لە لایەن حکوومەتی ئەردەڵانەوە بەرپرسی ئەرکی خەزێنەداری دەبێ وە لەقەبی «داواشی» پێ ئەدەن کە پاش کۆچی دوایی ئەو «میرزا ئەحمەد»یش هەر بەم نازناوە مەشهوور دەبێ بەڵام لە هۆنراوەکانیدا هەر ناز ناوی «ئەحمەد» بۆ خۆی هەڵ دەبژێرێ.

هۆنەر بە هۆی هۆش و وریایی زۆر باشەوە لە حودودی ساڵی ١٣٢٠ ی هەتاوی «غوڵام عەلی خانی ئەردەڵان» سەر پەرشتی بەشێ زۆر لە مەحاڵ و گوندەکانی «ڕوانسەری» پێ دە سپێرێ کە تا ساڵی ١٣٤٠ ئەم ئەرکە بە ئەستۆ ئەگرێت وە لە ئەوپەڕی دەسەڵاتداری‌دا هەمووکات لایەنگری هەژاران و لێ قەوماوان بووە «میرزا ئەحمەد» لە گوندەکانی «بابا عەزیز»، «تەم تەم»، «قەلانجە»، «مسکین ئاوا» «سادق ئاوا»ی سەر بەشاری «ڕوانسەر» هەرکام چەن ساڵ لە ژینی داوەتەسەر بەڵام لە گوندی «کانی خێران» نیشتە جێ دەبێ وە تا کۆچی دوایی هەر لەوێ دە مێنێتەوە. وە ژیانی بە باخەوانی و کشت و کاڵ ئەدایە سەر.

«میرزا ئەحمەدی داواشی» لە بناغەدا خەڵکی «جوانڕۆ»یە وە لە بنەماڵەی هۆزێکی بەناو بانگ و ئازا بە ناوی «موحەممەد یارك»ە کە ماوایان گوندی «سووریدەر» لە بەشی خۆرهەڵاتی شاری «جوانڕۆ» مەشهوور بە «چاڵی هەنجیر» لە نزیکی مەزاری «شێخ ئەیووبە کر» بووە. شایانی باسە کە هۆنەر ئەی‌گوت: ئەم بنەماڵە لە ئەسڵ و نەسەب‌دا دەچنەوە سەر نەتەوەی «کەریم خانی زەند» وە لە شاری «شیرازەوە» هاتوونە ئەم وڵاتە.

خوالێخۆشبووی باوکم مرۆڤێکی موسوڵمان و خواناس و لە ئەنجامی

عیبادەت و ئەرکی دینیدا زۆر ئازا و بەغیرەت بوو. قورئانی پیرۆزی زۆر دەخوێند. پێش نوێژی مزگەوتی حەزرەتی «عومەر»لە گوندی «کانی خێران» بوو وە لە باس و وتارەکانیدا هەمووکات خەڵکی بۆ خواپەرەستی و پارێزکاری دەعوەت دەکرد. لە ژیاندا ڕقی لە هیچ کەس نە بوو وە خەڵکیش زۆر ئەویان خۆش دەویست وە بە ئەخلاقی جوان و شیرین خوێش و بێگانەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. سواری و تیرهاویشتن و مەلەوانی چاك دەزانی، لە لەشێکی ساق و بەهێز بەهرەمەند بوو، هێزی پەنجەی بەڕادەیەك زیاد بوو کە «بەی» کاڵی بە یەك دەست لەت دەکرد. لە جوانخاسیودەنگ خۆشیدا زۆر مەشهوور بوو وە بە تەواوی ئاهەنگ و مووسیقاکانی ڕەسەنی کوردی ئاشناو شارەزا بوو. هەمووکاتێ حەزی لە ڕەفیقی پاکان و پیاو چاکان دەکرد. بۆ وێنە عارفی پایەبەرز مامۆستا شێخ «موحەمەد سەعیدی نەقشبەندی» مامۆستا «سەید تاهێری هاشمی» مامۆستا مەلا «محی‌الدین صاڵحی» وە نووسەرو و ئەدیبی بەڕێزکاك «موحەممەد عەلی سوڵتانی» هەرکام لەکۆچی دوایی هۆنەردا مەرسیەیە جوان و بە نرخیان داناوە. لە نزیکی ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی لە کۆڕی ئەدەبی شاعێرانی شاری «کرماشان» بەشداری کردووە وە تەنیا هۆنەرێك بووە کە لە لایەن کۆڕی ئەدەبی و شاعێرانی ئەوسەردەمەوە لە کاتی حەیاتی خۆیدا کۆڕی ڕێز لێ گرتنی لە «کرماشان»دا بۆ گرتووە.

هێزی بیرو هۆشی ئەوندە زۆر بوو کە تەواوی شێعرەکانی هەر لە سەرەتای جوانی تا زەمانی پیری لە بەر بوون. هۆنەرێکی فی‌البداهە وێژو تێژجواو بوو کە سەبارەت بە هەر شتو هەر مەتڵەبێ لە هەرکاتێك‌دا دەها شێعری جوان و ڕەوان و پڕمەعنای بەیان دەکرد. حەفتاونۆ ساڵ تەمەنی بووکە ڕۆژی دووشەممە، دوازدەی «ذیلقعدە» لە ساڵی ١٣٥٩ کۆچی هەتاوی لە ڕێ «تاران» ئەوکاتەی کە بۆ چارەی نەخۆشیەکەی بۆ خەستەخانە ئەمان برد، بەر لە تیشکی هەتاو بۆهەتاهەتایە چاوی لە دنیا بەستو مەلی گیانی بۆلای یار هەڵفڕی وە لە بەر وەسیەتی خۆی لە لای مەرقەدی «اویس القرن»دا بە خاك سپێرڕاوە، خوای لێ خۆش بێت یاخوا. شایانی

باسەکە «میرزا ئەحمەدی داواشی» ڕۆژی لە دنیا دەرچوونی خۆی بەر لە مردنی پێش‌بینی کردبوو.

شێعرەکانی:[1] دیوانەکەی ئەم هۆنەرە وەکوو باخێکی ڕازاوەو پڕ لەگوڵانی ڕەنگاڕەنگ و بۆن خۆشن کە هەر بولبولێ بە شەوقی گوڵێ دەتوانێ لەو بناخەدا بخوێنێ.

«میرزا ئەحمەدی داواشی» پتر لە بیست هەزار بەیت هۆنڕاوەی هەیە کە هۆنڕاوەکانی تێکەڵن لە سێ لەهجە وزاراوەی «هەورامی»، «سۆرانی» و «جافی» کە هەندێ لە شێعرەکانی بە شێوەی چیرۆك داناون وەکوو شێعرەکانی «سەنگ تەراش و حەزرەتی مووسا»، «تۆبەی گورگ»، «حەجی ڕێوی»، «مەرگی شاهێن» وە . . . کە ئەم تایبەت‌مەندیە ئەسەلمێنێت هۆنەر جگە لە بەیانی شێعر لە بواری چیرۆك و داستانیشدا دەستێکی باڵای هەبووە. هەندێ دیکەش لە هۆنراوەکانی بریتین لە: موناجاتی عیرفانی لەگەڵ خالقی عالەم، مەدحی پێغەمبەری خۆشەویست حەزرەتی «موحەممەد»(ص)، ئامۆژگاری، تەوسیفی، کۆمەلایەتی، دینی، ڕامیاری، مەرسیە، مەتەڵ وە نامە بۆ شاعێرانو ئەدیبانی هاوچەرخی کە هەرکام لەم شێعرانە دیمەن و شوێنەواری جوانو ئەخلاقی لە دڵی خوێنەراندا دائەنێن.

یەکێ دیکە لە شێعرەکانی هەرەگرنگو زۆر جوانی «جەنگ نامەی هەڵەلە زەردە» کە شێعرێکی دوور و درێژە لە خەباتی گەلی کورد بەسەرکەردایەتی «سەردار ڕەشیدی ئەردەڵان» والی کوردوستان لە شاخە بەرزەکانی «شاهۆ» دژ بە حکوومەتی «ڕەزاخان» کە «میرزا ئەحمەدی داواشی» خۆی یەکێ لە خەبات گێڕانی ئەو شەڕەیە وە ڕووداوەکەمان لە نزیکەوە بۆ دەگێڕێتەوە کە سەرەڕای ئەوە بۆ ئازادی خوازان زۆر دەرس و ڕازو ڕەمزی لێ‌دەرئەکەوێت‌وە فیلم نامەیەکی

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی هەندێ جار لە دەس‌نووسی شێعرەکانی‌دا برێ وشەو مسراعی یەك شێعری بە دوو شێوە هێناوە. وە خاوەنی سەبکێکی تایبەتی لە شێعردا بووە، وە زۆر ئیستلاحات و مەعناگەلی نوێ و تازەی بە لەپاڵ یەکتانی دوو یا چەند وشە داناوەکە پێش لە ئەو لە لایەن کەسێکی ترەوە بەکار نەهێنراوە.

مێژوویی و جوان و ئامادەیە بۆ ئەو کەسانەی لە بواری فیلم و سینمادا کار دەکەن.
بیرەوەری هۆنەو هۆنەری «میرزا ئەحمەد» زۆر سەیر و سرنج ڕاکێشن کە لێرەدا یەکێکیان لە زوبانی خۆیەوە پێشکەشتان دەکەم. هۆنەر ئەیگوت:
زۆرم پێ خۆش بوو کە شێعرێ لە مەدحی حەزرەتی «موحەممەد»دا(ص) دابنێم بەڵام هەرچی هەوڵم ئەدا نەمدەتوانی تەنانەت وشەیەکیش بنووسم، زۆر پەرێشان و ناڕاحەت بووم تا شەوێ لەخەودا ئەم تاکە شێعرەیان پێ گوتم:
«ئەداش «ئامێنەن» بابۆش «عەبدوڵان» بوزرگەواریش پساك و بەرمەڵان»
ئیتر هەرئەم تاکە شێعرە بوو بە سەرمەشق بۆم وە زوبانم بۆ وەسفی پێغەمبەری خوشەویست کرایەوە، لە خۆشیدا هەر بەوشەوە هەستام شێعرەکەم تەواو کرد.
یەکێ دیکە لە تایبەت مەندیەکانی هۆنراوەی هۆنەر ئەوەیە کە لەکۆتایی هەر هۆنراوەیەکدا یەك یا دوو شێعر بۆ ئاگاداریو داچڵەکاندنی خوێنەران بەرەو ڕێی خواناسیو ڕاسیو ئامۆژگاری بەیان دەکات کە تەواوی مەعناو مەبەستی شێعرەکەیشی تێدا دەگونجێنێ. بۆ وێنە لەکۆتایی شێعری «تۆبەی گورگ»دا دەڵێت:
«ئەحمەد» دی بەسەو کافیيەو حەدە گورگ خوەی خاسە گورگەمێش بەدە
یا لە ئاخری شێعری «پیری و جوانی» دا دەڵێت:
هیچ کەس نەنازۆ بە جوانی وێش عومر بۆ پلەی پیری ها لە ڕێش
«ئەحمەد» وەی دنیا خاتر مەکەر شاد پیر مەویو مەشۆ جوانیت جە یاد
وە هەندێ لەشێعرەکانی هۆنەر بە هۆی حیکمەت و پڕمانایی لە نێو کومەڵدا بە وتەی سەری زوبانی خەڵك دەرهاتوون وەکوو:
عەقڵ وە کەللەس نەك وە مەلایی نان وە خوداس نەك وە فەلایی
خودا بدا ڕزق کەسێ لە ئاتای غەیو بۆی ئەڕەسێ
خودا بووڕێ ڕزق کەسێ چاوی ئەقوچێو دەمی ئەوەسێ
خوێنەرانی بەڕێز! ئەگەر بمانەوێ سەبارەت بە شێعرەکانی ئەم هۆنەرە وتەیەك بێنینە سەری زوبان کە بەڕاستی حەقی مەتڵەبمان بەیان کردبێ، ئەبێ بڵێین:

شێعرەکانی جوان، شیرین، خۆش ئاهەنگ و مەوزوون، دلڕفێن، قەشەنگ، یەك پارچە، ڕەوان، بەلیغ، سەهل مومتەنع وە لە یەك وشەدا جادووکەرن وە کەمتر بەیتێ لە هۆنراوەکانی ئەبینین کە خالّی و بێبەش لە ئارایەکانی ئەدەبی بێت کە بەڕاستی کۆی ئەم هەموو سیفەتانە بەدەس نایە مەگەر ئەوە بە بەخششێ بزانین لە لایەن پەروەردگاری گەورەو مێهرەبانەوە کە بە هۆنەر خەلاّتی کردوە کە هەوەنەر خۆی ئەم شێعرانە بە تیشك و بەشێ دەزانێ کە لە عالەمی بالاّوە بە هۆی خەوێك لە ئەشکەوتی «مەڕکەیوانۆ»ی «شاهۆ» لەنزیکی گوندی «چرۆسانە» نسیبی دەبێت.

«میرزا ئەحمەد» بە شێوەیە زۆر جوان هەموو جۆر ئارایەکانی گرنگی لەفزی و مەعنەوی کە جوانی و قەشەنگی کەلام زیاد ئەکەن لە هۆنراوەکانیا هێناوە کە چەن وێنە لەو شێعرانە لەگەڵ باسێ کورت لە ئارایەکان پێشکەشتان دەکەین.

جیناس: وەکوو یەك بوونی دوو یا چەن لەفز وە مەعنا کانی جۆراجۆر:

هەناسەم چون دووی دەماوەن دەم دەم
مەخێزۆ دەم دەم لە دەم وێنەی تەم
وە شێخ «سەنعان» وە دین «تەرسا»
وا دین «تەرسا» پەرسا و نەتەرسا

مولەممەع: ئەوەیە کە هۆنەر لە هۆنراوە دا دوو زوبان بە کار بهێنێ:

مەلا فتوای دا وە قەوڵ عەرەب — لَعْنَةُ اللهِ داخِلَ النَّسَبْ
ئیە من جە کار خەزان وە سەفیل — «دست ما کوتاه خرما بر نخیل»

سؤال و جواب: کەلامێکە کە شامیلی چەن پرسیارو ولاّم بێت:

واتم: ئەی سەوزەی سەفای سەرکانی
ڕەشتەی لەقای حەق حەیی سوبحانی
نەشەم کەر وە شەهد شیرەی کەلامت
بفەرما چێشەن شۆرەت و نامت؟

وات: نـــامم «قـــەمەر» نـــازکێش نـــازم
بـــاز شکـــار کـــەرۆ دیـــدەی شـــابازم

ئیقتیباس: هاوردنی ئایه یا حەدیس یا ڕەوایەتێ لە شێعردا:

قەدیم کاران، کارساز بێ‌چوون    دنیا فانی کەر وە «کـن‌فیکون»

ئیشتیقاق: هاوردنی وشەگەلێ لە یەك ڕیشە و ئەسڵ:

واتم: ئەڵبەت چەرخ وەکامم ئیمشەو    چەرخیان وە مەیل مەرامـم ئـیمشەو

غلوّ: لە وەسفی شتێکا قسە کردن کە لە حەد دەرچێت و بەعەقڵ و عادەت مەحاڵ بێت:

یەخ کەردەن ئاوان لە ئاه سەردم    زارم، زویـــرم، زەعـیفم، زەردم
سەنگ کەرۆ وە ئاو شـۆرگریانم    مەیاوۆ وە عەرش قرچەی بریانم

موعەمما: هاوردنی وشەو ڕستەی سەخت لە شێعردا کـە خـوێنەر لە دەرکـی مەعناکەی دابمێنێت:

ئەگەر عـاقڵی و عـەقڵت وە فـامە    ئەو گۆشتە کامە؟ پۆستش لە نامە؟

تەشبیە: وەکوو یەك کردنی دوو شت لە سیفەتێك دا بە یەك‌تر کە زۆرتر هێزو توانای وێژەر ئەگەیەنێت:

عـــەر عـــەر عـــەنامەن، بـــالاّ نـــەمامەن
جەمین چون جامەن، زوڵف دەسە دامەن
زوڵف زەنـجیرێ‌وەن، بـژانگ‌تـیرێ‌وەن
بـــــۆعەبیرێ‌وەن، کـــــوردەمیرێ‌وەن
ئەو چەم چون سوەیل پرشنگ مـەشانۆ
شـــەوق لە ســـتارەی شـەفەق مـەستانۆ

ئیستیعارە: جۆرە مەجازێکە کە لەفز بە هۆی شەباهەت لە یەکێ لە سیفەتەکان لە جێی لەفزێکی دیکە بەکاری بەن:

سـیاپۆشەکەم، سـیاپۆشەکەم
وەش ئامای ئەی مای سیاپۆشەکەم

تجاهل العارف: ئەوەیە کە شاعێر بە عەمدو بۆ لوتفی کەلام، خۆی بە نەزان نیشان بدات:

«کەو» بی؟، «کۆتر» بی؟، «تەیر» بی؟ «تەوار بی»؟
«چەرخ» بی؟ «شاهێن» بی؟ «باز» بی؟ «شکار» بی؟

تەلمیح: ئیشارە بە ئایە یا چیرۆك وحەدیس و مەسەلێ:

دەمت سـەر چـەشمەی ئـاو حـەیاتە
«ئەسکەندەر» بۆ ئـاو جـۆیای زوڵـماتە
«ئەحمەد» ئەو «سەنعان» حەفتا ساڵەتەن
نـامش سـەبت لە لەوح سـەرقەواڵـەتەن

موبالیغە: وەسفی شتێ کە لە حەد و ئەنازە دەرچوو بێت بەڵام مەحاڵ نەبێ:

قامەتم چون چۆی چەوگان چەم وەردەن
چون ئەبرۆی ئازیز وە هەم، خەم وەردەن

ئیغراق: وەسفی شتێ زۆرتر لە حەدی ئەنازە کە بە عـەقڵ مـومکین، بـەڵام لە عادتدا مەحاڵ بێ.

بـڵیسەم بـەرزەن وە بـەرزی بـاڵات
چـوونەن بـۆی بـۆسۆم نـیاوان وە لات

ئیستیشهاد: ئەوەیە کە هۆنەریە شێوەی جوان ناوی خۆی لە شێعردا بەیان کات:

شەکەر زوانیت لەحەد بیەن ڕەد وە زوان بەستی زوان «ئەحمەد»

ذوقافیتین: ئەوەیە کە شێعر دوو قافیەی هەبێ:

چین مەدۆ وە چین، ئە گریجەی چـەنگش
کەرۆ وە پـەرچـین دیـدەی قـەشەنگش

تیکرار: ئەوەیە کە شاعێر لەفزێ دووپات بکاتەوە.

پەی بێ کەسان کەس، کەسان بێ کەس
بالاّ دەست تۆ تیەن دەست کەس
فریا ڕەس بڕەس، تۆی فریا ڕەسم
بێ کەسم بێ کەس، بێ کەس تۆی کەسم

**تەوزیع:** بڵاوکردنەوەی حەرفێ لە چەن وشە، یا وشەیە لە چەن میسراع:

«پەڕاو» پەڕ تا پەڕ، پەڕ فشانیشەن
هەر پەڕێ دووسەد، پەڕ نیشانیشەن
شەهید شەیدای شیفتەی، شێوەت بیم
وە خەیاڵ خاڵ لێوت لێوەت بیم

**حەذف:** شاعێر پێویست بێ کە یەك حەرف یا دوو حەرف، یا نوختە لە شێعردا بەکار نەهێنێ:

سەراسەر سارای دڵەی وە کوڵم کوڵ مەدا وە کوڵ لە دووری گوڵم

**قەلب:** ئەوەیە کە مەتڵەب یا وشەیە بە شێوەیە خۆش هەڵگێڕنەوە یا حەرفێ یا چەند حەرف لە وشەیەکدا جێبەجێ بین.

حەل نمای موشکڵ وامەندەی مسکین
واعزو وازع دارای فەزڵ و دین

**تەزاد یا تیباق:** هاوردنی ئەلفازێ کە لە مەعنیدا دژایەتییان لەگەڵ یەکتردا بێت.

شادی لێم بێزار غەمم هاودەمەن خەیاڵ زکر زات یاد تۆم کەمەن

**موراعاتی نەزیر:** هاوردنی شتانێ لە شێعردا کە لەگەل یەکتردا پەیوەند و هۆگریان هەبێ.

وەلێ بۆ وە یاد ویەردەی وەرین لە چەمان مەست بڕێژە ئەسرین
تۆ هەرئەو گوڵی، گۆنا گوڵناری من ئەو بولبوڵم هەر هام لە زاری

**جەمع:** هێنانی دوو یا چەن شت یا کەس لە شێعردا کە هەموویان مەشمولی یەك حوکم بن.

«وەفایی»، «ناری»، «نالی»، «موستەفا» یەك یەك گەرد و بەرد دنـیای بـێوەفا
«ئاویەر» چادر غـەم لە سـەر لابـەرد تەم و هەم و غەم بە جـارێ بـا بـەرد

خوێنەرانی بەڕێز! سەرجەمی هۆنراوەکانی ئەم هۆنەرە بە هۆی زۆرو زەبەنی و بەربڵاو بوونیان لەم دیوانەدا کۆ نەکراوەتەوە، بۆ وێنە وەکوو تەواوی نامەکانی بۆ هۆنەران و ئەدیبانی هاو چەرخی، پێش‌بینیەکانی وە هەر وەها ئەو هۆنراوانەی کە لە بەر تایبەت‌مەندی بە زەمـانو کـەسانو شـتانێ گـوتوویەتی کـە نـەدە کـریا لەم سەردەمەدا بنووسرێن وە زۆر هۆنراوەی دیکە کە هـێشتا لە سـەر شـریتن وە بـە دەسمان نەگەیشتوون کە هیوادارین ئەگەر لە داهاتوودا هەلو دەرفەتمان بۆ دەس بدات، ئەو شێعرانەیش لە نامیلکەیەکی جیاکاردا بڵاو بکەینەوە.

بەو هیوایە کە چاپی ئەم دیوانە خزمەتێك بێت بە زوبان و فەرهەنگی ڕەسەنی گەل و نیشتمانمان. شایانی باسە کە خۆشکەزای بـەڕێز و ئـەدەب دۆسـم کـاك «حبیب‌الله کریمی» مامۆستای قوتابخانەکانی «ڕوانسەر» بۆ پیاچوونەوەی ئـەم دیوانە هاوکاری زۆری لەگەل کردم. لە کۆتایی‌دا لە برای بەڕێزو فەرهەنگ دۆس «مامۆستا عبدالرحمن یعقوبی» بەڕێوەبەری ئینتیشاراتی ئیحسان کـە بـۆچاپ و بڵاو بوونەوەی ئەم دیوانە یارمەتی کردین سوپاس دەکەم. وە سوپاس بۆ نوێنەری بەڕێز کاک «سەیید فە تحولاّ حوسەینی» کە بۆ ئیجازەی چاپی ئەم کتێبە هاوکاری لەگەڵ کردین. هەروەهالە خوشکەزای بەڕێزم کاکە «صدیق» کە لاّتەری کەئەرکی ماڵی چاپی ئەم دیوانەی بە ئەستۆ گرت سۆپاس ئەکەم.

لەگەڵ سوپاس: حوسەین موحەممەدی کوڕی شاعیر

جوانڕۆ: ١٣٨٨/٥/١٠ی هەتاوی

# پێشەکی و خۆناساندنی شاعێر

ئــــیبتدا بـــــە نـــــام عـــــەلیم دانــا
قـــــەییووم قـــــادر حـــەیی تـــەوانــا
ســـەڵوات و ســەلام بێ‌حەد و شــومار
نـازڵ بـێ لە سـەر «ئـەحمەد» مـوختار
تـــەوەلود وێـــم بـــێ کـــەمو کـــەسری
هەزارو سێ‌سەد بیست و سێی هیجری[1]
هـــەژدە مـــاه تـــەمام بـــە ئـــەمر داوەر
مـــەندە بیم چـون دوڕ لە بـەتن مـادەر
دووشەممەو دوازدەی ذی‌القعدە بە وەخت
لە «ڕوانـــەر» بووگم وە زمـــانێ سەخت
لە سێ‌سەد و سی ئـێدم مـەتڵووب بـی
باوکم وە حاکم «ئەڵك» مـەنسووب بـی
هـەر ئـەوساڵ دایکـم لە سـەر زکـۆمرد
بـــاوکم لە «ئـەڵك»[2] دوو ژنــی هــاورد
باوکم خوەی زاناو تەحـسیلی پـێم کـرد
لە پــــانزە ســـاڵە ژنـــی بسۆم هـــاورد
لە دوای نۆ مانگ ژنەکـەم مـەوتی کـرد
لە «ئـــەڵك» وە دەرد وەبـا فـەوتی کـرد

---

١- ١٣٢٣ی مانگی.

٢- ناوی گوندێکە سەر بەشاری «کامیاران».

باوکم هەشتادو چوار ساڵی تەی کرد
ئەجەڵ سەرو نەی حەیاتی پەی کرد
شەمسی هەزار و سێ سەد چەنی حەفت
ئاسای زندەگی لە دەسی داکەفت
باز هەر ئەو ساڵ بۆ خوەم فکرم کرد
لە «ئەڵك» ژنێ ئەسیلم هاورد
دایك حەفت ئەولاد، سیوسێ نەوەمە
هێمای لە گەڵیا، گاڵەو گەمەمە
قەمەری هەزارو چوارسەد قەواڵەم
وازح نیشان دا حەفتا وحەفت ساڵەم
باهۆش و حەواس خاس لە سەر حاڵم
بازەوق و ئەدەب نازك خەیاڵم
بەهار تەبعم گوڵ پاشی ئەکات
فەردم چون «مانی» نەقاشی ئەکات



## موناجات و تەوحید

دادار داوەر، دادار داوەر
پادشای شاهان، دادار داوەر
بێ مێخ و ستوون، سەما ئیجاد کەر[١]
«ئیبراهیم» جە نار،[٢] «نەمروود» نەجلت دەر
نەقاش تەسویر، زیب ئارای ئەختەر
بەخشندەی شوعاع، شوعلەی[٣] ماه و خوەر
موبەڕا جە عەیب، بێ جرم و جەوهەر
بێ جسم و جەسەد، بێ سایە و سێوەر
زاتت بێ زەواڵ، ئیسمت عەزیمەن
هەزار و یەك نام، یەکش ڕەحیمەن
دارای ئیقتیدار،[٤] وەزع شەوو ڕۆ
ڕەزاق[٥] ئەرزاق، گرۆهای گرۆ
خالق مەخلووق، هەژدە هەزار جەم
فرووزندەی عیشق، پەروانە پەی شەم
سەمێع وە بێ گۆش، بینا وە بێ چەم
ناتق و گۆیای بێ زوان و دەم

---

١- خَلَقَ السّموات بِغَیْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَها . . . (لقمان، ١٠) (خوایە) کە ئاسمانەکانی وەبێ پایەو ستوون خولقاندوە . . .
٢- ئاگر.
٣- تیشك.
٤- هێزو توانا.
٥- ڕۆزی‌دەر.

پـــادشای شــاهان، بـێ سـپاو عـەڵەم
«کـاتب الحـروف»،[1] بـێ دەس‌و قـەڵەم

نـە هـەرجـا مـەوجوود، بـێ‌پا و بـێ‌قەدەم
ئیجاد کـونەندەی،[2] هـەستی جـە عـەدەم

شـێوەت لە شـێواز، هـیچ ڕەنگـێ نـیەن
دەنگت لە شـبهەی، هـیچ دەنگـێ نـیەن[3]

بـێ‌شك لاشـەریك، یـەکـتاو بـەرزەنی
بـێ بـابۆو ئـەداو[4] زەوجـە و فـەرزەنی

قـادر وە قـودرەت حـەققە فـەرزەنی
ئـافەریننەدەی، سـەما و ئـەرزەنی

سادە وە بـێ‌بەرگ، بـێ‌ڕووپۆش بـێ‌فەرش
نگـارندەی چـەرخ، قـەرار دادەی عـەرش

گـونا بـەخشندەی، گـوناکـارانـی
ئـامر ئـەبرو بـاد و بـارانـی

بـێ‌پەروا لە عـەیب، بـێ‌ئەندێش لە مـەرگ
بەرهەم زەننەدەی[5] کووس و تاج و ئـەرگ

بـێ‌خورد و بـێ‌خاو، بـێ فکـرو خـەیال
بێ‌میسل و مـانەند، دانـای «ذوالجـلال»[6]

سـەمێع و بـەسیر، بـێ‌شبهەو تـمساڵ[7]
بـاخەبەر لە حـاڵ، کـەڕو کـوێر و لاڵ

١- نووسەر.
٢- بەدی هێنەر.
٣- . . . لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِير. (شوریٰ، ١١)
. . . هیچ شتێ وە کوونەو (خودا) نیە وەئەو (بەکرداری بەندەکانی) شنەواو بینایە.
٤- دایك.
٥- تێکدەر، خاپوورکەر.
٦- خاوەن گەورەیی.
٧- بێ‌وێنە.

حەل‌نمای موشکیل بەستەی کارانی
ئاگادار وە حاڵ، دەردەدارانی
فەرەح بەخش وە قەلب، پەرێشان تۆنی[1]
حەکیم زامان، دڵڕێشان تۆنی
ئوستاد سونعەت، «کا» و «کۆ» و «ئاو»
بێ‌غەم و خەفەت، بێ‌خورد و بێ‌خاو
بێ‌شك لاشەریك، تساك تەنیای فەرد
هەی کا وە کۆکەر، کۆکەری وە گەرد
دەهەندەی بێ‌باك، بەخشەندەی دارا
بەرئارندەی گوڵ لە سەنگ خارا
قەدیم کاران، کارساز بێ‌چوون
دنیا فانی کەر، وە «کن فیکون»[2]
ئەگەر مەیلت بۆ، بینای بێ‌زەواڵ
لاڵ مەکەیت وە سەنگ، سەنگ مەکەی وە لاڵ
هەم خالق خەلق، حەی سوبحانی
یا رازق ڕزق، جەمع نەفسانی
یا ڕەب وە حاجەت، سەمای پڕنەقشت
وە «لوح المحفوظ»[3] وە ساق عەرشت
وەکورسی‌و قەڵەم، عەدڵ و میزانت
بە شەوەرەفناکی، حووری ڕزوانت

---

١- تۆی.
٢- بَدیعُ السَّمٰواتِ وَ الْاَرْضِ وَ اِذا قَضیٰ اَمْراً فَاِنَّما یَقُولُ لَهُ کُنْ فیکون. (بقره، ١١٧)
(خودا) خالقی ئاسمانەکان و زەمینە وەهەرکاتێ ئیرادەی کارێکی ببێ هەتاگوتی ببە ئەبێت.
٣- . . . وَ عِنْدَنا کِتابٌ حَفیظ (ق، ٤).
. . . وە لەلای ئێمەیە لوح المحفوظ

وە شـــەرافـــەتی، ســاقی کــەوسەرت
وە مــــەلایکان ڕەشــــتەی ئـــەنوەرت
وە ئـومێدو بـیم، ڕووی ڕۆژی مَەحشەر
یــا ڕەب وە حــاجەت، دیــن پـەیغەمبەر
یـەعنی «مـوحەممەد» «ختم‌المرسلین»
بـــەرگوزیدەی حسەق، «ربّ العــالمین»
وە«مووسای عـیمران»، کـەلیم کـۆی تـوور
وە«عیسای» «مـەریەم»، خـولقیان جـەنوور
هـــەم وە حــاجەتی، پـــەیغەمبەران گشت
ئاگـانی وە حـاڵ، فـرقەی زیـبا و زشت[1]
قەبووڵ کـەر لاڵـەم،[2] فـەرد تـەنیای تـاك
یـــا ئــیجادنمای، ئـــادەمی لە خـــاك
وە بــــارئاوەردەی، مـــیوەجات لە دار
هــەر تـۆنی ڕازق، مــەل و مـۆر و مـار
یــــا عـــەترئامێز، گــوڵان وەش ڕەنگ[3]
نازك و قەشەنگ، بەر مـەیۆ جـە سـەنگ[4]
وە چەشمەی ئـاوان، ئـەعلای مـوتەهەر[5]
جسە سـرِ قـودرەت، بــەر مـەیۆ وە بـەر
وە هەم نەباتات،[6] هەرچـیت پـەروەردەن
پــەی تـوخم ئــادەم، ئـیجادت کـەردەن

١- ناشیرین، ناحەز.
٢- پاڕانەوەونزا.
٣- خۆش ڕەنگ.
٤- لە بەرد.
٥- پاك و خاوێن.
٦- گژوگیا.

یــــا ســــەبووری دەر، وەحشــیان کــۆ
یــا فــەرخــوندە بــەخش، دارای شــەوو ڕۆ
بـــێ بـــابۆو ئــەدا، ســەتتار ســڕپۆش
بـــینای بــێدیدە، شــنەوای بــێ گــۆش
قــەبووڵ کــە لاڵــەم، مــوشکیل گــوشادکەر
لە بـــەحر عــوسیان، بـاوەرم وە بــەر[1]
بوەخشە گـوناى ئـى بـەندەى مـوزنیب[2]
بە زارى ئادەم سەر کۆی «سەر ئەندیب»[3]
ئـــومێدم بـــە تــــۆن، شــاه ئــەبەدی
ڕەهـــنمای ڕاهـــان هـــەر نــابەڵەدی
لە ئــاخر نــەفەس، نــەزع ڕۆی مــەمات
نـــەجاتدەر تـــۆنی، بـدەرم نــەجات
پەی بـێ کـەسانکەس، کـەسان بـێ کـەس
بــــالادەست تــۆ، نــیەن دەست کــەس
یــا حــەیی بـێچوون، فـەرد فـەریادڕەس
فــەریادڕەسیم کــەر، جــە ئـاخر نـەفەس
لەو سەختی حـاڵەت، وەزع ڕۆی مـەردەن
تەریدەی[4] ڕای دیـن، خـەیلی، نـەبەردەن
نــە ئــەو حــاڵەدا، ئــومێد هـەر بـە تـۆن
کـــەرەم بـــێپایان کــەرەمت بــێشۆن

---

۱- دەرم بێنە.
۲- تاوانبار.
۳- ناوی کێوێکە لە هێندوستان.
۴- مەبەست لە شەیتانە.

بــــیاوه بــــه داد، بـــەندەی گـــوناکـــار
جـــه شـــەڕ شـــەیتان، کـەرش ڕستگار[١]
مــــەبادا عـــــەدووی،[٢] دیــن مـــوبینم
فــــرسەت بـــــاوەرۆ، بســــتانۆ دیـــنم
واجب الرحـــمم،[٣] پـــادشای ئــەکــبەر
ڕەحمێ کەر وە حاڵ، بەندەی خاك وە سەر
لە کـــونج تـــاریك، زوڵــمات[٤] بــێدەر
چـــوونش قــەرارەن، تـا «یـوم‌المـحشر»[٥]
زەلیـــــل و زەبـــــوون، زبـــانش لەنگـــەن
نـــاحەقش نـیەن، یـاگـەکـەش[٦] تـەنگەن
تـــەحقیق مـــەزانـــۆ، جـــای ئـــەبەدیەن
غـــــەیر لە زات تـــــۆ، ئـــومێدش نـــیەن
«اَللّه» ئـــــومێدم، نــــەکــــەیت نـــائومید
تــــەبدیل‌کە نــامەی، ســیام[٧] وە ســفید
نــــەکـــــەردە گـــونا، نــیەن بــەعیدەن[٨]
لە نـــــــائومێدی، بـــــەسی ئـــــومیدەن
مـــــن عـــــەبد عـــاسی، وەکـــۆن گـــوناهم
نـــــیەن غـــــەیر لە زات، پـــاکت پـــەناهم
مــــەر بـــە لوتــــف وێت، بـــدەی نـــەجاتم
وەر نــــە مــــن بــــەندەی، بــــێ دەســـەڵاتم

١- ڕزگار.
٢- دوژمن.
٣- شایانی بەزەیی.
٤- تاریکایی.
٥- ڕۆژی قیامەت.
٦- جێگە.
٧- ڕەش.
٨- زۆر دورە.

له قەبر تەنگدا، پڕ خۆف تاریك
جە پرد سرات، ڕای دوور و باریك
جە هەر پللەیە، بەرەم وە ڕاهی
ڕەهنما تۆنی، هەر تۆ پەناهی
ئی هر دوو پله، خەیلێ ستەمەن
هەرکەس موئمنەن، بۆ خوەی بێغەمەن
هەرکەس وێنەی من، ئەر گوناکارەن
چەمەڕای ڕەحمەت، پەروەردگارەن
ئەگەر لوتف حەق، یاوەر بۆجە سەر
بێ خۆف و پەروا، مەکەروون گوزەر
مەبۆ لوتفت بۆ، بدەی نەجاتم
وەرنە من بەندەی، بێ زۆر و زاتم
کەرەم کەرکەریم، کەرەمت بێشۆن
جوملەی عاسیان، ئومێدمان بە تۆن
وێت فەرماوانت، جەسوورەی تەنزیل
هیچ کەس جە گونای وێش نەبۆ زەلیل
هەر وێم پادشای، حەیی ئەکبەرم
ساحێب عەدڵ و داد، ڕۆژ مەحشەرم
گونا بەخشندەی، گوناکارانم
دادڕەس داد، شەرمەسارانم
بەندەی خەجاڵەت، خوار و ڕوو ڕەشم
وەلێ جەو بۆنۆ، یەك جار دڵخوەشم
یا ڕەب وە حاجەت، زات لەتیفت
وە شەرافەتی، ئایەی شەریفت

بـــوەخشە گـــونای، گـــرد گـونـاباران
بــە قــەترەی ڕەحــمەت، سـەیلات بـاران
عـــەتا کـــەر وە پـــێم، زەڕە ئـیمانێ
بـــوەخشەم وە خــاك پــای مــوسڵمانێ
ئــەوەڵ جــە خــاك و ئـاخریش خـاکـم
کـەردی و مـەکـەری، دی چـێشەن بـاکـم
هــانا[1] هـامسەران، هـۆشم کـەم کـەردەن
بێ خـۆف نـەنیشین، جـە خـۆف مـەردەن
عــاقیبەت مــەرگەن، هـەر مـەبۆمەردەن[2]
مەردەن چەن مەردان، جە مـەیدان بـەردەن
جە دمای[3] مەردەن، یاگـەمان[4] قـەورەن
تــاریك و نـووتەك، پـڕ جـەفا و جـەورەن
ســەرینمان سـەنگەن، پـایینمان سـەنگەن
نە ڕای گـورێزەن[5]، نـە یـاگـەی دەنگـەن
ڕشـــتەی ئـــیختیار بــەرمەشۆ لە دەس
خــسەریکەن چــەنی ژمــارەی نــەفەس
نـە دۆس نـە ئـەقوام، نـە فـامیل نـەکـەس
کەس وە دەرد ناخوا، غەیر لە فـەریادڕەس
نە کـوڕ نـە کـەنیشك، نـە گـەنج و نـە مـاڵ
وە حـەساب نـایەن، بـە غـەیر لە ئـەعماڵ

١- هاوار.
٢- وكُلُّ نفسٍ ذائِقةُ الْمَوْتِ (آل عمران، ١٨٥) هەمووگیان لەبەرێ تامی مەرگ ئەچێژێ.
٣- لە پاش.
٤- جێگەمان.
٥- ڕێگەی ڕاکردن و دەرچوون.

بـــە زات پـــاکت، بـــینای بـــێ‌زەواڵ
بـــــە زکـــر زاتت، زوان نـــەبۆ لاڵ
بــە غـەیر لە مـەعبوود، پـادشای ئـەکـبەر
کـێ فـەریادڕەسەن، لەو جـاگـەی خـەتەر
یـــاران بکـــۆشین، وە تـــاعەت کـــەردەن
وە ئـیتاعەی حـــەق، وە جـــا ئـاوەردەن
بـــەڵکە خـــوداوەن، کـــەرەم بـــێ‌شومار
بـــوەخشێت گـــونای، گـــردین[1] گـــونابار
یا ڕەب وە حاجەت، شای بۆراق سەوار[2]
وە جـــومعەو جـــیهاد ســـەحابەی کـــوبار
وە خـــوێن «حـــەسەن»، «حـــوسەین» نـــازار
نـــوور دوو دیـــدەی، ڕەســـووڵ مـــوختار
وە ئـــــال ئـــــەباو ئـــەولادەی ڕەســـووڵ
دوعـــای ئـــی کـــەمفام، بکـــەری قـــەبووڵ
مـــۆمنە و مـــۆمن، ئـــیسلامی یـــەکســـەر
بـــوەخشـــە وە نـــوور، پـــاك پـــەیغەمبەر(ص)
یـــا بـــیناو بـــەسیر، پـــادشای لاڕەیب[3]
یـــا ســـرِ قـــودرەت پشت پـــەردەی غـــەیب
بـــــێ‌شکڵ و شـــێوە، زات لەم یـــەزەل[4]
نـــــائومێد نـــــەوم، لە نـــــامەی عـــــەمەل

---

١- هەمووگشت.
٢- مەبەست پێغەمبەری ئازیزە.
٣- بێ‌شك وگومان.
٤- بەرقەرار و پایەدار.

لە ڕۆژ مەحشەر، سارای[١] عەرەسات
سیوای خەیر و شەڕ، ڕای هات و نەهات

نەجاتدەر تۆنی، بدەرەم نەجات
بوویەرم[٢] چون تەیر، لە سەر ڕای سیرات

یا ڕەب وە حاجەت، سەیید کەونەین[٣]
بە نوور لەقای، شای «بەدر» و «حونەین»[٤]

هەم وە حاجەتی هەر چوار ئیمامان
«بوو بەکر» و «عومەر»، «عەلی» و «عوسمان»

باز وە حاجەتی، قورئان عەزیم
کریان وە خەڵات، ڕەسوول، پەی تەعلیم

سورە وە سورە، سەد و بیس حزبە[٥]
بوویەر[٦] لە تەقسیر بەندەی بێ جزبە[٧]

ئەر سەد کە عاسیم، نامم «ئەحمەدەن»
«ئەحمەد موختار»، هەر «موحەممەدەن»

زەڕە ئیمانێ، عەتا کەر وە پێم
یا ڕەب بوەخشەم، بە ئیسمەکەی وێم

یا ڕەب وە حاجەت نوور «موحەممەد»
بوویەر لە تەقسیر نادانی «ئەحمەد»

اَلْحَمدُلِلّٰهِ رَبِّ العَالَمِین
سَلاٰمُ اللهِ عَلَی الْمُرْسَلِین

---

١- سەحرا، دەشت. ٢- تێپەرم.
٣- ئاغای هردو دنیا. مەبەست پێغەمبەری خۆشەویستە.
٤- ناوی دووشەڕ لەشە ڕەکانی پێغەمبەری ئیسلامە.
٥- قورئان سی جوزئە هەر جوزئێ چوار حزبە کە وابێ سەدوبیست حزبە.
٦- عەفووکە. ٧- بێ ئەرزش.

## شەوی بە دنیا هاتنی «پێغەمبەر» (ص)

شـــەو دووشـــەمبە، یـــاوام وە مـــەنزڵ
دیم نـەسیم عـەترێ، لەتـیفـتر لە گـوڵ
پـەی سـاکـنی دەرد، دڵـەی پـڕ داخـم
ئاوەرد چـون شـەوبۆ، دای لە دەمـاخـم
سـەرسام سـادار، هـارو وە حـەسرەت
پـرسیمو واتـن: مـزگانی حـەزرەت
ئـیمشەو پـانیان، وە عـەرسەی زهـوور
دنـیا سـەرتاسەر، پـڕ کـەردەن لە نـوور
بێهۆش بـیم لە بـۆی، عـەمبەرفشانیش
دەرلاد[1] گـیان وێـم، دا بـە مـزگانیش
بەو شنۆی نەسیم، وەش بۆی موعەتتەر
شیم لە حاڵ هۆش، ئەو شەو تا سەحەر



---

١-کوتوو پڕ، زوو

## یا «رسول‌الله»

یا رسـول‌الله شـەیداو شـێت‌و بـێ قـەرارتـم
وەکوو پەروانەی بێچارەی شەمعی ڕوخسارتم
بێ خوەراك‌و بێ خەوم گیان بە قوربانت هەرشەو
لە عیشقی دینی دیدەت تا سەحەر بـێدارتـم
قامەتم خـەم بـووەوە لە ژێـر بـاری گـوناهانا
بە ئومێدی مەرحەمەت من هـەر ئـینتیزارتـم
هەرچەن گونابارو شەرمەسارو قوڕ بە سـەرم
بـە هـیوای شـەفاعەتێ هـەر ئـومێدەوارتـم
مـن پـیرو نـاتەوان‌و سـووتاودڵ‌و حـەزینم
تینوی زۆری بە تاسەی لێوی شەکـەر بـارتم
ماتی حوسن و جەماڵ‌و کەماڵە عەرش‌و سەما
من مەستی تام‌و شەهدی شەرابـی گـوفتارتم
یا رسول‌الله «ئەحمەد» گەر چە شووم و بەدکارە
ئـومێدم زۆرە چـونکە هـاوناوی موختارتم



## مەدحی حەزرەتی «موحەممەد» (ص)

بەیتی یەکەمی ئەم شێعرە لە خەودا، بەشاعێر ئیلهام بووە

«ئەدّاش[١] ئامێنەن، بابۆش عەبدولّان
بوزورگەواریش، پاك و بەرمەلّان»
باشەئن و شەرەف، شەرت و شئوونەن
دورِ مەعریفەت، دەریای مەکنوونەن[٢]
سەروەر زومرەی، ئەنبیا گشتەن
خوداوەن وە تاك، وە پاك سرشتەن
موبەرِا جە عەیب، پاکیزە و پاکەن
گوڵێوەن لە ناو، گوڵان گشت تاکەن
شارەزای ئەوزاع هەر حەفت ئەفلاکەن[٣]
رِەویەی بۆ هەر دوو دونیا رِووناکەن
بەهەشت وە شێوەی شیرینش وەش بی
نوورش لە دنیاو مافیها[٤] بەش بی
شافع زومرەی، گوناباراننەن
مەلجەئو رِجای،[٥] شەرمەسارانەن
ساحێب شەرەفەن، دارای ئومەتەن
سرِ خەفی یەن، وەحی وەحدەتەن

١- دایکی.
٢- نادیار.
٣- حەوت ئاسمان.
٤- هەرچی تێدایە.
٥- هیوا.

خوەر وە تەجەلای، نوور ئەو ڕەوشەنەن
زەمین وە زینەت گـوڵ ئـەو گـوڵشەنەن
عەرش وە گەرد پای، ئـەو مـنەوەر بـی
پـــای‌ئەناز پــاش، دوڕو گـــەوهەر بـی
«ئەحمەد» و «مەحموود» «موحەممەد» نامەن
ڕەفـــعەت پــایە و ئــەرفەع مــەقامەن
توغیان کەرد کەوسەر پەی ئاو پاشی پلش
مەلەکان یەك یەك سەر مەنیان جـە ڕاش
حۆری و پەری گشت خزمەت کارش بی
«حَــمَلَةُ ٱلْـعَرش» خــاکـە سـارش بـی
«سـدر ٱلْـمُنتهیٰ»[1] مـەجهوول نـەمانۆ
تەسنیف تـەوسیف حـەزرەت مـەوانـۆ
خودا دوو دونیاش پـەی ئـەو سـرشتەن
بـەهەشت وە لەقـای نـور ئـەو ڕەشـتەن
قەڵەم لە ڕووی لەوح، بەی‌تەور ئینشا کەرد
نـام «مـوحەممەد»، بـەعد لە «ٱللّٰه» بـەرد
«ئەحمەد» ئەگەرچی، شووم و بەدکارەن
جــــە گـــوناباری، وێش، شـەرمەسارەن
کـــار و کـردەوەی، بـەدیش بـێ‌حەدەن
ئـومێدش ئـێدەن، نـامش «ئـەحمەدەن»
دڵ مۆر کەبە نوور،نام «موحەممەد»(ص)
مەترس لە تەقسیر، نادانـیت «ئـەحمەد»

---

١- دارێکە لەبە هەشت‌دا یا لە ئاسمانی حەوتەم لە لای ڕاستی عەرشەوە.

ئەگەرچی «ئەحمەد»، ڕووی ڕاسیت نیەن
ڕاستیش هەر ئێدەن هیچ خاسیت نیەن
دوور لە ئیستاعەت بێ بەزاعەتم
«موحەممەد» بکا، مەر شەفاعەتم
وە ئیلا قوەی، خێزانم[1] نیەن
ڕووی لوای وەپای، میزانم نیەن
ئاگادار وێشەن، فەرد تەنیای تاك
جە شنۆی مووریٚ، مەویەرۆ جە خاك
هەنی چ لازم، ئی عەدڵ و میزان
قادر هەر وێشەن، پادشای سوبحان
موتیع ئەمرم، سەعی[2] یا شەقیم[3]
ئەگەر بەهەشتی، یا خۆ دۆزەقیم[4]

---

١- هەستان.
٢- خۆش‌بەخت.
٣- بەدبەخت.
٤- ئیشارەیە بە ئایاتی ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧ وە ١٠٨ لە سوورەتی «هود» سەلامی خوای لە سەربێ
يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَ سَعِيدٌ (١٠٥) فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَ شَهِيقٌ (١٠٦) خَٰلِدِينَ فِيهَا مَادَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَ ٱلْأَرْضُ إِلَّا مَاشَآءَ رَبُّكَ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ (١٠٧) وَ أَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَادَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَ ٱلْأَرْضُ إِلَّا مَاشَآءَ رَبُّكَ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ (١٠٨)

١٠٥ـ ڕۆژێك کە ڕۆژی حەشرو جەم بوونەوەو قیامەت دێت کەسێ تەوانای قسەکردن و ئاخافتنی نیە مەگەر بە ئیجازەی خودا (لە ئەو ڕۆژەدا مەردم دوو دەستەن:) دەستەیەك (بە هۆی گومڕاهیو کوفرو بەدکارییەوە تووشی ئەنواعی عەزابن، وە) بەدبەخت و ڕۆژ ڕەش‌و کولۆلن، وە دەستەیەكتر (بە هۆی تاعەت و عیبادەت‌وکاری چاکە غەرقی نیعمەت‌و خەلاتی جۆربە جۆرن، وە) خۆشبەخت و بەختەوەرن... «شَقِيٌّ»: بەدبەخت... «سَعِيدٌ»: بەختەوەر، خۆشبەخت...

١٠٦ـ وە ئەمما ئەوانەی کە بەدئیقبال‌و بەدبەخت و ڕۆژڕەشن لەناوی ئاگری جەحەنم‌دان وە لە ئەوێدا هاوارو نالە دەکەن... «شَقُوا»: بەدبەخت‌و ڕۆژ ڕەش... «زَفِيرٌ»: دەنگی هەناسە بەدەر دانەوەی توندو درێژ... «شَهِيقٌ»: دەنگی هەناسەکێشانی زۆر توندو درێژ...

١٠٧ـ ئەوانە لە جەحەنم‌دا بۆ هەتاهەتایە دەمێننەوە تا ئاسمانەکان‌و زەمینی (ئەوێ) بەرپان. (واتە تا دۆزەق دۆزەقە لە ئەوێ بە سەر ئەبەن) مەگەر ئەمەکە خودای تۆ گەرەکی بێ (وە ئەوزاع و ئەحوال بگۆڕێت وە عەزابێ بنێتە جێگەی عەزابێكتر) بێ‌شك خودای تۆ هەرکارێك کە مەیلی بێت بە ئەنجامی دەگەیەنێت.

**ڕازیـم بـە ڕەزاش، هـەرچـی ڕەزاشـەن**

**«ئەحـمەد» فـەرمانبەر ئـەمرو قـەزاشـەن**

**موستەحەق ڕەحمم، مـەکـەر جـەوابـم**

**مــەدەرە بـە نـار، حـیرمان[1] عـەزابـم**



---

(وە هیچ شتێ ناتوانی بەری بگرێت) «مَا دَامَتِ آلسَّمٰوٰاتُ وَ آلْأَرْضُ»: ئاسمانەکـان و زەمـینی جـەحەنەمە (ابراهیم/۴۸) یا مەبەست هەمیشە بوونو هەتاهەتایی وە نەبریانی جەحەنەمیەکانە لە جەحەنەم . . .

اِلّاَ مَا شَاء رَبُّكَ مەبەست ئەبەدی بوونە (انعام/۱۲۸) یا ئەمەیەکە جیاکردنەوەی ئەهلی تەوحیدی گوناباره واته لە دۆزەقدا دەمێننەوە مەگەر ئیماندارانی گونابار.

۱۰۸ـ وە ئەمما ئەوکەسانەی کە (بە هۆی کاری چاکەدا) خۆشبەختو بەختەوەرن (وە لە ناوی بەهەشتن وە) لە بەهەشت دا بۆ هەتاهەتایە دەمێنەوە هەتا ئاسمانەکانو زمین باقین، مەگەر ئەوەی کە خوداگەرەکی بێ (وە ئەهلی تەوحیدی گونابار نەخاتە بەهەشت وە بیانخاتە جەحەنەم خودا بە خۆشبەختەکان) بەخشێکی زۆر زۆر گەورە ئەبەخشێ کە هەمیشە دەوامی هەیە بۆ تاوێکی زۆرکەمیش نابرێتەوە وە قەتع نابێ.

۱- دووری، بێبەشی، نائومێدی.

## قسەی سەنگ تەراش و حەزرەتی مووسا (ع)

ئـــیبتدا بـــە نـــام، پـادشای غـەفوور
ســـانع و ســـامع، ســەتتار و ســەبوور
سەنگ تـەراشـێ بـی، لەسـەر کـێف تـوور
ســەنگش مــەتاشا، وە دڵـەی پـڕشوور
مەوات[١] یـا بـێچوون، پـادشای شـاهان
فەربەخش شەوکەت،[٢] حوشمەت[٣] پـەناهان
کـــان کــۆی کــەرەم، کــارساز کــاران
نـــزام زیـــنەت، مـــاه و ســـتاران[٤]
بەسوبح، سەفا دەر، کورەی ئـەرز وە نـوور
ڕۆشـــنی ڕۆ بــەر، وە شــەو دەیــجوور
تەشکیل دەهەندەی، چـوار فـەسڵ لە سـاڵ
«لا شـــریك له»[٥] بـــێزوڵم و زەواڵ
ســـەردی زمســـتان یـــەخبەنان ســـەخت
ناغافڵ شاهان مەعزوول کـەر جـە تـەخت
ســـەختی زمســـتان تــۆف هــەوای ســەرد
هەی سەنگ وە ئاو کەر، ئاو کەری وە بەرد
ســـرڕ خــــەفییەن[٦] «واحــد الْــقَهار»
بـــە مـــەلایمی مـــاوەڕۆ وەهـــار

---

١- ئەیوت.
٢- شکۆ.
٣-گەورەیی.
٤- مانگ و ئەستێرەکان.
٥- بی‌هاوبەش.
٦- نهێنی، پۆشراو.

سان دادەی سامان، سەف ئارای گوڵان
تەسەللای تەسکین، ناڵەی بولبولان
تاوسان وە گەرمی شەرارەیَ شەرەر
پایز پڕبارەن وە سفرەی سەمەر
عارنیەن وە قەد یەك پەڕەکاهێ
ئەگەر بنوازۆ، شاهێ، گداهێ
چێش مەبۆ جارێ، دەردت لە گیانم
تەشریف باوەری و بووی وە مێهمانم
تا ڕۆح وە پێشواز، پابۆس پات بۆ
تا سەر سەرئەفراز، گەرد پاڵات[1] بۆ
تا دیدە بە دین،[2] دیدەت ڕەوشەن بۆ
تا خار خوسران، غەم وە گوڵشەن بۆ
تا خاك پاڵات، وە تووتیا کەم
بینای نابینای، وێم پێش بینا کەم
تا دڵ وە گەرمی، مەیلت، پڕجۆش کەم
باز هەم بە سەیلات لوتفت خامۆش کەم
تا کەی پەنهانی، بەرز بۆڵەن ماڵ؟
وە شێت شێوەت، بنمانە جەماڵ
لە سەختی سەما، دوور لە جەفا بەر
تەشریف بار بە وار، سەیرو سەفا کەر
لە سەر چەشمەی ساف، زەلاڵ بێ گەرد
پەرێت ماوەرووم، ئاو کووزەی سەرد

---

١- پێڵاو. ٢- بینین.

شەرتبۆ یەك ماڵێ، چون نەقش ئـەرژەنگ
پەرێت بتاشووم، یـەك پـارچـە لە سـەنگ
جـــارووی بکـــێشم، وەئـاباى بـەرم
مـــننەت بـە دیـدە و پـات لە سـەر سـەرم
چەنی وێم بەرووت[1]، بەسەیر گوڵگەشت
سـاکــن کــەرخـەمان وە سـەیران دەشت
هــەرچــێ مـەیلت بـۆ، دەرلاد بـێ درەنگ
پــەرێت مـاوەرووم، مـیوەی ڕەنگـاڕەنگ
شــــەربەتو شــەراو، بـامەزەی لەزیــز
مـــاوەرووم پــەرێت، پـاکــیزە و تـەمیز
پــۆڕ و بــوڵدەرچــین، ژەرەژ و تـەیهوو
گـــۆشت بـەڕەمێش، یـا بـەڕە ئـاهوو
حـــەقا مــێهمانیت، وەدڵ تـەواو کـەم
نۆش گـیانی کـەیت، بـۆت وە کـەواو کـەم
لە شـــێر و بـەور و، لە ئـەژدەها و مــار
مەترسە بێ خـۆف، تـەشریف بـێرە خـوار
لە جـای بـاسەفای، نـە گـەرم و نـە سـەرد
جێگەت بۆ داخـەم، لە سـەر تـەختە بـەرد
پشـــتت بشـــێلم، دەســـتت بـــماڵم
ڕازت بـــۆ بکـــەم، بـــخەف لە مـــاڵم
تــەهیەی مێهمانی، خـودای گـرت وە دڵ
تـەزهین کــەرد مــاواو مــەنزڵی وەگـوڵ

---

١- نەتبەم.

ئەساسەی بسات، شادی تەواو کەرد
کاسە و چمچەی شۆرد،کووزەی پڕئاوکەرد
«الله»! ئەر تەشریف، بێریتە ماڵم
شەرتە خاك پات، وە چەم[1] بماڵم
هەر چەند ناز کەری، مەکێشووم نازت
ئاو گەرم کەرووم، پەی دەس نمازت
ئەگەر غەمگین بی، غەمخواریت کەرووم
ئەگەر دڵتەنگ بی، دڵداریت دەرووم
سەرت وەساون، سەرکەف ئەشۆرم
سەر تا پا لیباس، بەرت ئەجۆرم[2]
غەیر لە ڕەزای تۆ، نیەن تەلاشم
ڕیش شەریفت، شیرین ئەتاشم
بوتم، سەنەمم، شۆخم، تەننازم
تەننازێ، شۆخێ، خاس بۆت بخوازم
تاق و ئوتاقی، گشت نەقاشی کەرد
حەوش و حەیاتی، گولاوپاشی کەرد
چل ڕۆ[3] وەك یەك ڕۆ، مەنالا بە زار
بەزاری و زەبوون، مەسۆزا بە نار
لە جۆی چەشمەی چەم ئەسرش بێجاری
تك تك مەتکیا، وێنەی مرواری
لافاو سەیلات، لەسەر چاوگەی غەم
بێ غەم مەڕێژاو، مەوج مەدا وە هەم

---

١- چاو.
٢- بزنین.
٣- ڕۆژ.

مەوات: ئەی کەریم، کەرەم بنمانە
بێ کەرەم مەبەر، یەکتای یەگانە
تا کەی ماوەری، عوزر و بەهانە
نوور جەماڵت لە من پەنهانە
کولبەی تاریکم ڕۆشن تر لە خوەر
بە تەجەللای وێت بکەر منەوەر
بە زات پاکت، یەکتای ئیلاهی
هیچ قەبووڵ ناکەم، لێت عوزرخواهی
پەردەی سەبووری تاقەتم دڕیان
تاقەتم تاقە و تاقەت لێم بڕیان
تەشریف باوەرە، خوایی نەخوایی
بەدڵ حازرم، پەی پەزێرایی
پاڵشت و پشتی، بنێمە پشتت
کاکڵەو کشمیش، بکەمە مشتت
تەختت بۆ دانێم لەو گۆشەی ماڵە
پەنجەرەی وازکەیت، ڕووەو شەماڵە
«شنگ» و «ڕێواس» و «بەڕەزا»ی کەمەر
پەرێت ماوەرووم، نۆش گیانت کەر
کەلانەی «پیچك»، وە کەرەی تازە
چەور و گەرمَ و نەرم، خوەش وەئەنازە
قاورمەی «قارچگ» بۆت لێنێم یەك دەس
خاس وە مەیل خوەت تەڕ بخوەی یا هەس
ئەچم لە شوان، بۆت ئەسێنم شیر
سەرشیر و ماس و مورەبا و پەنیر

سوبحانە لەسەر، سفرەی بەیانیت
حازری ئەکەم، بۆ بەرقلیانیت
بۆ ئەوسەر قەتعی، بەهانەت ئەکەم
بترسیت من خوەم ڕەوانەت ئەکەم
تەهیەی میوانی، خودای گرت وەدڵ
تەواو ماڵەکەی، ڕازانۆ وە گوڵ
وات: یارەب قۆچێ، پەی قوربانی تۆ
بسێنم بێرم، پەی مێمانی تۆ
ئێد وات: چون مەجنون، وێڵ هەردەی کاو
ئەسرین لە دیدەش، مەڕێزا وە تاو
بە دەم لەرزەوە، هەم لەتاب تەب
بە یارەب یارەب وە ئیشارەی لەب
مەوات:[1] ئی دیدەی، ستەمدیدەی من
ئی دڵەی ناشاد، ڕەنج کەشیدەی من
ڕۆشن کەر بە نوور، تەجەلای[2] زاتت
فارغ کەر خەیاڵ، دڵ بە سیفاتت
بێهۆش کەفت وە بان، سەنگ ساراوە
مەناڵاو مەوات وە ماجەراوە
ئەر خودا تەشریف، شەو ئاوەردە بۆ
بێ غەم لە جای وێش، خاوش بەردەبۆ
مەبادا بێدار، نەبۆ خەستە بۆ
دەروازەی مەنزڵ، وێش نسەبەستە بۆ

١- ئەی گوت.
٢- خۆپیشاندان.

دەخـــیلە دێـــرە، بـــا عـــەجەلە کـــەم
قـــۆچەکـــەم بـــوەم، ڕاکـــەم پـــەلە کـــەم
دزو درۆزن، یـــــا جـــــانەوەرێ
بـــــیاونۆ وە زات، پـــــاکش زەرەرێ
ئـــیستە ئـــەوقاتی، شـــیرینی تـــاڵە
بـــێ تـــاقەت بـــووگە، تـــەنیا لەو مـــاڵە
حـــەتمی هـــاتگە، ئـــیستە مـــێهمانە
دەی ســـا بـــۆ نـــەمرم، بـــێ ئاوو نـــانە
بـــچم بـــیوێنم، مـــاڵم پـــڕ نـــوور بـــۆ
قەلبی محزوونی، مـن پـێش مـەسروور بـۆ
وە پـــەلە کـــێشای، وە کـــەشان کـــەشان
قـــۆچ قـــوربانی، خـــوەی وە شـــانەوشان
لێـــژۆ بـــوو چـــون ئـاو هـەرەس لە سـەردا
هـــەر ســـەری ئـــەدا وە هـــەردو بـــەردا
شـــەخسێ بـــەڕاســـی، ســـالم و ســـەلیم
ماجەرای عەرز کـرد وە «مـووسای» کـەلیم
واتش: سـەنگ‌تاشێ، هـا لە کـێف[1] تـوور
بـــێ‌عەقڵەو کـــەماڵ بـێ فـەهمەو شـعوور
هـــەر ڕۆ تـــا وە شـــەو، شـــە وتـا بـەیانی
دەعوەت حەق ئەکـات، لە ڕووی نـادانـی
تا شنەفت «مووسا»، نەکەردش قوسوور[2]
بـە تـوندی و تـاڵی، خـوەی گـەیانە تـوور

---

١-کێو ـ کەژ.
٢-کۆتایی.

سەرسام بی مەنزڵ، سەنگتراشێ دی
مەنزەرەی عەجیب، دڵخراشێ دی
تەواسا و تاسا، «مووسا» لە حەرسا
دەس دا وەئاسا بێ پەرسا و تەرسا
کاسە وە کووزە، کووزە وە کاسە
شێوانی بسات، ئەو بەزمە خاسە
ناغافڵ، سەنگ تاش، ئاما وە لاوە
حەزرەت «مووسای» دی، دەس وە ئەساوە
دیش کاسە و کووزەی، یەکسەر شکیاگە
ئەساسەی ماڵی، لە یەك دریاگە
وتی: وە «مووسا»، بۆ دردمت دێوان
ئەساسەی بسات، شادیمت شێوان
دەك خودا ماڵی تۆیچ بکا کاول
خوەت بکا وە چێو،عابات وە داول[1]
پەی چی شیشەی شەوق، شادیم شکانی
سۆمایی بینای دیدەم تکانی
ناخون دای لە زام، تۆژ نەبەستەکەم
خەمانی قامەت، لە خەم خەستەکەم
یە پەی چێش، خانە خراوم کەردی؟
جگەر پسارەوو کەواوم کەردی
سەرمایەی هەستی، ڕەنجم دای وە باد
خوا رەنجت بکا، وە ڕەنج «فەرهاد»

---

١- داهۆڵ

«مووسا»وە هەیبەت، واتش:[1] ئەی کەم فام!
شێت دێوانەی ئەبڵەی خەیاڵ خام!

خوداوەن زاتێ بێ چوون و چەران
«سُبحانالّذی»[2]، لە عەیب موبەڕان

نە خورد و نە خەو، نە خوەراکی هەس
نە ترس ونە خۆف، بیم و باکی هەس

کەی داخڵ عیشق و شەهد و شەراوە
کەی تاڵب گۆشت و بەڕە[3] کەواوە

ئەو کەی ئارەزووی، سەیران دەشتە
نوور لەقای خوەی سەفای بەهەشتە

بیر و باوەڕی، خوەت لە دەس داگە
دین و ئیمانت زەڕە نەماگە

سەنگ تاش شنەفتی، لە «مووسا» خەبەر
گراواو نالا، چون گاکەموتەر

واتش: وە«مووسا»، وە کۆی زوخاڵ بای[4]
حەق هۆر نەگێرۆ، لێت بەڵکە لاڵ بای

ڕەنجم شی[5] وە باد، جەفام وە عەبەس[6]
داد وە کێ بەرووم، کییەن دادڕەس

ئێد وات وە نالان، وە گریانەوە
ڕوو نیا وە چۆڵ، بیاوانەوە

---

١- پێی وت.
٢- پاك و بێ گەردە.
٣- بەرخ.
٤- ببی.
٥- چو.
٦- بێهودە.

بێ هۆش و گۆش بی، چون مەردەی مـەزار
مـــەگـــرەوا[1] بـــەسۆز، مـــەناڵا وە زار
ســـەر نـــیا وە بـــان، ســـەنگ ســـەردەوە
بـــە نـــائومێدی، خـــاوش بـــەردەوە
حەق خەتابش کەرد وە «موسای عـیمران»
وات: بـــەزات وێـــم، قـــەدیمە و ســوبحان
ڕەنـــجنای دڵـــەی یـــار بـــابەینەت[2]
وێڵ و سەرگەردان، لە سارای[3] مـەینەت
ئـــەر نـــیاوی پـێش، دڵـــداریش دەری
حـــەتمی مـــەوزووت، لە پـــەیغەمبەری
سەرمایەی هەستیش، تـۆ دای بـە غـارەت
زوو بـــچۆ بـــدەر، وە پـێش بـــەشارەت
بـــواچـــە[4] بـــێچوون، بـینای بـان سـەر
ســوبح مـێهمانتەن بـەر لە لیـزگ خـوەر
«مـــووسا»لە مـیقات، لە عـــەتاب حـــەق
تـــەواســـا و تـــەرسا، لە خـــەتاب حـــەق
بـــە هـــەزار زەحـــمەت، تـەقالا و تـەلاش
«مووسا» وە حەسرەت، یاوا وە سەنگ‌تاش
دیش بـــێ‌هوش وە بـان سـەنگ سـەردەوە
مـــــــەناڵۆ بـــــــە زار وە دەم دەردەوە
واتش: ئەی سەنگ تاش! عاقیبەت بـەخەیر
بـــدیە وە ڕەحـــم، خـــوا بکـەر سـەیر

---

١- ئەگریا.
٢- وەفا ـ بەین.
٣- سەحرا، دەشت.
٤- بلێ، بێژە.

هـــۆرزە[١] تـــا وە کـــەی، ئـــەلئامانتەن
بـــدەر مـــزگانیم، حـــەق مـێمانتەن

سەرسام بی سەنگ تـاش، سـاتێ تـەواسـا
هەڵمەت بەرد دەس و پای «مووسا» بۆسا[٢]

بـــینا بـــەخاتر، پـــەی دڵگـــیری ئـــەو
«مووسا» حازر بی، پەی دەسگـیری ئـەو

ئـــــاوەرد وە مـــــەنزڵ، وە دەوان دەو
واتش: بـێدار بـەر، تـا سـەحەر ئـیمشەو

بـــێدار بـــەر دەســـم بـــە دامـــانتەن
شـــادی کـــەر وە شـــاد، حـــەق مـێمانتەن

سەنگ‌تاش وە حەسرەت، تا وادەی شەفەق
مـــدرا مـــونتەزر، پـــەی ئـــامان حـــەق

دیش بەر لە شەفەق، شوعلەی نـوور حـەق
نازڵ بـی نـە سـەر، سـەنگ‌تاش وە تـەبەق

سەنگ‌تاش نوور حـەق، کـێشا وە ئـاغۆش
مەست بی وە لەقای، خـودا شـی لە هـۆش

وە ئـاگـر عـەشق، نـوور حـەق یـەك دەس
گڕ سەند[٣] سووزیا، تا بی وە قـەقنەس[٤]

خـودا ئـەمرش کـەرد وە مـووسای کـەلیم
بـــۆ بـــە زات وێـــم، قـــەدیمە و عـــەزیم

---

١- هەستە، هەڵسە.
٢- ماچی کرد.
٣- ئاگری گرت.
٤- باڵندیە کە کاتێ مەرگی هەندێ پل و پووش کۆ دەکاتەوە وە ئەوندە باڵەکانی بەیەکدا ئەدات تا ئاگر ئەگرێت.

بشــــۆ بــــوێنە، دۆســــەکــەی گــیانیم
ئــاخر گــیان وێش، کــەرد بــە قــوربانیم
وێــنەی پــەروانــان، وە شــوعِلەی نــوورم
ســـــووزیا و ڕۆحش هــــا لە حــوزوورم
شــنەفتش «مــووسا»، دەر دەم بە زەروور
بە زەروورییەت، وێش گەیان وە تــوور[1]
دیش لاشەی سەنگ‌تاش، یەك پارچە نوورەن
مــاواو مــەنزلش، پــڕ پەری‌و حــوورەن
«مووسا» دیش فەوری، سوجدەی حەق بەردش
شـــــوکر زات پــاك، بــێ‌هەمتا کــەردش
دەرلاد یــــەك قــەورێ وە ئــارەزۆی دڵ
ســــازا ڕازانــــا، ســـەرتاسەر وە گــوڵ
بەو تەور، تەکمیل کەرد، «مووسا» ئەو قەورە
بــی وە تــەوافگــای، خــەڵك ئــەو دەورە
یــــا ڕەبــی بــەزات، ذوالجــلالی وێت
وە بــێ مــەکــانی و بــێ‌میسالی[2] وێت
ئــی عــەبد عــاسی[3]، دڵ پــڕ خــەراشــە
بــوەخشە وە خــاك، پــای ئــەو ســەنگ‌تاشە
گونام ئەر چون کۆن[4]، ئەگەر چون خاشە
ڕووم لە ڕووی ڕاسی، نەکەیت چەواشــە
«ئەحمەد» ئەگەر چە گوناش وێنەی «کۆن»
کــان[5] لە مــوقابڵ لوتــف و عــەفو تــۆن

---

١-کێوێکی بەناوبانگە.
٢-بێ وێنەیی.
٣-گناحبار، خەتاکار.
٤-کێو.
٥- وەکوو کایە.

## خاسش فەرماوان شێخ «مەولەوی»[1]

ڕەحمەت نە توربەت، مەولای مەعنەوی
خاسش فەرماوان، شەیخ «مەولەوی»
باران باریگە، خەنەق تەقیگە
کەر تا بالآی گوێی، تیٚیا چەقیگە
منیش ئەو دەردە، بووگە دووچارم
غەم و مەعسیەت، بووگە وە بارم
پای بارەوەرلەنگ، کۆپانم شڕە
بارەکەم سەقەت، ڕیگەکەم قوڕە
کەری بار نەوەر، گیرۆدەی گڵم
تا ڕۆی قیامەت، تیٚیا ماتڵم
کەرەکە شەلە، بارەکەیش قورسە
ڕیگەکە سەختە، ملەکەیش ترسە
ئەگەر بترازێ، کەر وە بارەوە
کلآفە ئەوێ، وە مەغارەوە
لە ڕێی ڕاس وێڵم، من وەو بارەوە
وەلێ شنەم تێ، لە ڕێی لارەوە
بەڵ حەق وە کاران، کردەوەکەی وێش
ئەر تاوێ هەنیم، باورۆ وە پێش

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی بە بۆنەی ئیستقباڵ لە یەك بەیت شێعر لە «مەولەوی» کورد وتووە.

غـــەم و پـــەژارەو، زام و زووخ و ئـێش
گـــردین وە یـــەك جـار، بکـەرۆ سـارِیش
ئـــەر گـــوشاد کـــەرۆ، دەروازەی کـــەرەم
جـــەهەننم مـــەبۆ، وەرەوزەی ئـــرەم[1]



## جەژن مێعراج

جەژن مـێعراجـەن، جـەژن مـێعراجـەن
ئـیمشەو یـادبوود، جـەژن مـێعراجـەن
سکـــەش لە بـــازاڕ، شـاهان ڕەواجـەن
شاهان وە ساحێب، مێعراج مـوحتاجەن
«مســـجدالاقـصیٰ» مـوعەتتەر کـەردش
عـەرش و ئـاسمان، مـونەوەر کـەردش
بەهەمڕای حـەزرەت، وە ئـەمر جـەلیل
ڕکاب بـۆسش بـی، ئـەخی «جـبرەئیل»
فریشتان عـەرش، فـەرش وەش کـەردن
بـەنوور حـەزرەت، مـونەققەش کـەردن
تـــەواف حـــەڵقەی، بـــاب هـــیمەتش
کافیەن پەی دەفـع، گـونای ئـوممەتش

---

١- بەهەشتی ئرەم، باخ یا شارێك بووە کە دەڵین «شداد» یەکێ لە شاهان عەرەب دروستی کردووە وە وەکوو بەهەشتی زەمینی بووە، بەهەشتی شەدادیشیان پێ گوتووە.

چـوار مـەلەكـەی موقەڕەب عـەیان
بـەشارەت مـەدان وە كـەڕو بـەیان
حەق «موحەممەد»ش، پەی پەیغەمبەری
نـیا جـە فـەرقش تـاج سـەروەری
بوراق ئـاوەردەی ڕەف ڕەف سوارەن
مـەئموور ئـەڵغای كـوفر كـوفارەن
خـەڵات خـەرقەی نـوبووەت پۆشان
وە حەق پەی ئیجرای ئەمر حەق كۆشان
پەیغەمبەران گشت، حازر بین جـەلاش
سـەیقەل ڕوو مـەدان، وە گـەرد پـاڵاش
هـەریەك وە نـەوعێ لاڵـە مـەكـەردن
یـەك یـەك وە ئـیكرام نـامش مـەوەردن
وە تـەمجیدەوە مـەكـەردن سـەناش
لاڵـە مـەكـەردن مـەوەردن پـەناش
وە تیب خاتر[١]، دەس بەستەی حوزوور
سەڵەوات مەدان، مـەلەك چـەنی حـوور
«جـبرەئیل» نـەمەند، تـەوانـا و تـابش
عـوزر خـواهی كـەرد، بۆسا ڕكـابش
قـودرەتم نـیە بـەرتەر بـپەڕم
ئـەگـەر بـپەڕم ئـەسووزێ پـەڕم
سرووشێ جە غەیب هـات جـە بـاڵاوە
فـەرماش: بـفەرما، هـەر وە پـاڵاوە

---

١- خاتری خۆش.

وەش ئامای[١] وەش بای، موشەڕەف کەردی
وە عەرش ئەعلام، تەشریف ئاوەردی
وە گەرد پالاَت دۆس عەزیزم
سەفا دەر وە عەرش پاك و تەمیزم
با گەرد پالاَت، پڕ بەها و قیمەت
بوەخشیَ وە عەرش، عەزیمم زینەت
ڕەنگین کەر بە ڕەنگ ڕەنگینت ڕەنگش
با ڕەنگینتەر بۆ نەقش قەشەنگش
خودا نیشانەی، بوزورگی دان پێش
فەخرو العالەمەن[٢] لە شا تا دەروێش
قەلَەم لە ڕووی لەوح، بەی تەور ئینشا کەرد
نام «موحەممەد»، بەعد، لە «اَللّه» بەرد



١- خۆش هاتی، بەخێرهاتی.
٢- هۆی شانازی هەمووکەسە.

## وە تولووع تاعەت

وە تـولووع تـاعەت ئـیتاعەت کـەردەن
فەرزەن نـەك وە قـەرز، بـەجا ئـاوردەن
فـەرزەن ئـەو فـەرزە، لەو فـەرزە فـەرزە
وەر نـە بـێ‌سوودە، ئـی ئـەدا و قـەرزە
مـامەڵە مـاچان[١]، ڕاسـە وە بـەختە
وەنسـیە[٢] مـەخە ئـەو مـامڵەی نـەختە
نەك وەك من ئیسە، وە زامەت[٣] سەختم
وە نسـیە کـەفتگە مـامڵەی نـەختم
یـاران مـاڵ هـۆردان، وەهـەوارەوە
مـن هـەر حـاحامەن، گـا وە بـارەوە
دەس لە هـاو دەسـبار، حـەقیقی بـڕیان
بار هەم لارەسەنگ، تەنگ‌بار نـەکـریان
بێ تۆشە و تـەنیا، بـار کـەفتەی هـەردم
کـەرەم‌دار مـەرویش دەواکـا دەردم
فـریاڕەس بـڕەس، تـۆی فـریاڕەسم
بێ‌کەسم بێ‌کەس، بێ‌کەس تۆی کەسم
سـاقی فـدات بـام، وادەی وەخـتشەن
دڵەی تفڵان خۆم، جەهدو جەختشەن[٤]

١- ئەڵێن.
٢- قەرز.
٣- زەحمەت.
٤- جۆش و خورۆش وەهەوڵ دان و رەنج کێشان.

دەس بەردار نیەن، وە کوڵ مەجۆشۆ
مایلەن جامێ، بدەی بنۆشۆ

تۆیچ سا وێت ئاسا؛ مەدەرەش بازی
وە جامێ جە وێت، بکەرەش ڕازی

بادا بنۆشۆ، جورعەی جام مەی
وە یاد دەوران، بەزم جەم و کەی

ئاخر نەك ئی چەرخ، چەواشەی چەپگەرد
ڕیشەی جەم و کەی، سەرجەم بەرئاوەرد

دەروازەی هەستیم، کلیل و کۆمە
شوخم مەزرەعەی، کشتم بێ تۆمە

لە فەلایی[1] خوەم دەسم بڕیاگە
هۆڕەکەم وە بان، گاوە دڕیاگە

پاییز بێ زمهەڕ زمسان غوسەمە
بەهار قاتوقڕتاوسان وسەمە[2]

مەرخوا هەر خوەی بمخاتە باریا
پا بنێم وەبان، سەرکورەی داریا

وەرنە بێ سوودە، ئی شوم[3] و کشتە
ماڵ وێرانیە، ئی مەنو مشتە



١- جووتیاری.

٢- لە ڕابرووداکەسانێ کە زۆر نەدار بوون وەکاتێ گەندمیان ئەبرد بۆ ئاسیاو لەبەرکەم بوون گەندمەکەیان بۆ ئارد نەدە کرد. ناچار گەندمەکەیان لەسەرگەندمی کەسێ تر ئەرێژا وەدوایی بەقەد گەندمەکەی خۆیان ئاردیان ئەبرد.

٣- زەوی کێلدراو، جووت کراو.

## بینای بێ زەواڵ

بــینای بــێ زەواڵ، بــینای بــێ‌زەواڵ
پــادشای شــاهان، بــینای بــێ‌زەواڵ
با خـەبەر وە حـاڵ، کـەڕو کـوێر و لاڵ
نگـارندەی چـەرخ، ڕۆژ و مـاە و سـاڵ
فـەرد تـەنیای تـاك، بـێ‌باك لە تـانە
گــەردانـندەی چـەرخ دەور و زەمـانە
یـا قــەدیم بـەزات پادشای ئـەقدەس
یــا ڕازق ڕزق مــوورچــەو مـەگـەس
ئــــاشنایی دەر، خــــوێش و بــێگانە
بێ‌پەروا پەی شـەمع، کـەردی پـەروانـە
جیلوە بـەخش بـەزم، دێـوانـە و عـاقڵ
ئــاگــا وە نـاڵەی، بـوڵبڵان پـەی گـوڵ
تــــەسەلی دادەی دلەی دڵ‌ڕێشــــان
مـەڵهەم زەدەی زام زخـوومەت کـێشان
ســـەڵوات و ســـەلام، «ربالعــالمین»
نازڵ بۆ لە سەر،«موحەممەد ئەمین»(ص)
درووود بــۆ ئــەرواح ئـاڵو ئـەسحابش
گــــیانمەدان وەمــەیل لەپــایڕکابش

ڕەحمەت حەق لە سەر، هەر چوار یارش
مەخسووسەن[١]، «سددیق» ڕەفیق غارش

وە قەد عیلم حەق، حیلم پەیغەمبەر
سەڵوات و سەلام، پەی حەزرەت «عومەر»

سالار سەربەرز، دیوان مەحشەر
ئاشکار کەردەی، الله اکبر

سێهەم «ذی‌النورین[٢]»، «نوراً علیٰ نور»
خزمەتی ئیسلام، مەکەرد بێ قوسوور

درورود و حەمد و سەنا پەی «حەیدەر»[٣]
ستوون سەیوان، دین پەیغەمبەر(ص)

یارەب بە حاجەت،دین «موحەممەد»(ص)
بوویەر لە تەقسیر، نادانی «ئەحمەد»



١- بەتایبەت.
٢- لەقەبی حەزرەتی «عوسمانە».
٣- لەقەبی حەزرەتی «عەلی».

## سەحرای «حجاز» ڕەوشەنەن

ئیمشەو شادیو سروورەن، دنیا گشت پڕ لە نوورەن
جەشن مەلەکو حوورەن، شەیتان لەم بەزمە دوورەن
دڵمان فارغ لە غەمەن، چون بەزم بەزم دەمەن
هەر چی بێژم هەر کەمەن، یاد نەبی خاتەمەن
سەحرای «حجاز» ڕەوشەنەن، هەر وەك بەهەشت گوڵشەنەن
قەدمگای ڕەسوول زولمەنەن، دنیا وە ئەو پابەنەن
«ئەحمەد» فەرمووی وە شتاب، ئیبلاغ بکەن وە ئەسحاب
بو ئیجرای ئەمر وەهاب، حازر بوون گشت بۆ جەواب
جەم بوون و هاتن یەکسەر، عەرزیان کرد وە پەیغەمبەر(ص)
ئەمرت پێمان ئیبلاغ کەر، دل ساکن و بێ داخ کەر
ئەسحاب وە قەوڵ خاتەم، جەم بوون وەك پەروانەو شەم
مەدان گشتیان وە یەكدەم سەڵەوات وە فەخر عالەم
وتی: کێیەن مەولاتان، دافع هەر بەلاتان
مەولاو ڕەهنماتان، لە مەحشەر شەفاخواتان
گشتیان لە عالیو دانی، وتن: تۆ مەولامانی
دنیا ڕەهنمامانی، مەحشەر شەفا خوامانی
ئەوەڵ «ڕەفیق غارش»، دوهەم «فارووق» یارش
سێیەم «عوسمان» موشارش، چوارم «عەلی» دڵدارش
وتیان: موتیعیم یاڕەسوول، هەر ئایەتێ بۆ نزوول
«امنّا» کەردیم قەبوول، ئەمرت ئەمرەن یا ڕەسوول

خودا خوەیە ئاگامان، هەر چی بوێت گونامان
ئیسلام یەکێکە رامان، «موحەممەدەن» پەنامان



## یا «الله» زارم

یا «الله» زارم، یا «الله» زارم
یا «الله» نەکەیت زەلیل و زارم
نەکەری زەبوون، نەفس عەممارم
کۆی کبر و ڕیا نەکەیت وە بارم
کەماڵم وە نەفس نەکەری زەبوون
فەریبم نەدۆ، شەیتان وە ئەفسوون
وە دانەی تەمەع، نەوزی وەدامم
تا مەحشەر نەکەیت زەبوون بە زامم
من وێم مەزانووم چەند شەرمەسارم
عاسی و ڕووسیای رووی ڕۆزگارم
عسیان چون قولەی قاف وە بارمەن
یاد مەیل تۆ، مەدەدکارمەن
لە دنیای دەنی کوێر و کەر بووگم
بێ بەش لەشادی گیرشەڕ بووگم
تەنیا و نابەڵەد پشتیبانم تۆی
لە مەوج تۆفان کشتیبانم تۆی

ڕووی ڕو بە ڕووی ڕەحمت ئاوەردم
گرانتەر نەبۆ جە فێشتەر دەردم
قەدەم وە بارگەی، یانەکەت بەردم
خاکش پەی دەوای، دەرد دڵ وەردم
ڕووی سیام وەخاك ماڵەکەت مالام
پەی بەدبەختی وێم نالام و لالام
دل لە تۆی بۆتەی گەرمی مەیل جوشا
ئەسرینم چون جۆی سەراو خوڕۆشا
وە ئیلتیجاوە ڕووم مالا وە خاك
خاك وە ئەسرینم نمنم بی‌نمناك
واتم: بەخشەندەی گوناکارانی
شەفا بەخش دەرد دەردە دارانی
پەنام ئاوەردەن وەی گشت گوناوە
بەی مووی سفیدو وەی ڕووی سیاوە
بەزەییت بەیۆ وە شەرمەساریم
ئامان دەرمان کەر دەردان کاریم
ڕەحمێ کەر وە حاڵ پەشێوی جەستەم
مەڵهەم دەر پەی ئێش زامان خەستەم
دەلاڵەت وە دڵ، دڵگیرم دەرە
لە هەر دوو دنیا، دەسگیرم کەرە
یە دەرد دڵەن، کەی حکایەتەن
حکایەت نیەن، هەر شکایەتەن
دەرمان دەردان، نادیاریم کەر
ئاشنای ڕاگەی، ڕەستگاریم کەر

وە فـەخر تـاعەت مـەغروورم نـەکـەی
وە بادەی غەفڵەت مـەسروورم نـەکـەی
ڕووم لەڕووی ڕاسی ڕووگەردان نەکەی
ڕەنگ زەردم لە ناو، هامفەردان نەکـەی
زادگای حەزرەت «ڕەسووڵ کەردم سەیر
بـەشارەت مـەدا خـیراً عـلی خـیر
شـادی دا بـە شـاد شکست وە غـەم دا
ڕۆشـنی بـە ڕووی سـەحرای مـاتەم دا
چەند میلیۆن فرقەی حاجیان هـەم بـی
بێ شك نیشانەی سەحرای عـەدەم بـی
من هەم وە ڕەجم «شەیتان» کـەردم ڕەد
تـەوبە لە بـەدی کـەردم تـا ئـەبەد
وە ئوسووڵ شـەرع شـیم وە عـەرەفات
بێ حەد وانام حـەمد بـەزاتو سـیفات
شوکر حەق کەردم بێ حەساب و حـەد
مـاڵام ڕووم بەڕووی «حـجرالاسـود»
تـاهر لە تـەوهین دوور بـیم لە کـینە
وە پـاکـی ڕاهـی بـیم پـەی «مـەدینە»
حوجرەی سەعادەت شـای خَـیرالْـبشَر
بـەشارەت مـەدا پـەیاپەی یـەکسـەر
تـەواف حـەڵقەی بـاب هـیممەتم
کـافییەن پـەی دەفـع گـونای ئـوممەتم
من بەندەی تـۆم و ئـوممەت ڕەسـووڵ
یـا «اَللّه» لاڵـەم بکـەری قـەبووڵ

## بۆحەزرەتی «عەلی رض»[1]

یـــا «عـــەلی» دادم! یـــا «عـــەلی» دادم!
یـــا «عـــەلی» دەخـــیل! بـرەس وە دادم

وە لای کـــێ بـــەرووم! داد و فـــریادم
ئـــیسمت یـا «عـەلی»، ئـامان وە یـادم

مەولای دەروێشان! مەولای دەروێشان!
مەدەد یا «عـەلی»، مـەولای دەروێشـان

تۆی حەکیم حاڵ، جوملەی دڵڕێشـان
هەر تۆی فەرەح بەخش، قەلب پەرێشان

شەخس هەن ئەر پەنا، بەرووم وە پێشان
هـەریەك وە مـیقدار، هـیممەت وێشـان

فەقەت هەر تۆی شای، ڕیازەت کێشان
تـۆ مـوشکیل گـوشای، مـنم پـەرێشان

یـــا «عـــەلی» زاتت! یـا «عـەلی» زاتت!
یا «عـەلی» مـەدەم، سـەوگەند بـە زاتت

بەو شان و شەوکەت، شێوە و سـیفاتت
بەو گشت زۆر و زات، بـەو کـەرامـاتت

---

١- میرزا ئەحمەدی داواشی دەڵێت کە لە خەودا بە حزمەتی حەزرەتی «عەلی» گەیشتووم وە سەبارەت بەو خەوە ئەم سێ بەیتە ئەڵێ:

واردم شـەربەتێ نـۆشام شـەکـەرێ
دیـەنم سـەودایە تـیغ دووسـەرێ

قەدەم وە بـارگەی مـوقەدەم بـەردم
سەیر کەرامات حـەیدەریش کـەردم

ئەگەر بـواچـووم شـەرح بـەیانەت
مەبۆ پەی فەردای من وە خـەیانەت

باقی‌یەن موعجز، حاڵ حەیاتت
چە فەرقەن پەی تۆ، ئەحیا و مەماتت
بەو سەخاوەتە، سایەڵ[1] وات جە توو
تۆ وێت پەرێ ئەو، نیای لە تەرازوو
یا «عەلی»! منیش، وە تۆ موحتاجم
چون ئەو سایەڵە، بکەر عیلاجم
یا «عەلی» بەنەن! یا «عەلی» بەنەن!
نەراد نەردم، لە شەش‌دەر بەنەن
سپای غەم وا دەور، قەڵای دڵ تەنەن
ڕیشەی بنچینەی شادیم تێشکەنەن
زۆر[2]لە کتف‌و شان، دەس و پام سەنەن
تەوانا و تاقەت، دونیام نەمەنەن
دەقیانووس کووس ناقووسی ژەنەن
نەوبەتەن پەرێ، زوڵفەقار شەنەن
مەر وێت بەو موعجیز، عیفریت بەنەوە
بەو سەیف دوو سەر، قودرەت ژەنەوە
عەڵەم شادیم، لە دڵ بەرپا کەیت
بەختم وێنەی شەست، عیفریت ڕەها کەیت
یا «عەلی» تەنگەن! یا «عەلی» تەنگەن!
یا «عەلی» دەخیل! وەختم وە تەنگەن
دڵ زەدەی سەرنێش، مەودای خەدەنگەن
ڕۆشنیم لە عەین، تاریکەی زەنگەن

---

١- سواڵکەر.

٢- هێز. توانا.

زوانم جه وەسف، سەنای تۆ لەنگەن
شەربەتم ژارەن[١]، شەهدم شەرەنگەن[٢]
کەشتیم لە گێجاو، گیر نەهەنگەن
قافڵەم لە خەرگاو، ماتڵ و لەنگەن
فریشتەم لە خەو، بێهۆشی بەنگەن[٣]
دڵش لە بارەم، چون سیاسەنگەن
دامانم جە زووخ، زامان گوڵڕەنگەن
مەولا بە فریام، بڕەس درەنگەن
بەند بەڕ بەڕبەس، بەند بەڕ بەڕبەس
یا «عەلی» ئەعلا، بەند بەڕ بەڕبەس
حەل نمای موشکیل، وامەندەی بێکەس
دادخوای عادڵ، ئەمیر ئەقدەس[۴]
حەبەن دڵ چون کەوك، لەقەڕن قەفەس
ڕای نەجات نیەن، بکێشووم نەفەس
چون «غولام ڕەزا»[٥]، گیرم وە مەحبەس
ئومێدم نسیەن، غەیر لە تۆ وە کەس
یا «عەلی» زارم! یا «عەلی» زارم!
یا «عەلی» دەخیل! زەلیل و زارم
لە تەنگی ئەوقات، لە گیان بێزارم
مەحرومم لە دین، دیدەی نازارم

---

١- زەهر، سەم.
٢- زەهر، هەرشتێکی تاڵ.
٣- مەست.
٤- پاك‌تر.
٥- ئیشارە بەحەفت بەند شێعرەکانی «غلامرضاخان» ئەرکەوازی کە لە بەندیخانەی حسن خان والی لوڕستان گوتوویەتی.

ئــەوەن یـا «عـەلی»، سـەختەن ئـازارم
چــون گــدای بــێپووڵ، وێـڵ بـازاڕم
دڵ زەدەی مــەودای، سەرنێش خـارم
بـــار نـــاتاقەت، بـــیەن وە بـــاڕم
زەلیـــل زامــەت،[1] ڕووی ڕۆزگــارم
هــەر ئــان وە جـۆرێ، مـەدۆ ئـازارم
چون بوڵبوڵ مەحرووم، فـەسڵ بـەهارم
مـــەولا بـــە لوتــفت، ئــومێدەوارم
بەوێنەی «سـەڵمان»، یـا «عـەلی» گـیرم
گــیر سـەرپەنجەی، پڕ خـەشم شـیرم
مەر وێت بەو موعجیز، بـدەی نـەجاتم
وەر نــە یـا «عـەلی»، قـەتعەن حـەیاتم
یا «عەلی» جەمەن! یا «عـەلی» جـەمەن!
ئــەوەن خـەیاڵات، لە دەروون جـەمەن
دڵ زەدەی سەر نێش، مەودای[2] ستەمەن
شــەهد شـەربەتم، ژار[3] ئـەرقەمەن[4]
شــادی لێــم بـێزار، غـەمم هـاودەمەن
خــەیاڵ، زکــر زات، یـاد تـۆم کـەمەن
موشکیل گوشاد کەرا موشکیلم کـەفتەن
فــریشتەم لە خـاو، بێهۆشی خـەفتەن

---

١- زەحمەت.
٢- لێواری تێغ، نوکی خەنجەر و شمشێر، نوکی تێژ.
٣- زەهر.
٤- ماری ڕەش و چەرمگ، ماری ڕەش کە لە بان پشتیدا خاڵی سپی بێت، خراپترین مارگەل.

یـا «عـەلی» هـانا، ڕسـتگارش کـەر
لە خـاو غـەفڵەت، بـۆ بـێدارش کـەر

مەولام ئەر نەکەی، ڕەحمێ وە جەستەم
بـاز نـەکـەی قـاپی، موراد بـەستەم

سـاکـن نـەکـەی دڵ، لە غـەمان کـەیلم
نەبەندی چون سەد، سەرچەشمەی سەیلم

سارێش نەکەی زووخ، زامەت نەڕەستەم
وەئـیلا لە ژێـر، بـار غـەم خـەستەم

مەر من لە حەساو تـۆ تـەرحـم مـەولام
تاکەی نـەمەدەی، تـۆ فـەرحـم مـەولام

«ئەحمەد» مونتەریز، لوتـف مـەولاشەن
مەولا غـەیر لە تـۆ، وەکـێ هـاناشەن[1]



١- هاوارئەکا.

## تۆبەی گورگ

گـورگێ جـە تـەقدیر، جـەفای ڕۆزگـار
لە گەردشی چەرخ، چەپی چـەپ ڕەفـتار
تـــەڵە گـــرتیوو، بـــەینێ وا مـــاوو
مـــاجەرای دنـــیا، ســـەری لێداوو
چەفت و چیڵ و چەق، وا قرخـۆڵ بووو
لە بـرسیا کـەفتگ، خـاس گـەڕۆڵ بووو
هـــێزی نـــەماوو، بـۆ بـەرەوژووره
ئـەیوت خـوا مـەرگ، ڕێگـەکـە دووره
تـــەوانـــا و تـاقەت، نـەماوو لە لای
زەوی نـەئەگـرت بۆ ڕێوەروون پـای
بـــــینشی زەیـــنی، زەڕە نـــەماوو
لە کـــــونالووتی تکــــەی داداوو
چـــەقی ژێـــر مـلی، گـەیووە نـافی
مـــونەریف[1] بـووو لە بـێ ئینسافی
لچ داشـــۆڕیاگ، دەمـــی دۆڵ بـووو
چـاوی شـێویاوو، دگـانی کـۆڵ بـووو
گـەڵوو داکـەفتگ سـوورەت لۆچ و پـۆچ
هـەر وەك کـەیوانـۆی کـۆنەی دوا کـۆچ

---

١- پەشیمان.

زوانـــــی کـــــەفتوو، وە لای کـــەلاوەی
کـــنیاوو هـــەر پـــەنج، پـــەنجەی کـــڵاوەی
دووگ داڕزیـــاگ، مـــێش دایـــوە بـــنی
بـــــوو وە تـــــەماتەی، قـــرمزی گـــونی
قۆنگ و قرخ بـووو، وە سێن ئـەیلرخـان
هەر وەك سل گرتگ، وە حاڵ ئـەیقرخـان
وە هـــەر فـــەلاکـــەت، گـەیی وە غـارێ
غـــــــار نـــــاهامار، تـــــا نـــــادیارێ
کەفت لە قاپی غـار، ئـەی نـاڵان لە دەرد
ئـــەیوت تـــۆبەوێ، تـــاك تـەنیای فـەرد
شـــــەرتوێ تـــا لە دەور، دنـــیا بـــمێنم
هـەر ڕۆژ ڕۆژگـوم، شـەو نـوێژ بـخوێنم
عومرم سەرف بکەم، بە زوهد و بـە وەرع
زەڕە لانـــەدەم، لە ســـەر ڕێگـەی شـەرع
بۆهەر بێگانە، لە خوێش، خوێش تـر بـم
دی[1] گورگی نەکەم، لە مێش مێش‌تر بـم
ئـــــازارم نـــــەوێ، بـــــۆ بـــێ‌زوانـــێ
لەم غـــارا بـــمرم، کـــەس پـــێم نـەزانـێ
مـــێ و بـــزن ئـــەر پـــا، بـنێنە چـــاوم
خـــوا ئـــاگـــاوی، لێ‌یـــان لێـــڵ نـــاوم
عـــومرێکم مـــاوێ، لەی دونـــیای فـانی
شـــەرتە ســـەرفی کـەم، لە ڕێـی شـوانـی

١- قەت - ئیتر.

ئەشێ خوەم حەفت ساڵ، کەڕەك پۆش بکەم
غـــولامی مـێ پەر، بـزنەپۆش بکـەم
وە ڕۆژ خـــزمەتکار، وەشـــەو پـاسەوان
وە ڕیـــــــازەتۆ، بـــێ ئاوو بـــێ نان
یــەك مـێو یـەك بـزن، لە ڕان جـێ ماون
ئـــاوس ون ئـەوشەو، هــەردکیان زاون
شــیر خـوەیان ئـەداو کـاوێژیان ئـەکـرد
کەم کەم لە قەسەم گورگ گوێیان ئەگـرد
بــزن بــووە دەروێش، لەرزی و قـاڕانـی
مــێ بــووە ســۆفی، فــەوری بـاڕانـی
وتـــیان: السّـــلام، عـــابدی عـالی
فــەرمایشت چــەس، بـمان کـە حـالی
وتی: بووگمە شـێخ، بـۆ ڕێـی هـەدایـەت
بـۆ سـۆفی و دەروێش، گـرتن بـێ غایەت
دیــــارە ئـــێوە، چـــارە ســـفیدن
خــــوەتان هــاتگن، ئــەوڵ مــوریدن
زەحـــمەت بکـێشن، بـچن ئـیرشاد کـەن
هەریەك چەن مـورید، سـادق وە یـادکەن
بــەچکە کــانیچتان، بـێرنە لای خــوەم
لە خـوەتان خـاستر، خـزمەتیان ئـەکـەم
بــزن و مــێ لە بــان، هــاتن وە دامـان
بــۆ ئـیرشاد کــردن، کـەفتنە ڕانـەو ڕان
هـۆز وە هـۆز ئـەچوون وە دڵـەی بـریان
وە دەم قــــاڕەوە وە چـــاوی گـــریان

هەر کە چەن کەسێ، لە ئەقرەبا و خوێش
خوەیان جەم کردۆ، لە بزن و لە مێش
وتیان بێن بچین، عەشرەت بێ‌درێخ
خوا شوکر گورگی بۆمان کردە شێخ
ئێمەیچ لازمە، وە بێ زەحمەتێ
بچین و بوەین، بۆ ئەو نیعمەتێ
بەڵ بکەفینە بەر دۆعای خەیر ئەو
شاد بوین وە دین، سەفا و سەیر ئەو
قەسەمی خواردگە، وە چەن ئاواتێ
هیچ قەبووڵ ناکا، لە کەس سەوقاتێ
وە قەوڵ سۆفی،وە گوفتەی دەروێش
دڵیان گەرم بوو، چ بزن و چ مێش
وە قاڕە و بارە، جومڵە قەوم و خوێش
هەڵسان کەفتنە شوێن، خەڵیفە و دەروێش
مێ خوەی خەڵیفە و بزن دەروێش‌و
باقی مەعلومە، سەرچۆپی کێش‌و
تاگەین وە دەر، قاپی پیریان
غەیر شێخ نەماوو کەس، لە بیریان
دی‌یان هەر وەك خوەی گورگ خەفتگە
گوێچکەی، وە لای ملیا کەفتگە
چەرمگۆ نەوگەو ڕەنگی هەر بۆرە
زانی‌یان تەوبەی گورگ ناجۆرە
گورگ دی ئازا، هەڵسا خوەی دەسوور
ناڵی و لوورانی و سەری کردەژوور

وتـــی: خـــوا شـــوکر ڕزقــم وافــربوو
لە شــێخی دەر چـــوو فـەوری کـافربوو

کەفتنە خـاك و پـای گـورگ وە بـێ‌درێخ
گـــورگ دگـانی ساودا، هـەر وەك تـێخ

چـاوی لێ قـووچان، وە نـەرم ئـەیمیران
لێو خوەی ئەخواردوو، دگـانی ئـەکیران

وتـی: بـە خـەیر بێن، بـچنە ئـەم غـارە
ئـیسراحـەت بکـەن، مـەوقەی نـەهارە

بـەسیە ئـیتر مـن، شـەرمەسار مـەکـەن
لەمـە بـەدبەخت‌تر، گـوناباز مـەکـەن

سـەری تـەسلیمیان، بـۆ هـاوردە خـوار
خام و خاوۆ بوون، یەك سەر چوونە غار

گورگ دی[1] بازی، خەیلێ خـاسی کـرد
دووشەشی[2] هاورد، شەش دەرەکەی گرد

دووگـی لێ جـەڕدا، سـەری هـەڵبڕی
ڕوویـانی تـێ‌کـرد، دەمـی داچـڕی

وتـی: نـە بێ‌هوش، نـە مـەستی مـەیم
ئـیستە وە حـوزوور، بـاپیرەم گـەیم

وا تـێمی خـوڕی، تـرسیام لە ئـەو
تـاقەتم نـەگـرت، ڕاشـنیام لە خـەو

وتـی: پـێم تـۆ کـەی، مـەوقەی تـۆبەتە
فـرسەتە کـوێروی، هـەڵسە نـۆبەتە

---

١- بینی.
٢- وتەیەکە لەکایەی تەختە نەرد بەکاری دەبەن.

تەوبەی گورگ مەرگ بووگە و مردگە
مەگەر تۆ حیزی، تۆبەت کردگە
ئەگەر وە قەوڵ، جەدەم ئیمجارە
نەکەم کوێر ئەوم، بێ کەس لەم غارە
خودا وا ئێوەی، هاوردگە ماڵم
ئەلبەت زاڵمن، منیچ زەواڵم
بەکامیان ڕازین، پێم بێژن کورم
بستانخنکێنم، یا بستاندرم
حەتمیە ئیمڕۆس، ڕۆژ مەرگتان
قسمەتی منە، سیە و جەرگتان
عەرزیان کرد قوربان، وایە مەزانە
باپیرەت نەوگە، ئەوە شەیتانە
پەشیمانۆ بە، لەم خەیاڵاتە
بە غەیر لە گورگی، کاسبی قاتە؟
وتی: شەیتانێ، وەها خەیروێژ وێ
یاخودا هەر وا، عومری درێژ وێ
هەرکس بۆ هەرکس، ئەر قانزاجی[1] وێت
وەك عەقرەب و مار، ئەر مەزاجی وێت
ئەشێ لە قەولی، هیچ خەتا نەکەی
هەرچی ئەوَ ئێژێت، ئەشێ وا بکەی
وێڵتان کەم بچن، مەگەر من کوێرم
دووگستان ئەوڕم و پیرتان دەرتێرم

---

١- سوود ـ نەفع.

«ئـــەحمەد» دی بـــەسە، کـــافیە و حـــەدە
گورگ خوەی خاسە، گورگەمێش[1] بـەدە



## حەجی ڕێوی[2]

یـــــەك ڕۆ ڕووبـــــایە، لە ڕاو ڕەمـــــیدە
زەرپ و زۆر و زوڵـــم، ســـەیادان دیـــدە
سـەرد و گـەرم و شـۆر، تـەڵخی چـەشیدە
مـــەینەتان وە مـــەیل، ڕەقـــیب کـــەشیدە
دەرەو دۆڵ و یـــاڵ ســـارا تـــەی کـــەردە
تـــا وە جـــەزیرەی، جـــەزا پـــەی بـــەردە
خــــەیاڵان خـــام، وە خــــەیاڵ وێش
لە ســـــەر بـــەرکەردەن، وە کـــەماڵ وێش
تـــار زەمـــزەمەی مـــووزیگەری وێش
ژەندش بە مـیزراب، ڕمـووزیگەری وێش
کـــەفت وە خـــەیاڵێ بـــەشارەت دەر بــۆ
ئـــەغفاڵ کـــونەندە و غـــارەت گـــەرتەر بـۆ
وە دەس تـــــەبیعەت، لە دەرگـــای عـــیلاج
وا عــــــیلاجی کـــرد، بـــبۆ وە حـــەجاج

١- ئەوکەسەی کە گورگە بەڵام جلی مێی کردوەتە بەری.
٢- مەبەست لە ئەم شێعرە تەزویرو چەلە تاندنە کە حاکمان و زۆرکارانی مێژووله سێ شت یانێ: زەڕو زۆرو تەزویر بۆئیستیعماری خەلك کەلکیان وەرگرتووە.

نە وە شەو ئارام نە ڕۆژ مەکەرد خاو
تەی مەکەرد سارا و کەش و کۆو کاو
تا غووروب گەیی، وە نزیك شارێ
دی[١] چەشمە ئاوو یەك و دوو دارێ
دی[٢] دەرگای مەنزوور، ئارەزۆی وازە
ئاخونێ[٣] مەشغووڵ ئەدای نمازە
عابای کردە بەر، نەوی لە عاسای
مێزەرەی بەستۆو کەوشی کردە پای
مەلا وە خەیاڵ، خەوەی خەوی بردۆ
ڕێوی وە فرسەت کەرەکەی کردۆ
هەوساری کێشاو بردیە پای سەنگێ
سوار کەر خوەی بوو، وە بێدرەنگێ
شەمڵە و مێزەرەی، وە سەر نیا کەج
چە بکەم، چە نەکەم، کەفتە ڕیگەی حەج
ئاخون لە دوای، دوعای مەغفەرەت
لە دەرگای باری، عوزر و مەعزەرەت
ڕوانی کەرو، ئابای نەماگە
کەوش و مێزەرە و عەسای برياگە
ڕێوی تا سوار، کەر مەتڵەب بوو
جڵەو کەجتر و بەتر جەڵەب بوو
وە شەو ڕا مەکەرد، وە بێئازارێ
بە ڕۆ جا مەگەرد، لە مەرغزارێ

---

١- بینی، چاوی پێ کەوت  ٢- تێ گەیشت.
٣- مەلا.

تــا یــاوا وە ســەر، ســەرئاوو حــەوزێ
دیش وە تاك تیا، نیشتگە سەر سەوزێ[١]

ڕێوی سەر سەوزی، فەوریَ دی وە چاو
وتــــی: «السّـــلام»، ســاداتــی ســەراو

«إنشـــاألله» دۆعــای خــەیرم بــۆ بکــە
خــــەیاڵم کــــردگە، بــچم بــۆ مــەکــە

دۆعــــای خــاسان وێ، دۆس حــەقیقیم
ئــــــومێدەوارم بکـــــەی ڕەفــــیقیم

وتـــــی: حــــازرم بــۆ، نــیك و بــەدت
بـــــفرما بـــچین پـــەنا وە جـــەدت

«سەرسەوز» کەفتە بەر، «ڕێـوی» لە شوێنی
تـــا فـــرسەت بـێرێو بـوێتە خـوێنی

ڕاە کــــەردن ئــەو ڕۆ، یــاوان وە بــاغێ
یــەك بــاغێ شـیرین، سـاحێو پـەرداغـێ

لە چــێچەی بـولبوڵ، لە بـۆی عـەتر گـوڵ
زەوق مــــەدا وە دڵ، جــــوان و کـــامڵ

بـــەهەشت قــەرینە، فــردەوس شــێوەیە
پــــڕسایە و ســـێوەر، ســاحێو مــێوەیە

ڕەواس[٢] گۆشش گرت، تـەقە تـەقێ مـەی
دەنــووکە تــەقەی، یــەك لەق لەقـێ مـەی

عــاباى کــردە بــەر، نــەوی لە عــاسای
مــێزەرەی بــەستۆو کــەوشی کـردە پـای

---

١- مرئاوی، سۆنە. ٢- ڕێوی.

بـۆ مـەرام خـوەی، وە بـەهانەی حـەق
لەقـەلەق ڕێـوی، ڕوی بـۆ لای لەقلەق
«لەقلەق» ڕێـوی دی، هـاتە پـێشوازی
ڕێـوی وتـی: پـێی، خـوداێت لێ ڕازی
پـەنام هـاوردگە، لە ڕووی گـومڕایـیم
هـەمڕاهـیم، بکـە جـە ڕووی بـرایـیم
عـەرز نـاکـەم بـرا، وەك ئـاغە و نـەوکەر
بـۆ ئـەم ڕێـی خـەیرە، بـووینە هـاوسەفەر
«ڕێـوی» کـزی کـرد، دومـێکی لەقـان
«لەقلەق» لە خـوەشی، دەنـووکی تـەقان
وتـی: حـازرم، هـەم مـەمنوونتم
چـون ئـەچی بـۆ حـەج، ڕەهـنموونتم
«ڕێـوی» وا درگـای، عـەیاری کـردۆ
لەق لەقـی لە گـەڵ، خـوەیا هـاوردۆ
وەلێ «سەر سەوز»ی خاس کـردوو حـاڵی
فـەوری هـاتە بـاڵ وە ئـیستیقباڵی
وتـی: بـە خـەیر بێی حـاجی قـەدیمی
بـوزرگیت کـردگە حـەقە نـەجیمی
مـێزەرەم وە ڕەنگ ڕاسـی سـەوز بـووە
تـەشریفت هـاورد، دڵ پـڕ فـەوز بـووە
سـەرسەوز و لەق لەق، «ڕێـوی» وە تـفاق
سواربـوونو چـوون، وە خـەندە و مـەزاق
وەلحـاسڵ خـوەش ون، هـەریەك وە حـاڵێ
قـسمەت ڕێگـەیان، کـەفتە پـەڕ مـاڵێ

دی یـــان هـــاتیا، کـــەیوانـــۆی کـــوێرێ
مـــامر و جـــووجك و یـــەك کـــەڵەشێرێ
«ڕێـــوی» ڕوانـــــی، زانـــــی فـــرسەتە
وتـــــی: بـــــراگـــەل، وەخت نـــەسرەتە
ئـــەگـــەر کـــی گـــەلوین، شـــیرینتر ئـــەوین
جـــەماعەتمان بـــوێ، نـــوورینتر ئـــەوین
هـــەرکەس بـــۆ ڕێگـــەی، ڕاســـی عـــازمە
مـــەخسووس بـــۆ دیـــنوێ، مـــەلا لازمـــە
بـــووچکی بکـــەین نـــەوێ مـــننەتمان
خـــاسە بـــۆ تـــەڵقین فـــەرز و ســـوننەتمان
وتـــیان: مـــــامۆسا، لەم کـــوێرە دێـــدا
مـــــەعاشت چـــــلۆن، ئـــــەچێتە ڕێـــدا
خـــــــێزانت فـــــرەس مـــــناڵت وردە
فـــایدەی نـــیە بـــۆت هـــەر کـــرد و خـــوردە
ئەر تەشریف بێری، گوڵ ڕێزانت ئـەکـەین
بـــووچکی خـــوەت و خـــێزانت ئـــەکـــەین
وتـــــی: حـــــازرم، مـــنیچ بـــار ئـــەکـــەم
بـــــە مـــــەلایی‌تان، ئـــیفتیخار ئـــەکـــەم
عـەرزیان کـرد قـوربان، زووتـر سـا دێـرە
مـــاڵ بـــۆتوو فـــرەس، مـــناڵەکـــان بـێرە
ڕەواس وات: ئـــەرچـــی، گـرانـەن ئـەرکم
مـــــناڵەکـــــانتزوو، بـــنێرە تـــــەرکم
تـــوو خسوەت ئـــەزانـی کـارمان زەرروورە
بـــەڕو بـــەحر ئـــەکـەین ڕێگـەمان دوورە

ئـــەوەن بـــۆ خــــرووس، بـافی و ڕێـزانـی
تـــا ســـواری کـــرد، خـــوەی و خـــێزانـی
تەفەئول خەیری[1]، زانـی سـەفەر خـوەی
«ڕەواس» ڕاوباز، خوڕی لە «کـەر» خـوەی
کــەفت وە ئـەندێـە، بـۆ یـەك سۆراخـێ
تـــا ســـۆراغـــی کـــرد، لە یـــەك ئـێڵاخێ
«ڕێوی» وە یاران، وێش وات: وەی دەستوور
ڕای هاموون خـەیلێ، خـەتەرناکـەو دوور
مـــــەحز مــــوحافز، فـــتنەی شـــەب و ڕۆ
ســــەڵاحم ئــــێدەن، بـــدەرین وە کـــۆ
عــــەرز کــــەردن یــاران هـاین لە فـەرمانت
حــــازرین بـــنین ســـەر لە ڕێـــی گـیانت
«ڕێـــــوی» وە حــــیلەو حـــەواڵـــەی درۆ
فــــــرێویانی داو فـــــەوری دان وەکــــــۆ
تـــــا یـــــاوان وە پـــای، کـــەمەرو کـــاوێ
جـــا گــــەرتن لە پـــای، شـــیرین شـەتاوێ
ئەو شەو بێ خـەیاڵ، بـێ خـەم و خـەتەر
ویـــــاران وە شـــــاد،تــا وادەی ســـەحەر
ســــەحەر وە شـــنۆی، نسـیم وەرکـــاو
«ڕێـــوی» ڕاو دیسدە بـــێدار بـــی لە خـــاو
گـــــۆش مـــــەدا لە شـــاخ، فـــڕفاڕمەیۆ
قەسپە و قەهقەی «کەوك»، هەم «کەواڕ» مەیۆ

---

١- بەچاکی زانی.

عـــابای کـــردە بـــەر مـــێزەرەی بـــەستۆ
عـاسای عـەیاری خـوەی گـرتە دەسـتۆ
وتـــــی: وە «مـــــەلا»، هـــــەڵسە، نـــوێژە
ئـــــەزانـــــی شـــەوگار، چـــەنێ درێـــژە
عـــــیلم و عـــــالمیت، ئـــیمڕۆ بـنوێنە
بـــــانگ و ســـەلاتی، وە مـــەیل بـخوێنە
«کەڵەشێر» دای لە بـاڵ، قـوولانی وەمـەیل
«ڕێوی» مەواران، ئەسرینان چـون سـەیل
وتـــــــی: وە یـــــاران، وەخت تـــــاعەتە
تـــا کـــەی تـێر نـاخوەن، لەم ئـیسراحـەتە
«ڕێـــوی» واقـــانی، ســـەرسەوز قـــیڕانـی
«مـــامر» قـــرتانی، «جـــوجك» زیـــڕانـــی
«لەق لەق» وە مـــەولەق دەنـــووکی ڕەقـــان
ڕێزیان کـرد چـما[1]، شـەس‌تیریان تـەقان
کــــــردیان وە کـــــارێ، وە بـــێ تـــەحاشا
«کـــەو»و «کـــەواڕ» گشت، هـــاتە تـەماشا
«ڕێـوی» ڕوانـی، «کـەو» و «گـەوار» هـات
وتـــی وە یـــاران، گـــوڵ و بـــەهار هـــات
یەکـــەر ساکت بین، مەبهووت بوون و مات
داشـــان وە دیـــدار، «ژەرەژ»[2] سـەڵەوات
«ڕێـــــوی» ڕەوالا، وات: ئـــــەی فـــریشتە
پەنجەی پـا ڕەنگـین، خـاڵ خـودا ڕەشـتە

---

۱- وەکوو ئەوەی.

۲- کەو.

وا وانــــموو کــەرد حــاجی بــەرگەشتە
وتـــی: وە یــاران ئــەی جــا بــەهەشتە
خــوا فــریشتەی خــەیرش نــازڵ کــەرد
خــۆف و خــەیاڵات بــەدش باتڵ کــەرد
ســـەرومێزەرەی نــیا لە بــــەر پــێی
وتــی: فــریشتەی شــەریف وە خــەیر بــێی
خــوا فــریشتەی، چــون تــۆ نــوورینێ
سەوت و سەدا خــوەش، شێوە حــوورینێ
لە باغچەی بەهەشت، وا تــۆش ئــاراستەن
پــەی حــەج قــەبوولی، مــنت کــیاستەن
تــەشریف بــاوەرە، سەحەرخــێزی کــەین
شــاکــرین شــوکر، شەکــەرڕێزی کــەین
بـــە زەرافـــەتت، زەریـــف‌تر ئــەوین
وە شـــــەرافـــەتت، شــەریف‌تر ئــەوین
ئـــینکارت نـــەوێ لە بــەر ئــەمر حــەق
حــەق وە نــاحەق کــەر، مــەشۆ وە دۆزەق
وێت لادە لە شـــــەڕ، خــــەیرێ بــسوێنە
پــــەشیمانۆ بــــەو نــــوێژێ بــخوێنە
«ڕێــوی» وا ڕەگــی، خــاوی کــەوی گــرد
باڵی پێ شۆڕ کــرد، زوانــی بــەست و مــرد
وتـــی: حـــــازرم، مـــــنەت بــــارەنان
وێـــم و «گــەواڕ»م، خــزمەت کــارەنان
«خورووس» و«مورغ» و، «سەر سەوز» و «لەق لەق»
«کەو» چەنی «کەواڕ»، مولحەق بین وە حەق

«ڕێـوی» ئـارەزووی، ئـەما تـەواو بـوو
وە خـەیاڵ کـەواو، یـەکسـەر کـەواو بـوو
کـەفت وە پـەژارەی وەسـواسـەی بێشۆ
نە شـەو خـاوش بـیو نـە خـوەراك وە ڕۆ
تـا سـۆراغش کـەرد، لە وەر مـەغارێ
یـەك سـۆراخ تـەنگ، تـا نـادیارێ
وتـی: وە یـاران فـەسڵ زمسـانە
لازمـە بـۆمان لانـە و کـولانە
وا نـیشانیدا، حـاجی بـەرگەشتە
وتـی: وە یـاران، ئـەم جـا بـەهەشتە
ئـەر بـە ڕۆ سـەیران، کـۆو کـاو کـەریم
پەی وێمان ڕاحەت، بە شـەو خـاو کـەریم
مـەبادا وەریـم، بـەر بـە مـوشکڵێ
لەی جـاگـە خـاس‌تر، نـیەن مـەنزڵێ
جـا بـەی شـیرینیو ڕاگـە بـەی ڕاسـی
پەی کێ دەس مـەدۆ، لانـەی وەی خـاسی
وە غـارنشینی، کـەریم عـیبادەت
تـا بـوانـەمان، ئـەهل سـەعادەت
فـەقەت بـۆ ئـێمە، سـەختە یـەك پـلە
ئـەشێ بکـێشین، یـەکـێ یـەك چـلە
مـن وێـم لە قـاپی، مـەراقب مـەبووم
مـەراقب نـەبووم، مـەعاقب مـەبووم
چـون مـن مـەسئولم، لە ڕۆژ جـەزا
ئـەر یـەکـێ ئـێوە، بـدەرۆ سـزا

عـــەرز كـــەردن یـــاران، مـــەوافـــقەنان
مـــــــەوافـــق نـــەوین، مـــونافقەنان
وتـــیان: وە «مـــەلا»، ئـیستیخارە كـەر
ڕۆژ و مانگ و ساڵ، خـاس شـومارە كـەر
ڕۆژێ مـــــــوارەك، وە ئـــارەزۆی دڵ
تـــەعین بـــفەرموو، بـــچینە مـــەنزڵ
وات: ئـیمشەو جـومعەس، ئـەڵبەت غـاڵبە
بـۆ هـەر مـەتڵەبێ، هـەر كـەس تـاڵبە
فـــتوای «مـەلا» بـی وە دڵـخۆشی دڵ
وە دەســتەوجەمی گشت شـین وە مـەنزڵ
«ڕێـــوی» ڕوانـــی، كـەسێ نـەماگـە
شـوكر خـوداى كـرد، وا ڕزقـی داگـە
تـــا چـــوونە كـونا، «ڕێـوی» پـەلەپەل
وەك دز چـــالاك، خـوەی گـەیانە كـەل
مـورادی وە مـەیل، حـەق كـریا حـاسڵ
ئـــاواتـــی بـــڕیا و دەس مـاڵا لە دڵ
وتـی: وە «سەرسەوز»، سەوزە مێزەرەت
جە كام نەسەبی‌و، جـە كـۆن شـەجەرەت؟
وتـــی: ســـەییدم، خـــەتەرەم نـــیە
وەلێ نـــازانـــم، شـــەجەرەم چـــیە
وتـیان: وە «مـەلا»، ئـەم كـارە چـۆنە
فـــەرمایش ڕێـــویە، یـا قـەوڵ سـۆنە

«مـــەلا» فـــتوای دا، وە قـــەوڵ عـــەرەب
«لعــــــــنةالله داخــــــــل النسب»[1]

«ڕێـــوی» مـــووڵەتی نـــەدا وە نـــاقی
وتـــی: وە «لەق لەق»، بـــدەر شـــەلاقی

تا «سەرسەوز»ی خوارد، حاڵی خـراو بـوو
بووە «گـورگ» هـار، چـەشت کـەواو بـوو

خـــوری لە «لەقلەق»، حـــاجی بـەرگەشتە
وتـــی: چـــۆن ئـــێژی، جـــێگەم بەهەشتە

حاجی کەی واسە، ڕاتوڕووت[2] ئەکـەی
پرسیگمە قوڕواق، هەشت هەشت قووت ئەکەی

فـــرسەتی نـــەدا لەقلەقـــیشی هـــاڕد
گـــۆشتی کـــردە ئـاو پـێشەی کـردە ئـاڕد

خەتاب کەرد وە «کەوك»، کەی توو فرشتەی
پـــەنجەو پـا وە خـوون ئـیمامان ڕەشتەی

تـــۆ بـەد عـەشرەتی، قـەوم و بـرات گشت
بانگ ئەکەیت وە غەیر، خومت ئەیدەی وەکوشت

«مـــەلا» فـــتوای دا، وتـــی: ئـــەر واســـە
شەخس بەد عەشرەت، بـۆکـوشتن خـاسە

وەفـــتوای «مـــەلا»، «ڕێـــوی» کـەوی گـرد
دەرســـات لە مـــلۆ، پـــێسی دەرهـــاورد

پـــادارش گـــرتو مـــاڵ وێشـــەن بـــێپا
ڕێـــوی ڕەحـــەت بـــوو، حـــاڵی هـــاتە جـا

---

١- لەعنەتی خودا لەوکەسە بێ بە درۆ خۆی داخلی نەسەبێ دەکا.
٢- تالان.

فکری چـوووه لای، «جـووجه» شـوماردن
تا واگـەوره بـوون خـاس هـاتنه خـواردن
وتـــی: وه «مـــەلا»، کـەی ئـەمه دیـنه
ئــــەوێنم وه چـــاو، زنـــای مـوحسینه
تاریخ باس نـاکـا، دوو هـەزار سـاڵ پـێش
بـــرا کـــەرده بـۆ، زنـــای واڵـێی وێش
بـــراو خـــۆیشکن، له یـــەك مـامرن
خـەتای وا ئـەکـەن، یـەکـەر کـافرن
کـەی قـەبووڵ ئـەکـەم، ئـەم نـاحەساوه
کـەواویـان فـەرزه و خـواردن سـەواوه
وه فـتوای «مـەلا»، «ڕێـوی» خـواردیـانی
وه ســـەرو پـــێسۆ، تـەواو هـاڕدیانی
«مەلا» وه خەیاڵ، خوەی دی مـەعاف بـوو
تـا بـەینێ ڕێـوی، ئـەشتەهای سـاف بـوو
ڕێـــوی بـۆ ڕیـا، هــەر ئـان له زکـراو
وەلێ بـــۆ خـــواردن، مـەلا له فکـراو
خوەی کرده خـەفتگ، گـوێی لێ ئـەتەکـان
کـەڵەشێر هـەڵسا مـامرەکـەی شکـان
هــەرتا کــه له بـان، «مـامر» هـاته خـوار
تەپ تەپ دای لِه باڵ، قووڵانی یـەك جـار
«ڕێـــوی» ڕوانـــیو ســەری گـرته ڕاس
وتی: «مـامۆستا»، عـەجەو دەنگ و بـاس!؟
بەی‌تەور بـانگ وه لەش، جنوب مەوانـی
قـــەتڵت واجـــبه، مــــەر نـمەزانـــی

بەر خیلاف شەرع، عورف و عادەتە
کوشتنت غەزاس حەق شەهادەتە
بنج ریشی گرت، وەك چەتڵ قەزا
تاگرتی و خواردی، وە نیەت غەزا
«مامر» تەنیا کەفت، گریاو قەسپانی
«ڕێوی» چاپی کرد، ئازا چەسپانی
وتسی: ڕەقیبت[1]، پەیدا کردگە
یا شیوەن ئەکەی، جفتت مردگە
ئەونەتە دیگەو ئەونەتە داگە
ئەوەن گەڕیاگی، ئاوڕووت نەماگە
سەرت بتاشم سوارکەرتکەم
بۆ پەن دونیا شارەو دەرتکەم
بەرگەشتە حاجی بەتر کافر بوو
ساو دگانی داو سوار مامر بوو
«حاجی» سێ ڕەنگن، ئەگەر بیناسی
یەکێ وە بەدی دوان وە خاسی
وە ئیرادەی حەق، وە بانگ ڕەسووڵ
هەرکام چوونە حەج، قەبووڵەن قەبووڵ
نوور ئیمانی لێ زایەر ئەوێ
هەر خاسی و ڕاسی، لێ دایەر ئەوێ
هەرکامیان وە دەنگ «شەیتان» خەوەر بوو
حارس و حەریس، ڕەنجی بێوەر بوو

---

١- دۆس، چاودێر.

لە ڕاســـــی دوورو لە خـــــاسی وێـــــڵە
لە حـــەق بـەرگەشتە، شـووم و شـەڕکـێڵە
ئــەوێت وەو ڕێـــوی، شـــووم نــدامــەت
سەر ڕەفێق خوە خوەر خوە هەر سڵامەت
«ئــەحمەد» گــونای تـــوو نـــیە عـیلاجی
مەر وە ئـیرادەی حـەق، بـووی وە حـاجی



## دێهاتی و شاری[1]

ڕۆژێ یــەك نــەفەر، دێــهاتی هــەژار
کەڵەشێرێکی بـوو هـەڵی گـرت بـۆشار
قــەزا یـەك نـەفەر، شـاری گـەیی پـێی
وتی: بەخەیر بێی، خـاڵۆ خـەڵك کـوێی
خوەت هـاتی بـۆشار، یـا وتـیانە پـێت
یـا قـوێخای دێکـە، نـەویگە لە گـوێت
بەم ترك تـۆفـو هـەوای بـەرف دەی[2]
هــاتووی بــۆکــام، تــارفە یــا ڕەی؟
دێهاتی:
وتـــی: ڕەی چـــۆنە، ئــاغە پـــێم بـێژە
پـــانە، سێ‌سووچە، کـۆتاس، درێـژە؟

١- رەخنە، لە وەزعی هەڵبژاردنی نوێنەر بۆمەجلیس، لە حکوومەتی تاغووتی‌دا.
٢- بەفرانبار.

زەریــف نــازانــم، حــاڵیم کـه کـاکـه
خـوەراکـه یـا کـه، بـەرگ و پـۆشاکـه؟
پــێمی نــیشاندە، بــچم بـیوێنم
کــەڵەشێرەکــەم، بــدەم بـیسێنم
بــزانــم کـامیان، وە مــن مــەربووتە
مــناڵەکــانم، گشت قــووت و ڕووتـه

شاری:

شــاری وتــی پــێی، مــونعیم و گــدا
واجــبه ئــەشێ، ڕەی بـۆ خـوەی بـدا
وەکێڵ[1] مەعلووم کا، بۆ ناوی ئیجلاس
تــا له بــەدبەختی، بـمانکەن خـەلاس

دێهاتی:

وتــی: تــۆ خــودا، ئــەمە تــۆ ئێژی
کــۆتا پــێم بـێژە، نــەك وە درێــژی
کەی ئـەم فـریشتە، هـەڵساگـه له خـەو
ڕۆشــنی گـردگە، زوڵـم و تـاری شـەو
نــــەجاتمان بـــدا، لەم بــەدبەختی‌یە
لەم ئــاه و نــاڵە و لەم زام ســەختی‌یە
کــــارێ وا بــوێ، حــەتمی بـزانـه
نــیشانەی زهــوور، ئــاخر زەمــانه

شاری:

---

١- نوێنەر.

شـاری وتـی: پـێی کـاکـه چـەن سـاڵە
وەکێڵ تێ و ئەچێ، هـەروا بـەم حـاڵەم

دێهاتی:

وتــی: ئــەم کــارە، بــووە لەمـەوبەر
هــیچ نـەفعی نـەوگە، بـەغەیر لە زەرەر
وەکــیڵمان بــووگە زڵـمیچ بــاقیوگە
زۆردار بــۆ بــێزۆر، مــاقەماقیوگە[1]
هــەروا بــاقیوگە، زوڵــم وەك ســاڵان
زاڵــمان مــاڵمان ئــەوەن وە تــاڵان[2]
وەکــیلم بـۆ چــەس، زوڵــم بــمێنێ
هـەر ڕۆژ زاڵـم گـیان مـەزڵووم بسێنێ
تــوو خــوا بــڵانەم، وازم لێبـێرە
ســەد وەکـێڵ ئـەژیت، ئـەم کـەڵەشێرە
گــاهی[3] لە چــاهێ[4]، دەرم نـەیەرێ
کــەی بــۆمن ئــەبێ، وە کــەڵەشێری
هیچ نـیەن وە تـەنگ بـدەو بێرەکـەم[5]
دەس گشــتیان وە گـون کـەڵەشێرەکـەم



١- چاوە زاقە.
٢- چەپاو ـ غارەت.
٣-کاتێ ـ دەمێ.
٤- تەنگ و چەلەمەیە.
٥-موشکیلات ـ سەختی ژیان.

## وەتەن

هەرکەسێ کوردی، ئەسیل و ئەسڵە
گیانی لەگەڵ خاك، وەتەنیا وەسڵە
کوردی بەغیرەت، پاکیزە و پاکمان
گیان ئەدەین لە بان، ئاوو خاکمان
وەتەن بسۆئێمە، لە خەیر لەبڕێزە
سەنگی گەوهەرەو خاکی زەڕخێزە
نەشێ وا یەك دەس، بکەین دەسمان
بکەنین ڕیشەی، خار و خەسمان[1]
پشت وە پشت بدەین، یەکسەر پشتمان
حازر کەین بۆدەم دوژمن مشتمان
یەك ڕوو یەك ڕەنگی، وە یەك بنوێنین
دوژمن ئەر شێر وێت، پشتی بشکێنین
دیبای ئیحساسات، پاکی بپۆشین
وەهیچ قیمەتێ، وەتەن نەفرۆشین
بێن بکەن وەقەوڵ، قسەی فەرد من
چ کورچ کەنشاك، چ پیاگ و چ ژن
خوردو کەلانو ئیناس و زوکوور[2]
شاری و دێهاتی، نزیك یاله دوور

١- دڕك و داڵ و خرابە.
٢- ژن و پیاو.

عـــالم و عــەوام، بــوومی و وەتــەنی
«گەبر» و «یەهوود» و «تەرسا» و «ئەرمەنی»

دەس بدەین وە دەس، چون یـەك بـرادەر
نـــەوا وەتــــەن‌مان، کـــەفێتە خـــەتەر

ئەگەر وەتەن خواین[1] وەتەن مـام‌مانە[2]
هــۆی ســەر بـوڵەندی و یـاد و نـام‌مانە

دە س وە دە س، دە س مام، با بگرین وەدە س
دەس مامان نەدەین، وەدەست نـاکـەس

مــام بــدەین لە دەس، هـەتیم ئـەکـەفین
گـــۆشەیە نـــیە، تـــیایا بـــخەفین

خـــوا نـــەیەڕێتی، ئـــەو ڕۆژگــارە
گــەورە و بـچووکمان، ئـەکـەن بـێچارە

تـــا کـــەوتین وە دەس، بـــاوەپیارە
زلە و شـەق ئـەخوەین، سـوح تـا ئـێوارە

«ئەحمەد» وە «ئەحمەد»[3]، سوڵحی مەنزوورە
لە ئـایین و دیـن، جـەنگجۆیی دوورە

«اَللّه»! هـــەر کـەسێ، وەتـەن فـرۆشە
لە دونـــیا بــچێت، بــێ‌مایە و تــۆشە

پاس وەتەن نەکەین، خـوەلاسەی کـەلام،
بــێ‌قورب و شـــەرەف، ئـەکـەفینە دام



---

١- وەتەن خوازین.    ٢- دایك.
٣- مەبەست پێغەمبەری خۆشە ویستە.

# دێقان[1]

«میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم هۆنراوەیە بۆ ژیانی پڕ لە ئەستەم و زووخاوی جوتیاران و کرێکاران لە سەردەمی ڕابرووودا نووساوە.

بێچارە دێقان، بێچارە دێقان
بێجا نە هەر جا، بێچارە دێقان
بێ جاە و مەکان ئاوارە دێقان
جەرگ و دڵ و وڵك، سەد پارە دێقان
کوڕ تۆ چون زالوو، عوریانەن دێقان
سووختەو سیاو، بریانەن دێقان
لە کوڕ ئاغە سەر، سەرسامە دێقان
هەر ڕۆژە لیف و حەمامە دێقان
کوڕ تۆ لە بەر خوەر، بێمایە دێقان
کوڕ ئەو ملیۆنر لە سایە دێقان
مەدام کار ئەکەی، وە برسی دێقان
باز هەم ئەلەرزی و ئەترسی دێقان
مەبادا ئاغە ئیرادێ دێقان
بگرێ و بەرپا کا، فەسادێ دێقان
یەکسەر بۆ ئاغە، گەوهەری دێقان
بۆ خوەت سەر تا پا، زەرەری دێقان

---

١- جوتیار.

ئـارەق و خــوێنت مـەخڵووتە دێـقان
بــۆئاغە دانـــە و زمـــڕووتە دێـقان
بــێبەرگ و پـۆشاك، بـێخۆراك دێـقان
لوختو و پـاپەتی، سـینە چـاك دێـقان
هەر چێ ئـەدەی ڕەنـج، بـۆئاغە دێـقان
گشت ئـەوێتە گـەنج بـۆئاغە دێـقان
ژن تــۆ بــێ بــەهرەس لە دنـیا دێـقان
لچولێـــوڕەش، ڕەنگ ســـیا دێـقان
خـــانم ئـــاغە بـەو فـرمە دێـقان
هــیچ قــانع نــیە وە «تـرمە»[1] دێـقان
هــەر ڕۆژێ مــودێ ئـەپۆشێ دێـقان
شـــەربەت و شـــەراو، ئـەنۆشێ دێـقان
ســفید وە سـیما، چـون بـلوور دێـقان
ئـەهل مــاتیکەو[2] مــانیکووڕ دێـقان
ژن تــۆ هـەر خـەریك، سـەنێرە دێـقان
ئـەویچ وە بـرسی، کـەی تـێرە دێـقان
کـەنیشکت خــوار و خـــەفیفە دێـقان
حــەسرەتی و نــاشاد، زەعـیفە دێـقان
دەم وشكو لێـــوی پـــڕبارە دێـــقان
ڕووی پـڕ تـەم و غـەم، غـوبارە دێـقان
وەلێ کەنیشك خان، پڕ جەلاس دێـقان
لە سـەر تـا وە پـا، هـەر تـەلاس دێـقان

---

١- جۆرە پارچەیە قیمەتی.

٢- سووراوێکە کەژنان بەلێویان دا دەیمالن.

تـەوالت کـەردە چـڵ ڕەنگـە دێـقان

شـیرین و شـەکـیل قـەشەنگە دێـقان

لە زەحمەت و زەرع، لە کشـتت دێـقان

نـامێنێ پـوولێ، لە مشـتت دێـقان

مـالك وە کـۆڵەك ئـەوباشێ دێـقان

ئـەوەن نـاحەق بـۆت ئـەتاشێ دێـقان

خـوێنت بـۆ ئـاغە، شـەراوە دێـقان

ئـەینۆشێ و ئـێژێ، سـەواوە دێـقان

مالك[1] بۆت وەك گورگ، بن ماڵە دێقان

گۆشتت وەك مێ بـۆی، حـەڵاڵە دێـقان

حـوکم خـوەی وەتـۆ، ئـەنوێنێ دێـقان

گۆشت ئەخوا و پێشەت، ئەشکێنێ دێقان

تۆ هەر شەوکێشك، تـا سـەحەر دێـقان

ئەو ڕەحەت لە بان، تەخت فەنەر دێقان

وەك عەنتەر ئـەکـا، پـێت بـازی دێـقان

هـێمای هـەر نـیە، لێت ڕازی دێـقان

تۆ وەك شوانەکـەی، بـێ حـەقی دێـقان

هـەر ئـان دانـیشی پـڕ شـەقی دێـقان

مەگـەر تـۆ خـرسی، یـا حـۆڵی دێـقان

هەر ئان ئـەچی کـۆڵ، وە کـۆڵی دێـقان

عومرێ وە تەڵخی، نـیم نـەفەس دێـقان

بـەسەو کـافـە، بـۆهەر کـەس دێـقان

---

١- ئاغه و بەگو ـ خان و مالك هەموو یەك مەعنایان هەیە.

بـــەڵام بـــزانـــە وەم حـــاڵە دێـــقان
زاڵـــم ئـــاخری، زەواڵـــە[١] دێـــقان
ئەرچی بو «ئـەحمەد» سِـتەمە[٢] دێـقان
گـیان بـدا هـێمای، هـەر کـەمە دێـقان



## زارع بێهۆشین

زارع بـــێهۆشین، زارع بـــێهۆشین
زارعـین تـا کـەی مـەست و بێهۆشین
تا کەی جورعەی جام، خامۆشی نۆشین؟
تا کەی زوڵـم و زۆر، زاڵـم لە دۆشـین؟
تا کەی ناژنەفین، مـەگـەر بێگـۆشین؟
لەحـاف غـەفڵەت وە سـەر ئـەپۆشین؟
زوڵـم زەڵاڵـەت، چـەن ساڵ لەمـەوبەر
بـــاو بـــاپیرمان، بـــێرینە نـــەزەر
مەلاکەین وەك گـورگ زارع وەوە مـێش
هەر یەك لە یەك لا مـەکـێشا پـەی وێش
کۆت[٣] و خەلیلی[٤] و زەولانە[٥] و زەنجیر
ئـەو بگـرە و بکـوژ، تـوێڵاو دار و گـیر

---

١- نابودی ـ لەبەین چوون.
٢- زۆر سەختە.
٣- داری ئەستۆری قاچی زیندانی.
٤- زەنجیری قاچای زیندانی دەگەل کۆت دەگوترێ: (کۆت و خەلیلی).

پیاویان ئەڕمان، وە سێ و چـوار نـەفەر
یـەکـێ بـانپا، یـەکـێ بـان سـەر
ئـەیوت دەربـێرن، لیـباس لە بـەری
توێلا[٦] حازر کـەن، بـۆگـاهوسەری[٧]
تویلا یا «مازوو» یـا «وەن» یـا «بـەڕوو»
یا«گویژ» چـڵ چـڵ یـا تـەڕکێ تـەڕوو
بانگیان لێ ئەکرد، هـەر کـەس وەکـارە
حـاڵییان ئـەکـرد وەك خـۆێنەخوارە
وابـــدا لە پشت، کـــولۆك و ڕانـــی
شـــیر تـــلفی مـەزە، بـدا لە دانـــی
مـانگاو مـێ و بـزن، گـاو کـاوڕ و کـەر
ئەوە قولغ[٨] بـوو، لە دوای گـاهو سـەر
هەر سوح پەنێر و کەرێ و ماس و شـیر
واجب و فـــەرزو، لە گـــدا و فـەقیر
فەڕاش[٩] ئەیان سەند، وەقسەی تەق و لەق
ئـەر ئـەیوت نـیە، ئـەیانگرتە شـەق
هـەرکەس بـیوایـا، وە قـەدر حـاڵی
لە بـەڕ یـا گـڵیم، نـەوگ یـا قـاڵی
هـۆڕو شـۆلەکـە و گـورێس و تـەناف
نـــەیانوردایـــا، دوورو لە ئـینساف

---

٥- ئەلقەی گیر کراو لە ئەلقەی تر.
٦- دار.
٧- لێدان و کوشتن.
٨- باج، جریمە.
٩- پیاوی خان.

گـــدا و دەوڵـــەمەن، وە هـــەر ئـــەنازە
ئـــــەر بـــــیکردایـــا، لیـــباسێ تـــازە
خـــــان بـــیدیایە، فـــەوری لە بـــەری
ئـــەیدا بـــیکەنن، بـــۆیەك نـــۆكـــەری
تـــــانجیێ خــــێرا گـــەماڵێ قـــۆچاخ
کـــەڵەشێرێ لاری یـــا مـــامرێ چـــاخ
بـــیانزانـــیایە هـــین كـــێس هـالەكـوێ
مـــەئموور تـــاینوو فـــەوری دێوەدێ
ئـــەیوت وە مـــەئموور زوو بـــچۆدێرە
هـــەر چـــواری وە زۆر بســـێنەو بـــێرە
تـــانجی بـــۆ شكـــار گـەماڵ بـۆ پـاسە
مـــامرو كـــەڵەشێر بـــۆ ئـــێمە خـــاسە
هەر ژنە ڕایەتێ خـاس خـوەشگڵ وایـا
وەو شـــەرتە ئـــاغە ئـەوی وە دڵ وایـا
ئـــــەیوت وە خـــــانم بـــنێرە شـــوێنی
واجــــــبە ئـــــەشێ بـــێت و بـــیوێنی
نـــــەیان ئـــەپرسی لە قـــوبح و قـــەبیح
شـــا پـــەڕیان تـــێژوو بـــۆ فـــێعلی شـــەنیح
چیخێ بـۆ چـاتۆڵ، جـلێ بـۆ جـەواڵ
كـــافی و بـــوایـــا، پـــڵاسێ بـــۆ مـــاڵ
گـــەنم خـــۆ هـــەر نـــەو زەڕات مـــەحاڵوو
نـــــان دایـــمی، یـــا جـــۆ یـــا گـــاڵوو
یـــــەكودوو نـــــیەن مـــالك خـــراوون
نـــیسبەت وە دێـقان گشت نـاحەساوون

وەزع زارعـــین، ئـــەو ڕۆ خــــراو بـــوو
جوتیار بـێچارە، جـەرگی کـەواو بـوو
مەخسووس مالکین کـوردستانی گشت
چون دانەی عەدەس بێ بەرو بـێ پشت
دنـیا وە یـەک لا، ئـەوان یـەک تـەرەف
مەشهوورە حوکم «نە مروود»ی «ئاسەف»
ئـــا گـــرواران و مـــەحاڵ وە مـــەحاڵ
خوێن دڵیان ئەخوارد، هەریەك وەیەك حـاڵ
مـــالك پـــیاوانـــی، ئـــەنارد وە پـــایز
وە لەفـز شـیرین، شـەهد شـەکـەر ڕیـز
بەم جۆرە دەستوور، ئەدان وە ڕایەت[1]
زراعـــەت بکـــەن، فـــرەی بـــێ غایەت
بکـــێڵن تـــا پـــای، گـــاتان کـــار ئـەکـا
ئـــەتانکا بـە مـاڵ، قـەرزتان بـار ئـەکـا
ئـــەیوت: ئـــەزانـــن، لە نـــەفع چـــۆنەر
هەم پارەی هەیە، هـەم قـەن و شـەکـەر
وە شەرتێ حەفت هێش، بـدەن لەزەوی
نـــــەمێنێ تـــــێدا، بـــــڕو بـــــتەوی
ئـــەمە دەســـتووریە، ئـەرلوڕێ یـا لەك
چۆنەر ئەبێ گشت، تاك بێت و تەك تەك
ئـــەر قـــەسد قـــەولم، بکـــەن عـــەمەڵی
کـــار بکـەن وە مـــەیل، نـەکـەن تـەمەڵی

---

١- جوتیارانی لادێ.

نە پڕ، نە تەنگ، وا وە ئوسووڵ بێ
وا نەکەن قەوری چۆنەری قووڵ بێ

دەس ئاخر هەستان ماڵێ دەخەروار
ئەگەر وانەبوو، منم خەتاکار

لە ئاخر حەساو تەسفیەی چۆنەر
چ خەیری نەوگە و شەڕ تا بان سەر

وەزع زارع و کاریگەر یەك سەر
بەیان ناکرێ، چۆنوو لە مەوبەر

نە ساحێب گیان و نە هین مناڵ بوون
نە خاوەن رەئی[1] و ئیدارەی ماڵ بوون

بەدبەختی ئەو وەخت، بەیان کەم، هەر تەرز
ئەبێت وە داستان، یەك مەسنەوی بەرز



---

١- نەزەر.

# جەنگ و سوڵح

جەنگ و سوڵح دوو ڕای هات و نەهاتەن
سوڵح ڕای حەیات و جەنگ ڕای مەماتەن
سوڵح سەرمایەی شادی و نشاتەن
جەنگ تاریکەی تار، زوڵم و زوڵماتەن
غونچەی هەر بەهار سوڵح و شادیەن
هەر شادی سەفاش لە ئازادیەن
جەنگ جەهرو قەهرو فەقر و نفاقەن
سوڵح ئحیای عیشق و زەوق و مەزاقەن
جەنگ دەرد و ئەلەم، ڕەنجووری و ڕەنجەن
سوڵح وە سەراحەت گەنجووری گەنجەن
جەنگ وەك جەهەنەم دنیای ڕەوشەنەن
هەرئان سوڵح بەهار گوڵ و گوڵشەنەن
جەنگ سیایی شەو، تاریکەی تارەن
وەلێ سوبح سوڵح سەفاش سەد تارەن
زمستان جەنگ، وەروش[1] قەهارەن
نەوبەهار سوڵح، گوڵشەن وە بارەن
جەنگ لە خودخوایی و جاتەڵەبی یەن
جەنگجۆیی جانی، لە جەڵەبی یەن

---

١- بەفری.

ئوستاد نەخشەی جەنگ، ئەوەن ناشییەن
ئەوەڵ فەرق خوەی، موتەڵاشییەن
جەنگ کەی ئیختیلات، شۆخی و بازییەن
جەنگ تۆپ و تیر و بووم ئەندازییەن
جەنگ قەحتی و مەرەز خوشکەسالییەن
جەنگ ئەهریمەنی و بەد خەساڵییەن
تۆفان تەرزەی جەنگ هەر شەدیدەن
سوڵح ئستواری دژ جەمشیدەن
سوڵح ئارامش و جان جەهانەن
جەهان وە بێسوڵح، کەی ساحێب جانەن
جەنگ خیلاف عورف و دین و ئایینەن
موخالیف سوڵح جەهان خائینەن
فەزای سوڵح سەفای بەینەلملەلەن
بنەوای بەنای جەنگ هەر خەلەلەن
جەنگ وەك جەهەننەم، سزای دۆزەقەن
مەنافع جەنگ، چوماق و شەقەن
بۆی نەسیم سوڵح، ڕەوزەی بەهەشتەن
کشت سەحرای سوڵح گوڵ و گوڵگەشتەن
جادووی جەنگ ئەر نەی، نەیرەنگ بنوازۆ
جاوید لە جەهان، یەکێ نمازۆ
مەسجدو دەیر و کلیسا و کنشت
چ پیر و چ جوان، چ زیبا و چ زشت

بــــۆ نــموونە کــەس، کــەسێ نــاوێنێ
ئــەزانــێ[1] بــۆ فــەرز یـەزدان بـخوێنێ
ئــــاتەش ســــووزان، جــەنگ جــەهانی
ڕۆشـــــن بــۆ دونــیا، مــەکــەرۆ فــانی
بــووم شــووم جـەنگ، ئـەگـەر بـخوێنێ
غــاڵب و مــەغلوب هــیچ کــام نــامێنێ
کــاوو کــەشوو کــۆو هـەردەو بـیدو دەر
یــەختەسار مــەبۆ، چــون ڕۆژ مـەحشەر
نــە کشت و نــە زەرع، نــە گـوڵزار مـەبۆ
بــــوڵبوڵان لە گــوڵ، گشت بــێزار مــەبۆ
نــە بــاغ نـە بـوسـتان نـە گـوڵزار نـە گـوڵ
زاغــان مــەوانــان لە جــاگــەی بـوڵبوڵ
کــاخان گــرد داغــان، بێ ڕەونەق مـەبۆ
تــاقـان چــون تـاق، کـیسرا شـەق مـەبۆ
نــە عــیلم و دانش نــە دەرس و تــەعلیم
نــامێنێ ئــوستاد لە ڕووی حـەفت ئـقلیم
پــــێشەوایــان گشت بــێ پــێشە مــەبو
پـێشەی گشت مــەقتووع وە تـێشە مـەبۆ
ســەرتاسەر ســینەی، دونــیا چــاك مـەبۆ
شــــاران وە شکـــــڵ تــلە خــاك مــەبۆ
فـــــەتح و شکســــتی تــــاقی نــــمەبۆ
وە تــــاقێ جــــەهان، بــــاقی نــــمەبۆ

---

١- بانگی نوێژ.

عــەقڵ و کــەماڵ و هــۆش و فـەراسـەت
کـــیمیای تـــەدبیر، عــیلم ســیاسەت
یــەك سەر لە لەوحــەی هـەستی پـاك مـەبۆ
چـــەن ئــارەزووها، وا بــە خــاك مــەبۆ
پشت قـــارەمان، دونـــیا تـــا مـــەبۆ
دەست ئـــارەزووی دی[1] کــوتا مــەبۆ
فـــەرد فـــەرزەنان گشت هـــەلاك مـــەبۆ
قـــەلب مــوحەبەت پــدەر چــاك مــەبۆ
تـــڵفان وە تــوفەیل، دەوای دەرد مـــەبۆ
لە ئــاغۆش گــەرم مــادەر ســەرد مــەبۆ
جـــەنگجۆیی شـــێوەی دێــوساریيەن
خـــەیاڵ بـــاتڵ بـــادەی هــاریيەن
هــەرکەس بـنۆشۆ، چـون «هـیتلەر» مـەبۆ
لە هــەر دوو دنــیا، ڕەنــج بـێوەر مــەبۆ
انشـــاالله هـــەرکەس ئــەر جـەنگجۆ مـەبۆ
ئــاخر چــون «هــیتلەر» ڕەنـجەڕۆ مـەبۆ
«ئەحمەد» تا ئەبەد، ســوڵحش مـەنزوورەن
لە ئــاین و دیــن، جــەنگ‌جۆیی دوورەن



---

١- ئیتر.

# ڕەفیقی ناکەس

کـــەردەم هـــەوسێ، کـــەردم هـــەوەسێ
هـــانا هـــامسەران، کـــەردم هـــەوەسێ
وەســـواســـەی خـــەیاڵ، فـــراوان بـــەسێ
وستەم وە تـــۆڕ دام، عـــەجەو نـــاکـــەسێ
من کە ناکەس بیم، وا تۆم کەرد وە کەس
ناکـــەسێ چـــون تـــۆ، بـــەرنەدام لە دەس
ڕەفێقی ناکەس، چون تاشای[1] سەنگەن
دۆســـی نـــەدارۆ، دایـــم هـــەر جـــەنگەن
ناکەس وێنەی گوڵ، وێش مەدۆ نـیشان
هەر کەس بۆش کـەرۆ، مـەبۆ پـەشیمان
وە زاهێر چون گوڵ، ئەر چەنیت یـارەن
وەلێ بـــــزانـــــە وە بـــــاتن خـــــارەن
هـــیچ گـــوڵت نـیەن، مـەبۆ بـە خـارت
بـــارت مـــەکـەرۆ، وێشـەن سـەربارت
ساکەسێ چون من، ئەگـەر خـام نـەبۆ
نـــەفام و نـــادان نـــاتەمام نـــەبۆ
چـــەنی نـــاکـــەسان نـــەدارۆ بـەینەت
وێش وە دەست وێش، نمەدۆ[2] مەینەت

١- تراشین.
٢- نادا.

ڕەفێقی ناکەس مەکەر، زینهارەن[1]
ڕەفێقی ناکەس، چون بازی مارەن

سەد ساڵ ناکەسێ بگێری وە دۆش[2]
هەر ئان بنیەری،[3] کەردەن فەرامۆش

ڕەفیقی ناکەس، مەکەر بەتاڵەن
وە زاهێر شیرین، وە باتن تاڵەن

ئەر ڕیشەی ناکەس، بەر ئاری وە بەر
بشۆریش وە ئاو، سەرچەشمەی کەوسەر

وە «ماءً طَهور»[4]، جۆی شیر و شەکەر
بماڵی تاڵێش، نمەشۆ لە وەر

نەگەرمی لە یەخ، نە سەردی ئاتەش
نەکس لە ناکس، نە سوون وە بۆی خوش

نسەویەن نمەبۆ، هیچ کەس نەدیدەن
ناکەسان وە کەس، کەردەن بەعیدەن

«ئەحمەد»! عومر وێت، سەرف کەسان کەر
دی بەس پەی ناکەس، وێت هەراسان کەر



١- ئامان. هرگیز.
٢- كۆڵ.
٣- داینێی.
٤- ئاوی پاك.

## گلەگی باوك لە فەرزەن

دارا شـەرف بـای، دارا شـەرەف بـای
ڕۆڵـەی عـەزیزم دارا شـەرەف بـای
پەروەردەی «ڕەزا» و «شاەنەجەف» بای
قـەڵەم زنـدەگـی، دایـم لە کـەف بـای
ڕۆڵـە تـووڵێ بـیت، بـێبەرگ و ڕیشـە
دەس نیشان من بـیت، لە سـەحن بـیشە
وە ئـاو دیـدە، وە خـوێن جگـەر
پسـەروەردە کـریای، هـاتیتە سـەمەر
ئـەرشەد ئـەولاد ڕۆڵـەی خـاسم بـیت
تەنیا تـو فـەقەت، دیـدەی ڕاسـم بـیت
واتـم: ئـەڵبەتە، فـریادڕەسم بـیت
بۆ وەخت پـیری، ئـاسای دەسـم بـیت
نـەزانـام وە چـاو، ڕاسـی نـاموێنی
وە ئـاسام نـاوی، پـایچم ئـەشکێنی
ڕاسە مـن پـدەر[1]، جـەفاکـێشت بـیم
خاستر لە دایکت، کەی نازکێشت بـیم؟
هەر شـەو نـەئەخەفت، تـا وە بـەربەیان
ئەر مەواتی ئـای، ئـەو مـەواتش گـیان!

---

١- باوك.

لە پای گاوارەت[1]، هەر شەو تا بە ڕۆ
لایە لایەش بی، ڕۆڵە، پەرێ تۆ

وە مێهر و مۆبەت[2]، ئەو مەدا شیرت
ئەو شیرینی شیر، چۆن شی[3] لە بیرت

گاهێ لە ئاغۆش، گا لە دۆشم بیت
کەی ئانێ ڕۆڵە، فەرامۆشم بیت

جەفامان بێسوود، ڕەنجمان وە عەبەس
ڕەنجت بۆئێمەو گەنجت بۆ ناکەس

تۆم نیا وە مەکتەب، تا خاس بزانی
بخوێنی وە دەرس، عیلم ئینسانی

نەزانام[4] لە عیلم ئاداب دوور ئەویت
هەر چەند بخوێنی، بێشعوور ئەویت

حەیفە ڕۆڵە گیان، هەر لە ڕووی هەوەس
باوك و دایك خوەت، بەر بدەی لە دەس

ئایە و ئەمر حەق، کەردی فەرامۆش
ئەمر عولەمات، نیاوان وە گۆش[5]

ئەمر خوداوەن، ڕەزای پەیغەمبەر
بەستەس وە ڕەزای، پدەر و مادەر

سەختە ئەر لە خۆف، خودا نەترسی
جار جار هەواڵێ، لێمان نەپرسی

---

١- پێشکە.
٢- خۆشە ویستی.
٣- ڕۆیشت.
٤- نەمزانی.
٥-گوێ.

هـیچ مـەنات[1] نـاکـەم، لەم ڕۆژگـاره
هەرگـوڵ وه نـەوعێ، مـوبتەڵای خـاره
دەســـەڵات نـیەن، شــەریکت کــۆتە
شوکر ئەکـەم، هـێما[2] یـە تـان و پـۆتە
یا خوا هەرخوەش بای، ئەرچی بێ مەیل بای
نەك وێنەی ئێمە، لە خەمان کـەیل بـای
لەمـــــــە زیـــاتر، بـــێ ئینسافی یە
بـــێ کـــەفایەتیت ڕۆڵـــە کـافی یە



١- لۆمە.
٢- هێشتا.

## شەهید

بــەنام ئـەوکەس، کـەسە بـۆ بێ‌کـەس
بـــالآدەس ئــەو، نــیەن دەس کـــەس
لە ئایەی چوار سوورەی «مـوحەممەد»
بـــــــەشارەتش‌دان «اَللّٰه الصَّـــــمَدْ»
هەرکەسێ بـدا، گـیان لە ڕاگـەی حـەق
وە بـەر حـەق خـودا، بـناسێ وە حـەق
ڕۆحـــی لە عـەزاب، قـەیامەت دوورەن
ماوای بـەهەشتەن، هـاودەمی حـوورەن
حــەققی شــەهیدە، «جـــنّات النَّعیم»
مـــوتابق ئـــایەی، «قـــرآن کـــریم»
خــودا خــوەی دانـــاو بـــیناو عـەلیمە
کـــوفار ســـزاوار، نـــار جـــەحیمە
مـــوجاهید ئـــیسلام، دارا ئــومیدەن
یـــا غـــەزا ئــەکەن، یـا کـە شـەهیدەن
موفتەخەر وە لوتـف، حـەیی ئـەکبەرن
مـوستەفیز وە فـەیز، ساقی کـەوسەرن
شــــەهید مــەقامی، ئــەعلاو شــەریفە
دارای شــــەرافــەت، دیــن حـــەنیفە
شــەهید لە تــەبار پــاك پــەیغەمبەرەن
ســالار ســەربەرز، ڕۆژ مــەحشەرەن

شـــەهیدان وە خــوێن ســورخ یـاقووتی
شکست دان وە جـەبر زوڵـم تـاغووتی
ئەڵبەت بۆ ئیسلام، نەك هـەواو هـەوەس
چەن شەهید عەزیز، گـیانیان دا لە دەس
شەربەت شەهادەت، وە جوانی نـۆشان
چـــەم لە زنـــدگی، دنـیایی پـۆشان
بـەرگ غــەزایـی، وە بـەر کـەردشان
تـا وە شـەهادەت، تـەشریف بـەردشان
تـــائیسلام واقــع دارا وجـــوود کـــەن
کـوفرو کـافری یـەکسـەر نـابوود کـەن
وە ئــومێد دیـــن جـــۆشان خـورۆشان
دونـیا وە پـەرچـەم ئـیسلامی پـۆشان
بـــوزرگەن لە لای، حـــەق مـــەقامشان
تـــا مـەحشەر تـازەن، خـوێن زامشـان
شیرین بی وە شـەهد، ئـەجەل کـامشان
ســەبتەن لە تـــاریخ ئــیسلام نـــامشان
جـای غـەم و ئـەندووە، نـیەن مـوتلەقا
شـــاد بـــین وە بـەهەشت، لە «دارالبـقا»
ڕێگـەی خـوێنینی، شـوهەدای ئـیسلام
ئــیدامــە بــدەین، خـوەلاسەی کـەلام

★ ★ ★

## پیری و جوانی[١]

تـۆڕ دام پـیری، لە سـەر تـا دامـان
هەر ئـان ئـامادەس، پـەی نـەوجوانـان
ئـەو بـاڵای عـەرعەر، نـەونەمامەی نـۆ
خـەم مـەدۆ مـەبۆ وێـنەی سـیاچۆ
ئەو دەسەی زڵفان، خەیاتەی خـام تـاو
مـەبۆ وە ڕەیـحان پـەژموردەی بیّ‌ئاو
ئەو چـەتر نـیم پـاچ، پـرچ تـاوس تـار
بـیّ‌زینەت مـەبۆ، وێـنەی پـۆی دەوار
ئـایەنەی تـەوێڵ سـیمای سـفیدکار
مـەبۆ جـە تـاوشت، پـیری لەکـەدار
ئـی زەڕەو خـەندە و گـوفتار و قسـە
مـەبۆ وە خـەفەت، پـەژارە و غـوسە
ئـەو قـەوس قـەتران، ئـەبرۆی کـەمانی
نـمەدۆ شـەوکەت، شـێوەی جـەوانی
ئـی‌نوتق و ئـیخلاق عـیشوە و ئـیشارە
ئـی ئـیفادەی نـاز، کـرشمە و لارە
مەبۆ وە قوفە و قرخە و لرخە و جەخت
هەناسەو نەفەس، پژمە و سەور سەخت

١- هۆنەر ئەم هۆنراوەیە لە تەمانی بیست و دوو ساڵەداگوتوە.

ئی یومن و نگین، ئی ئیقباڵ و بەخت
پیری مەسانۆ،[١] لێش تەوانای وەخت

ئەو چەم چون سوەیل، پرشنگ مەشانۆ
شەوق لە ستارەی، شەفەق مەستانۆ

مەبۆ وە گردووی شکستەی بێ‌ناو
جە ڕێش پیری، مەیۆ لێش زووخاو

قامەت قونگ و قاخ، قەوس وە پشت مەبۆ
بێ قەدر ژ لای یاران زشت مەبۆ

حاشیەی گۆشەی چەمان چرچ مەبۆ
بینی تەق و ڕەق، قرخ و قرچ مەبۆ

ئەو جیلوەی جەماڵ، چون جەلای قەمەر
مەبۆ وە پاڎەم[٢]، کوورەی ئاسنگەر

زێبای ڕەنگ و ڕوو، وە دەواس مەبۆ
سافی سوورەت زوور، وە پلاس مەبۆ

ئەو لێوە چون لاڵ لەعل ڕومانی
زەهرش کەرد نە جام، نۆشاش وە جانی

ماجەرای پیری، بەی تەورە بێ‌شۆن
مەبۆ وە زێوار، بانەی کەوشە کۆن

ئەو خاڵە ماچی[٣]، پیرۆزەی پاکەن
چەن کەس جە تاسەی، بۆسەش هیلاکەن

مەبۆ وە فلفڵ، تای جامەی عەتار
نمەیۆ وە عەین، ئەسڵ خریدار

---

١- نەبینێ، وەری دەگرێ، نەیباتەوە.
٢- هەوانەی ئاسنگەر.
٣- نەڵێی. وەکوو.

سیمای زەنەقدان[١]، ماچی کۆی سیمەن
خــاڵ وەك پــیرۆزە، پــێشۆ موقیمەن
نــمەدۆ جــیلوە و جــەلاّی جــایەڵی[٢]
مــەبۆ وە هــەنار، پــیر مــەکــایەڵی[٣]
بــەیازەی بــەیزای، بــلووری گــەردەن
عاشقان جەداخ، زەردیش ڕەنگ زەردەن
مەبۆ وێنەی بەند، کودووی[٤] کەفتەی هەرد
قرچ و کرچ و چرچ، ئافات زەدەی دەرد
بریقەی یەقەی، سوخمەو سینە و مــەم
مەر شەوق شەفەق، بەیزای سوبحدەم
مەبۆ وە ڕووی سەنگ، پاشۆرگەی حەمام
بێ‌زینەت مــەبۆ، لە لای خــاس و عــام
ئــەکســیری دانــەی، خــاڵ خــاڵداران
قــــەساس قــــاتڵ خــــوێنی هــــەزاران
مــەگــیلێۆ جــە ڕەنگ بێ‌ڕەونەق مــەبۆ
ســـینە تـــەق‌وڕەق مــەمکە چــەق مــەبۆ
نــامێنێ شــەفاف، نــی شــێوە و پــەرداخ
مــەر هــەر بکــێشین، بــۆ جــوانــی ئــاخ
تەپڵ پۆس گۆش، نــم مــەکــێشۆو کــەڕ
دی[٥] نیە وە تەنگ، قسەی خەیر و شەڕ

---

١- چناکە. ٢- تافی گەنجی‌و لاوی.
٣- هەناری بچووك و سیـیاگ لە ناوچەی پیرمەکایەڵ.
٤-کوولەکە. ٥- ئیتر.

لێــڵ مــەبۆ مــیناى، بــینایی چەمان
نــیشان مــەدەرۆ، یــەکــێ وە دووان
مــوبتەڵا وە دەرد، بــێ‌عیلاج ئــەوین
لە بــــازاڕەدا، نــــاڕەواج ئـــەوین
کــاڵای ئــاڵامان، نــاسێنن وە موفت
سەودای جوانی و پیری نــاوێ جــوفت
جوانی چــون گــوڵ، لێمان خــار مەبۆ
جــــوانــان لێــمان، دی بــێزار مــەبۆ
فەهم و فەراســەت، قســەی ئــەکسیری
نیەن چون جاران، پەی کەس تــەئــیری
جــوانــی بــەهار، زمســـان پــیری‌یەن
وەی لەی بــەدبەختی، دامــانگیری‌یەن
جــوانــی و بــەهار، هــەر دوو دەمێوەن
هــەردوو گــرفتار، ڕشــتەی غــەمێوەن
مــــەبۆ بــنیشن، هــەر وەو دڵگــیری
بــەهار بــۆ پــاییز جــوانــی بــۆ پــیری
گوڵەکەی جوانی و خەزانــەکــەی دەرد
هــەرکاتێ زانــای پــیریش ســەر ئــاوەرد
مەستانۆ قوەی، هەر دوو شان جە دەس
کەم کەم مەکێشۆ پاش نە ڕا ئــەو پــەس
جە مەحزوونی حــاڵ، مــات و زویــری
ئــەر ئــەسەر کــەرۆ، نیــشانەی پــیری

مەنیشین غـەمگین، سـەبا[1] و ئـێواران
دەس لە زرانـــی[2]، لە پـــای دیـــواران
هەر ئاخ ئەکـێشین، چـەم وە ئـەسرەوە
قەزای زوهر ئەوەین، وە لای عـەسرەوە
بـــاز جـــوانـــی، بـــەربشۆ لە دەس
وەقووقووی قووشچی[3]، نمەیۆ وە پەس
هـــیچ کـەس نـەنازۆ بـە جـوانـی وێش
عـــومر بـــۆ پـــلەی پـیری هـا لە ڕێش
«ئەحمەد» وەی دنیا، خاتر مەکەر شـاد
پیرمەوی و مـەشۆ، جـوانـیت جـە یـاد



١- سوح ـ بەربەیان.
٢- زەنگۆل.
٣- بازەوان.

## بەسەرهاتی قەڵای ڕۆخاو[1]

کــــاکــە ســڵامم، کــاکــە ســڵامم
کـاکـە قـەبووڵ کـەر، عـەرز و سـڵامم
ئــەر چـــی شــایستە نــیەن کــەلامم
هــام پــایەت نسیەن پــایەو مــەقامم
ناشیم و نـەپوخت هـیمای هـەر خـامم
لە خـــوەم خـــامترە خـــامی کــەلامم
چــەنی ئـەی دڵـەی، پـڕپەژارەی وێـم
وە پــــەژارەوە، هــەزار پــارەی وێــم
مـەکـەردم ڕازان، جـە بـەدبەختی وێـم
جە بەدبەختی بەخت، جە زام سەختی وێم
پاسە[2] مەزانام، وە خـەیاڵ چـون وێـم
لە دنـیا نـیەن، بـێ‌ئیقباڵ چـون وێـم
واتـــم: کـاش ئـەزەڵ، نـەویام لە مـادەر
نەکەفتایم وە گێج، دەریـای دەردیســەر
یــام وە مــناڵی، پــەی وێـم بـمەردام
سەر وە تۆی مەینەت، دونـیا نـەوەردام
فــەڵەك وەی تــەورە، ســزا بــدۆ پـێم
هــەر ڕۆژێ کــۆسێ، بـاوەرۆ وە ڕێـم

---

١- ئەم شێعرەی بۆ شاعێری پایە بەرزی «دوو چیا»سەر بە شاری کرماشان «سەیفوڵڵا یەعقوبی» نووسیوە و شایانی باسەکە بە هۆی دۆسایەتی زۆرەوە، بە «کاکە» نێوی بردووە.

٢- وامدەزانی.

وە جەخت پەیدا بی، هام بەختێ چون وێم
لە وێم بەدبەخت‌تر، زام سەختێ چون وێم
ڕەنمایيم کەرد، وە یەك قەڵایە
چوار قاپی بەستەو، پڕلە بەڵایە
کاکە قەڵایە، کاکە قەڵایە
ڕاگەم[1] کەفت وەپای، عەجەو قەڵایە
چوار قاپی بەستەو، پڕلە بەڵایە
هیچ نەمابوو لێش، جیلوە و جەڵایە
بێ‌سەروسەدا و ڕەنگ و ڕەونەقێ
بەردە بی هەرلا، دیوارش شەقێ
مەواتی زیندان، بێ‌زینەتێ بی
خراوەی خاپوور، بێ‌قیمەتێ بی
باوەقوش لە ڕووش، لانە بەستە بی
دەر و پەیکەرش، گشت شکستە بی
لە جاگەی سەدای، تارو تەموورش
گۆشش کەڕ مەکەرد، زیوەی زەموورش[2]
لانەی سیرەمۆز، زەردەواڵە بی
باعیس ئەزیەت، ئەو مەحاڵە[3] بی
بەغەیر لە زوڵمەت، نووری نەدارۆ
هەر غەمەن وە ڕووی، غەمدا مەوارۆ
مات و تەم‌ئەنگێز، پڕلە دوود غەم
مەواتی شادی، نەدیەنش وە چەم

---

١- ڕێگەم.
٢- زردە والە، هەنگە ژاڵە.
٣- ناوچە.

خـــراوەی خــاپوور، کــاول کــەلاوە
تــاقش شــەق بــەردە، لە هــەزار لاوە
تــاق بـێ‌نوتاق[١]، دیـواخـان بـێ‌نوور
تــارمە تــاریك، تــالار دەیــجوور[٢]
تـــا دیــم دێــویام[٣] تــەواســامەوە
وا بــــیم ســــەر لە پــا، نــەناسامەوە
تەکـم دا وە تـەك، دەروازەی بـەستەش
پەرسام لێش ئەحوال، پەشێوی جەستەش
واتم: ئەی قەڵای، خـوار خـاتر تـەنگ!
کەلاوەی کـاول، وێـرانـەی بـەد ڕەنگ!
یە پەی چی وەی‌تەور، پەرێشان جەستەی؟
دەروازەی، شادی لە ڕووی وێت بەستەی؟
بـــوومە[٤] پــاسەوان، ســەرپاسارتەن
عــەنکەبووت وە تــار، پــەردەدارتـەن
حەوش و حەیاتت، بێ موستەحفزەن[٥]
چاڵ و چۆڵ چمان، مـەکـۆگـای دزەن
قــەڵا لە جـواو، مـن‌دا بـەی دەسـتوور
واتش: ئەی ئەبلەی، دێوانەی مـەغروور
ئــاخر هــەر هــەستی، نـیستی‌یە دارۆ
هـــەر بـــوڵەندی‌یە، پــەستی‌یە دارۆ

١- قسە کەر.
٢- تاریك.
٣- شێت بووم ـ لەخۆم چووم.
٤- باوە قوش ـ کوندە بۆ.
٥- چاو دێر.

تـــلە خـــاکـــێ‌بیم، بـــێ‌زیبا و زینەت
خوەڵ‌کەوانــێ بیم، بێ‌قەدر و قـیمەت
ڕای ڕان و گاگەل، پـاشێل خـەڵك بیم
خراوەو خاپوور، خام و بێ‌کـەڵك بیم
شـــەخسێ شـــایستە، بـێ‌لەی مـەحاڵە
ئــــاوەرد وەبــــانم، عــەمەڵە و فـــاڵە
فەرمان دا وە بێڵ قوڵنگە[1]و خـاکـەناز
چـــوار شـــەقم کـردن، مـیزان وە ئـەناز
ڕەمـــەق دا وە پـیم بـــەردش ڕەونـەقم
شەقم کرد وەی جۆر وا کـەردەن شـەقم
ئــاوەردش پـەرێم، عـەجەو مـێعمارێ
مــێعمارێ تـــەڕدەس، لە کـار تـەیارێ
نەخشەی وا کێشا، تەختەم تەختە کـەرد
هەر تەختەم وە چەن، هەزار لەختە کەرد
خاکم کەرد وە گڵ، گـڵم بـڕشت کـەرد
بڕشت، بڕشت گشت، گڵم وە خشت کەرد
ئـاخر بـەی‌تەور بی، سـەرئەنجام مـن
گشت وست وە کوورە، خشت خام من
بـرژیام وە ئـاگـر، سـوزیام و سـوختم
پـــوختە پـوختە بـی، خـــامی نـەپوختم
وەخـــتێ بـەرئامام، چـە کـوورە خـانە
هەردانەی خشـتم، بـی وە یـەك دانـە[2]

---

١- زەنگن.
٢- مەبەست دانەی گەوهەرە.

لە تۆی[1] بۆتەی[2] قـاڵ[3]، تـاویامەوە
تـــا وە ڕوتـــبەی بـــەرز، یـــاویامەوە
ڕۆشـــن‌تر لە دوڕ، خـــاس‌تر لە بـــلوور
چون تەڵای دوو قاڵ، مەدرۆشام لە دوور
تـــەلارم لایـــەق، شـــەهەنشـاهی بـــی
موحکەم پـام لە بـان، پشت مـاهی بـی
بەرز بی دەماخم، وەبـەرزی «پـەڕاو»[4]
وەی تـــەورە ڕۆژێ نـەمەدیام وە خـاو
هیچ تاقم لە تـاق، «کـیسرا» کـەم نـەوی
ساحێو تاق کـەمتر، لە «حـاتەم» نـەوی
خاس‌تر لە «حـاتەم»، مـێوان‌نـەواز بـی
قـاپیم پـــەی مـێوان، نـەوازی واز بـی
ئـاخر چـەرخ چـەنیم وا سـتێزە کـەرد
بـــەرد بـــنچینەم، ڕێـــزە ڕێـــزە کـــەرد
دیـــوارم ڕمـــان، ســـەقفم دا شکـەست
قاپی ئـومێدم، لە ڕووی مـێوان بـەست
هەر کاتێ زانای، چەواشـەی چـەپگەرد
چەپگەرد چەنی تۆێش وە چەپ بازی کەرد
شـیشەی شـادی تـۆیچ، دا وە بـەردەوە
تـا مـــەحشەر نـاڵای، وە دەم دەردەوە
«ئەحمەد» ئی دونیا، قەڵای پـڕ بـەڵاس
هەر قەڵا خاکـە و هـەر خـاکـە قـەڵاس

---

١- ناوی.
٢-کوورەی تاواندنەوەی زێر و زێووشتی‌وا.
٣- تاواوە.
٤- ناوی کێوێکی بەرزە لە کرماشان.

## بەدبەختی بەختم

بەدبەختی بەختم، بەدبەختی بەختم
یاران بێنە سەیر، بەدبەختی بەختم

گیروگەی مێحنەت، ئازاری سەختم
بڕیاگە نان و دڕیاگە ڕەختم[1]

لە کەچی ئیقباڵ، فریشتەم خەفتەن
ستارەی بەختم وە عەقرەو کەفتەن[2]

ئاگرم ناگڕێ، چرام خامۆشە
فریشتەم هێمای، مەست و بێهۆشە

سەگم بۆی نسیە، بناس و نەناس
ئەر زکی بدڕی، لە کەس ناکا پاس

مشك خواردیسیە، هەوانە و توربەم
دایم خزمەتکار، یەك دانە گوربەم

لە تەڕ ئەخوات و ئەخەفێ لە وشك
میاوێ ناکا، جارێ لە ڕووی مشك

حاکم نامدوێنێ، خوێش لێم بێزیاگە
ئێژی کفری حەق، لە من خێزیاگە

ناوێرم لە جێی، خوەم بکەم ستێز
مەردم هەر وەك گول، لێم ئەکا ترێز[3]

---

١- جل و بەرگ.
٢- ئەستێرە ناسان قەدیم بڕیاریان وابوو ئەگەر ئەستێرەی بەختی کەسی بکەوێتە عەقرە و نیشانەی بێ شانسی دەر ئەبڕێ.
٣- خۆ پاراستن، دووری کردن.

سا بێ جا دڵ وەی، زندەگیە خوەش کە
لێــــفێکم مــــاگــە، بــووگە وە ڕەشکــە
هــەر وەخت گــەرەکــمە، بــیدەمە مـلما
هـــەر وەك بـــەرەداو ئـــەچێتە قــولما
لە دەوڵــــەت داری، ســــەری ئــــافرم
ئــیستە خــزمەتکار، یــەك مــامرۆ کــرم
لە ئــــەوەڵ دەفــــعە، پــــانزە هــەڵتێرێ
چــــە مــــایەی ئــەوێ، وە کــەڵەشێرێ
ئەگەر هـەر وەك ئـەسب، بـیگرمە کـەما[1]
نــــاتسێتە مـــل، مــــامری خـــوەما
«ئەحمەد» بـەدبەختی، ڕوو نـەکـاتە کـەس
بە حـەق ئـەو کـەس، کـەسە بـۆ بـێ کـەس



---

١- گیایەکی بۆن خۆشە کە لە «شاهۆ» سەوز دەبێ وە ئاڵفی ئاژەڵە.

## ئاغە وە حاڵم[1]

ئـــاغە وە حـــاڵم، ئـاغە وە حـاڵم
ئاغە ئەر نەکەی، ڕەحمێ وە حاڵم
چــون مــورغ زەڕیــن شکەستە باڵم
گــیر ئــاوردەی دام، ســاڵ ئــیمساڵم
لە گەردش چەرخ، چەواشەی چەپگەرد
بەرگەردەن موهرەی، تاس تەختە نەرد
ئەرچی کەس جە دەس، جەورش نەڕەستەن
ئەفشارم گەرتەن، شەش دەر لێم بەستەن
شانسم چەنی تاس، مسا لە کەشاکەش
دو خاڵ ماوەڕۆ، نە جاگەی دوو شەش
پــێشینان واچــان: نــەدارۆ عەجیب
ڕاسی پەرێ دۆس، دەردیچ پەی تەبیب
بــە غــەیر لە ڕاســی، سەلاحیم نیە
بــــڕیاگــە ئــیمساڵ فەلاحیم نیە
دانـــە شلك نـــاوەم، لە دەرو لە مـــاڵ
نە گەنم، نە جۆ، نە زەڕات نە گاڵ

١- ساڵێ کە فەلایی وکشت و کاڵی شاعێر، بێ بەرهەم ئەبێت، ئەم شێعرانەی بۆیەکێ لە هاوەڵانی نزیکی بەناوی «ئەکبەرخان ئاللهیار خانی» نووساوەکاتێ کە ئەم شێعرانە ئەگاتە دەستی «ئەکبەر خان» سێباری قاتر گەندوم بۆ «میرزا ئەحمەدی داواشی» دەنێرێت.

«فاتمە»[1] ڕووی تاڵە، هەر ئان لە حەنم
خوڵقمی تەنگ کردگە، یەکجار بۆگەنم
وە قـــوڵە و بـــوڵە، کـــردگیە پـــیرم
هـــەر شـــەو بـــێ نـــانی، ئـــەخاتە بـیرم
مـــنیچ ئـــەرخـــەیاڵ، کـــارێکم بـوێت
وە دە شـەو هـەوەس، جـارێکم بـوێت
نـــازش بـــێ‌نانی، مـــاوەرۆ وە پـــێش
دەرلاد مـــەدەرۆ، زەوق دڵ جـــە ئـێش
ئیسە پەردەی شەوق، شادی دڵ دڕیـان
بـەشم لە خـوەشی، خـاو شـەو بـڕیان
وە خـــــەیاڵ بـــرسی وە زکـــی تـــێرۆ
ئـــەرچـــی هـام لە بـان ئـەمکاتە ژێـرۆ
بۆ یەکـێ لە دەور، دونـیا چـون شـێرێ
مـن لە ژێـر تـانەی، «فـاتمە» دەرپـێرێ
ئـــــەمیچە گـــــەردش، ڕۆزگـــــارێکە
کـــەر و پـــای مـــلە و پـــلە و بـــارێکە
دونیا تا وە سەر، هەر وا تـەنگ نـاوێت
کـــەر مـنیچ لە پـای پـلە لەنگ نـاوێت



١- خاتوون «فاتمە» ناوی هاوسەری «میرزا ئەحمەدی داواشیە». کە لە بنەماڵەیەکی زۆر بەرزو بەناو بانگی «ئەللك» سەر بە شاری «کامیاران» بووە.

## فەڵەك داخ و دەرد

کێت زەبوون نەکەرد، کێت زەبوون نەکەرد؟
فەڵەك داخ و دەرد، کێت زەبوون نەکەرد؟
سەرکێت لە ڕووی تەن، سەرنگوون نەکەرد؟
تەن کێت وە بێ سەر، غەرق خوون نەکەرد؟
کێت نەوست وە گێج، دەریای دەردیسەر؟
تسەن کێت لە گێجاو، ناوەردەن وە بەر؟
داخم کێت نەدان، وە مەودای خەتەر؟
کێ لە سای چەرخت، نشتەن بێزەرەر؟
کام شات نەوستەن وە ڕۆی گدایی؟
کام گدات نەنیان، وە تەخت شایی؟
شادی کێت بەرگەرد، نەکەرد وە شیوەن؟
کێت نەوست وە باغ، هەر غەمش میوەن؟
ئەو میوەت وە دەس، کام کەس نەدادەن؟
کام کەسەن لە جەور، زوڵمت ئازادەن؟
ئەر هەی ستەمگەر، جەفات بێسەفان
هیچ سەفات نیەن، سەفات بێوەفان
هیچ کەس نەنازۆ، وە سەفا و وەفات
هیچ کەس نەناڵۆ، وە جەور و جەفات
نادانێ وەك من، لێت پرسۆ هەواڵ
کێت نەوست وە ناو، غەمگینی و خەیاڵ؟

جەرگ کێت وەك جەرگ، من پارە نەکەرد؟
سەر کێت سەراویز، قەنارە[1] نەکەرد؟

کێت وە تێغ ئەجەڵ، دووپارە نەکەرد؟
دڵ کێت لە خووندا، فەوارە نەکەرد؟

کێت وەك من خەریك، پەژارە نەکەرد؟
کام چارەدارت، بێچارە نەکەرد؟

دڵ کێت وەك دڵەی، من داخی نەکەرد؟
بەرگ کێت وەك من، قەڵاخی[2] نەکەرد؟

دڵ کێت وەك دڵەی، من لە ماتەمدا؟
نەکێشای وە تۆی، هەتیتەی[3] غەمدا؟

نام کام نازارت، نەکەردەن بێناز؟
نەوستی چون کەوك، لە چەنگاڵ باز؟

بێ مروەت بێشەرت، بێوەفا و مەجاز
ڕیشەی جەرگ کێت، نەکەندەن وە گاز؟

دڵفریبەنی، بە نەیرەنگ بازی
هەر ساتێ وە مەیل، یەکێ ئەسازی



١- داری ئیعدام.
٢- ڕەش.
٣- پارچە پۆلا یەکی کون کونە زێڕینگەران تاڵە زێڕەی پێ دە گۆشن وەڕاست دە کەنەوە.

## چەرخ ئەفلاکەن

چەرخ ئەفلاکەن، چەرخ ئەفلاکەن
خودا داد ژ دەس، چەرخ ئەفلاکەن
چەند لە جوانان، سینە سەد چاکەن
چەن ژ مەحبووبان، دیدە نمناکەن
بەعزێ گرفتار، ئەسیر خاکەن
بەعزێ کەفتەکار، پیر هلاکەن
بەعزێ مەدهۆشەن، مەست و بێباکەن
بەعزێ دایمە، لە چەکاچاکەن
پەی هیچکەس تاسەر، نەداری سەفا
چواشەی چەپگەرد، پڕ جەور وجەفا
«خاقان» و «قەیەر»، ئەساسەی «فەغفوور»
ژکۆن جمجمە و سپای «سەڵم و توور»
فەڵەك تەخت بەخت، کێت نەکەرد خاپوور
ئەعزای کێت نەکەرد، وە لانەی زەنبوور
پەی هیچکەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەور وجەفا
کۆ شی[1] شای «جەمشید»، جەکۆن «کەیقوباد»
پێشینان پێش، باوەریم وە یاد

---

١- لە کوێیە.

شـێوونای خـەیاڵ «فـرعەون»، «شـەداد»
وە پـەشە سپای، «نـەمروود» دای وە بـاد
پـەی هـیچکەس تـاسەر، نـەداری سـەفا
چـەواشـەی چـەپگەرد، پـڕ جـەوروجەفا
«ڕوسـتەم» وەو تـەرکیب، وەو ئـەنامەوە
سـا ئـیسە ژکـۆن، «زاڵ» وە «سـامەوە»
«گـوودەرز» و «ڕەهـام»، وە «بـەهرامـەوە»
یـەکسـەر وێـنەی، مـورغ بـین وە دامـەوە
پـەی هـیچکەس تـاسەر، نـەداری سـەفا
چـەواشـەی چـەپگەرد، پـڕ جـەوروجەفا
«کەیخوسرەو» چەنی، سپا و تەبڵ و کووس
ئـەو سـان سپاو لەشکـر ئـارای تـووس
لە دەورەی «کـیان»، تـا وە «تـەقیانووس»
چەند ئاما چەند شی، فـیل و مـەنگەنووس
پـەی هـیچکەس تـاسەر، نـەداری سـەفا
چـەواشـەی چـەپگەرد، پـڕ جـەوروجەفا
«ڕووئـین تەن» مـەجرووح،هـا وە تـیرەوە
«بـیژەن» ئـەسیرەن وە زەنـجیرەوە
«پـیران وەیسـە» وە تـەدبیرەوە
مـا بـاقی شـاهان وە وەزیـرەوە
پـەی هیچ کـەس تـاسەر، نـەداری سـەفا
چـەواشـەی چـەپگەرد، پـڕ جـەوروجەفا
ژکـۆن شـاعێران، گـەوهەر فـرۆشان؟
لە بـازار عـەشق، بـادە مـەنۆشان

یەکسەر شین وە جەمع، جوملەی خامۆشان
سەنگ و خاك وگڵ باڵاشان پۆشان
پەی هیچ کەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
کۆن پەیغەمبەران، ڕەهنمای ڕەهبەر
ژکۆن بریقەی سەیف، بڕندەی «حەیدەر»
وە زۆر بازوو، دوشەق کسەرد خەیبەر
ڕیشەی کافران، بەر ئاوەرد وە بەر
پەی هیچ کەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
سەحرای «کەربەلا»، «حوسەین» مەزلووم
لە نزولەی ئاه، تفلان مەعسووم
شەهید بین وە دەس «شمر» چارە شووم
جاش سەقەرینەن خوەراکش زەقووم
پەی هیچ کەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
«یوسف» وەو شەوکەت، وەو جەماڵەوە
«زلێخا» وەو زلف، خەت و خاڵەوە
«عەزیز» مستەغرق، وە خەیاڵەوە
«قاروون» سەرنگوون، وەکول ماڵەوە
پەی هیچ کەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
«شیرین» وەو شێوە، خودا دا وەپێش
«خوسرەو» وەو شەوکەت، خوسرەوانی وێش

«شاپوور» وە قەڵەم، نەقش و نگارکێش
«فەرهاد» تا مەحشەر، مەناڵۆ جەئێش
پەی هیچ کەس تاسەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
ئەوە «ئەفلاتوون» وە «لوقمانەوە»
«ئەرەستوو» ژکۆن وە دەرمانەوە
«ئەسکەندەر» وە تیپ، سپاوسانەوە
«نادر» وە یاسای، ڕای ئەفغانەوە
پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
سەختی زمستان، وە کول قەهرەوە
یە خوەشی بەهار، لە ڕووی دەهرەوە
نەهەنگان لە تۆی، گێج بەحرەوە
باقی ئەنواعات، وە چەند تەحرەوە[1]
پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا
ئەبڵەهان مەسروور، وە ماڵ دنیا
ئەمیچە گەردش، دنیای بێ بنیا
تەخت چەند شاهان، لە ڕیشەکنیا
تەبڵ بەدنامی، چەند کەسان ژنیا
پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

---

١- تەرز، شێوە.

چەند ژێر بی وە بان، چند بان بی وە ژێر
چەند پەشە فایق، بەر شێر دلێر

چەند حەق وە ناحەق، چەن حەق کەفتە دێر
چەند زاڵم وە گۆشت، مەزڵووم بووگە تێر

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

گۆم بی وە بگار، بگار بی وە گۆم
شێونا غەوغای «غُلِبَتِ الرُّوم»[1]

چەند شۆم وە بایەر، چند بایەر وە شۆم
ئەسڵ نەماگەو گۆڕیاگە تۆم

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

نەمەندەن بازار، ئەسپان تازی
بیەن وە بازار، هەرزەو کەربازی

نەمەندەن فتوای، گوفتار قازی
هیچ کەس وە ڕەفتار، شەرع نیەن ڕازی

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

ناکەسان مونعم، وە گەنجو وە ماڵ
کەسان گشت موحتاج، وە لامشتێ گاڵ

دەروێشان پەشێو، سۆفیان ڕەجاڵ
سونەتان بەرجان، فروزان بەتاڵ

---

١- ئیشارە بە ئایەی (٢) سوورەی روم لە قورئانی کەریم.

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

چەند شاهان مەعزوول، لەڕووی کورسی عاج
کام تەخت و تاجش، نەدان وە تاراج
سکەی سفیدی، نەدارۆ ڕەواج
وە حەکیمان دا، دەرد بێ عیلاج

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

یەگشت لە گەردش، چەرخ ئەزرەقەن
ساتێ پەی کەسێ، ساحیب ڕەونەقەن
حەقمان وە ناحەق، ناحەقمان حەقەن
تەلا گەردەن کەچ، زەردی مەفرەقەن

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

قەدیم ئوجاخان، زووخاو مەنۆشان
کۆنە چووپانان، ترمە مەپۆشان
برا پەی قەتڵ برا، مەکۆشان
ئەر مەدەی سێ جام، خوونش مەنۆشان

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

نەجیبان موحتاج، نازاران بێناز
کۆر کۆرە نشتەن، لە تەلار باز
ئەژدەهای نەفس، دەهەن کەردەن واز
فەرزەن ژ پدەر، نەدارۆ ئەغماز

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا

مەعلووم حەقاحەق، ئنتهای مەنەن
زولْم زالْمان، زۆر جە حەد سەنەن

«ئەحمەد» ژەو بۆنە، یەك جار دڵ مەنەن
وا ئەسڵ بەدەڵ، بەدەڵ پەسەنەن

پەی هیچ کەس تا سەر، نەداری سەفا
چەواشەی چەپگەرد، پڕ جەوروجەفا



# ئەجەڵ

ئـامان ئـازیزان، خـاتر خـار مـەون
پەی فەوت هیچ کەس، دڵ ئـازار مـەون
قـاعیدەی قـانوون، ڕۆزگـار پـاسەن[1]
«دائـمالمـدام»[2] زەهـرش لە تـاسەن
موهرە مـەشانۆ، لە ڕووی تـەختە نـەرد
گا مەواچان بی و گـا مـەواچـان مـەرد
گا شاد، گا ناشاد، گـا شـیرین، گـا تـاڵ
دەوران بـــازیش، دوورە لە خـــەیاڵ
وە بـرد و بـاختش، هـیچ کـەس نـەنازۆ
ئـەر جـارێ بـەرۆ، دوو جـار مـەبازۆ
کارەکان گەردوون، کەس نـەکـەردەنەن
ڕەســم ئــادەمی، زاد و مـەردەنەن
گەردوون ئای گەردوون، هەر یە کارشەن
زانـــایان حـــەیران، لە کـــردارشـــەن
ئەر شان، ئەر گدان، ئەگەر خـوونکارەن
جاش[3] هەر قەبر تەنگ، زوڵمات تارەن
وە یەکێ خـەڵعەت، دەوڵـەت مـەپۆشۆ
وە یــەکــێ بـادەی، ئـەجەڵ مـەنۆشۆ

---

١- وایە.
٢- هەمیشە.
٣- جێگەی.

وە سەفاش هەرگیز، مەوەسن کەمەر[1]
وەفاش پەی هیچکەس نەویەن تا وە سەر
عاقیبەت مەرگەن هەر مەبۆ مەردەن
مەردەن چەن مەردان، جە مەیدان بەردەن
تۆڕ دام ئەجەڵ، جە ئەزەڵ تەنیان
موحاسیرەی دەور، دایەرەی دنیان
دانەی تەماعش، وە خەروار نەك مشت
وە فەلای[2] فریب، فەڵەك کەرد وە کشت
مورغەکەی بەشەر، دانە چینشەن
سەیادەکەی[3] مەرگ، لە کەمینشەن
وەحش و ئینس و جن، زی نەفس و بەشەر
جەی دانە و دامە، نمەشۆ وە بەر
ئاخر ماوەرۆ جە نیك و جە بەد
گیر بەو سەرحەڵقەی، تۆڕدام تا ئەبەد
«ئەحمەد» وەی خەیاڵ خەمو خامەوە
مەگێڵ تۆیش مەویت، وەی تۆڕ دامەوە[4]



١- بروامەکەن. دڵ خوش مەکەن.
٢- جوتیار.
٣- ڕاوچی.
٤- شەش بەیتی ئاخری ئەم هۆنراوە بە وەسیەتی هۆنەر لەسەر مەزارەکەی نووسراوە.

## ئەگەر بەدکارم مانعم تۆوی[1]

ئەو ڕۆ جە عەدەم، دنیات کەرد سرشت
وێت کێشای تەسویر، فەرقەی زیباو زشت
وات قەرارداگە، لە سەر عالەم گشت
گاگا پشت وە زین، گاگا زین وە پشت
ئەگەر بەدکارم، مانعم تۆوی
چون کە جە ئەزەڵ، سانعم تۆوی
یا قایم وە زات، پادشای ئەقدەس
یا ئاگاوە حاڵ، موریچەو مەگەس
یا دانای داوەر، کەسان بێ کەس
باڵا دەست توو، نیە دەست کەس
ئەگەر بەدکارم، مانعم تۆوی
چونکە جە ئەزەڵ، سانعم تۆوی
یا «عالمالغیب»، ئاگای ئەحواڵان
یا سامع سرڕ، سینەی مناڵان
مەسمووع نمای حەرف، زوان لاڵان
هەر تۆنی کەریم، قەدیمی ساڵان
ئەگەر بەدکارم، مانعم تۆوی
چون کە بە ئەزەڵ، سانعم تۆوی

---

١- شاعێر ئەم شێعرەی لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا وتووە.

یــا لەقــای بــەرحــەق، دائــیم و قــەدیم
یــــا نــەقاش نــەقش، تــاق زەڕو ســیم
یــا ســاحێب ســام، ڕۆیَ ئــومیدو بــیم
تــۆی فــایقنمای، زەعــیف بــەر زەخــیم
ئــــەگــــەر بــــەدکارم، مــــانعم تــۆوی
چــون کــە جــە ئــەزەڵ، ســانعم تــۆوی
یـا کــەنندەی بــەند، لە دەروازەی حــەڵق
یــــا ڕەوشــــەن نــمای، بــینایان خــەڵق
تــۆی ئــۆسای بــونیاد، یاسان ئەبڵەق[1]
تــــۆی نگــــارندەی، چــەرخ مــوعەلەق
ئــــەگــــەر بــــەدکارم، مــــانعم تــۆوی
چــون کــە جــە ئــەزەڵ، ســانعم تــۆوی
تـــــۆ وێت ســــازنای دەهــان و دونــدان
ڕازق هــەر تــۆنی، هــەروێت مــەدەی نــان
تــۆ عــەتا ئــەکــەی وە «مــۆمن» ئــیمان
تــــۆی نــــازڵنمای، بــە لای نــاگــەهان
ئــــەگــــەر بــــەدکارم، مــــانعم تــۆوی
چــون کــە جــە ئــەزەڵ، ســانعم تــۆوی
تۆی وە دەیجووری، شوعلەی خوەرشید بێز
تـۆی لە دومـای شـەو، سـوبح سـادق خـێز
تــــۆ ئــادەم وە نــەفس، مــەدەری ســتێز
تـۆ شـێروویەت کـەرد، وە خـوونی پـەروێز

١- هەرشتێ دوو ڕەنگ بە تایبەت ڕەش و چەرمگ.

ئــــەگــــەر بــــەدکارم، مــــانعم تــۆوی
چــون کــە جــە ئــەزەڵ، ســانعم تــۆوی
تــۆی ئــاگــا وە ســرِ بــادان لە بــاهێر
تــۆ مــەواح کــەردەی، ئــاوان وە زاهــێر
تــــۆ بــــەر مــاوەری، گــولاّن لە پــاهێر
تــۆ ئــەکــەی لە کــان، ئــیجاد جــەواهــێر
ئــــەگــــەر بــــەدکارم، مــــانعم تــۆوی
چــون کــە جــە ئــەزەڵ، ســانعم تــۆوی
تــــۆی ســــفیدنمای، بــــەرگ ســیاهی
تــــۆ قــــەرارت دان گــا لە ڕووی مــاهی
زات لامــــەکــــان، بــــێ‌ماواو جــاهی
پــــەرێ عــــاسیان، هــــەر تــۆ پــەناهی
مــــن عــەبد عــاسی، بــار جــە گــوناهم
بــــەجوز زات تــــۆ، نــــیەن پــــەناهم
بــوویەر جــە تــەقسیر، کــەردەوەی بــەدیم
بــە شــەرەفناکــی، ئــیسم «ئــەحمەد»یــم

# ئاسیاوەکەی دڵ

ئــاسیاوەکــەی دڵ، پــەکــی کــەفتگە
لە بـــێ ئـــاوی‌یا، هــەروا خــەفتگە
مــیزان و ڕاشــتە و ســەر و پــای نـیە
شێویاگە یەك جـار، ئـاش هـۆسای نـیە
خــۆیچم ســەلیقەی، ئـۆستاییم نـیە
تـــەوانــا و تــاقەت، تــەنیاییم نــیە
ئــاسیاو بــەتاڵە، بــێ‌ئاو نــاگــەڕێ
ئاو بێت بێ ئوسایش، مـەنێ نـاهەڕێ
ئــاخ بــۆ ئـۆستایە، وە بـێ بـەرداشـتە
سەر و پای دەرکات، بـێرێتیە ڕاشـتە[1]
وە مــیراو[2] مــەیل، هــەڵبکا ئــاوی
ئــاوای کــەن تــا بــار، بـێرنە نـاوی



١- ڕیك و پێك.

٢-کەسێ کەئاو دابەش ئە کا.

## یاد وەتەن نەکەی[1]

وەتـــەن خـــراوە، دەســـم وە دامـــان
یاد وەتەن نەکـەی، ئـامان سـەد ئـامان!

وەتەن کـام وەتـەن؟، کـەی ئـەو وەتـەنە
ئـــیسە خـــراوەی، پـــڕ لەجـــەنە

وە گـــوڵشەن نـــەما، وەتـەن دی خـارە
پـــڕ لە قـــومقومە و مـــەزووکە و مـــارە

ســـارای بـــێنوورە، بـــاغی بـــێفەڕە
بـــوڵبوڵ بـــاغی، بـــووگە «قشـقەڕە»[2]

شـــیرینی وەتـــەن، تـــەواو تـــاڵی‌یە
تـــاڵی گشت لە دەس، بـــەد هـاوماڵی‌یە

دێ وە دێ مـــەچۆ، وەزعـــی خـــراوە
وە هـــەر دێ ئـــەچی، چ ســـەگـــەڕاوە

دێـــهات نـــیشتنی، نـــەما بـــەتاڵە
هـــەر ســـەڕەی کـەرەو گـەفەی گـەماڵە

ئـــەو بـــێ حـــەیایی و بـێ ئەغمازی‌یە
حـــەیفە مـــەلا دڵ، ئـــەر پـێی ڕازی‌یە

«ئـــەحمەد» وە قـوربان، شـەق خـامەتە
هـــەرئان ئـــینتزار، ئـامای نـامەتە

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» لە ساڵی ١٣٥٧ کوچی هەتاوی ئەم شێعرەی لە وڵامی «مەلا محی‌الدین صالحی» کە لە شاری «خرّم‌آباد لرستان بووە و پرسیاری کردووە وەتەن چۆنە نووساوە.

٢- قەلانجە.

## ئامۆژگاری

مـەڵهەم بـەر پـەی دەرد، زامـان کـاری
زام سـاڕێش کـەرە، پـەی یـادگاری
پەردەی هەم و غەم، وە هـەم پـارەکـەر
چـارەی بێچارەی، هـەر بێچارە کـەر
دڵـەی دەردیـنان،[1] دڵـنەوازی دەر
وە یـەك دڵـداری، بـەدڵ ڕازی کـەر
بـنوازە بـە ڕووی، بـازەوە فـەقیر
تـاڵی ئـەغم تـاڵ، نـمەشۆ لە ویـر
وە هـەزار شـەربەت، دانـای پـرکەماڵ
شـیرین نـمەبۆ، تـاڵی ئـەغم تـاڵ
داڕووی «ئەفلاتوون»، «لوقمان» بدەی لێش
نـێش ئـەغم تـاڵ، نـمەبۆ سـاڕێش
ڕەفـیقی ڕەفـیق، بێ ئەغماز نـەکـەیت
شەریکی شـەریك، قـومارباز نـەکـەیت
گۆش مەدەر وە حـەرف، دزان بـۆ دزی
تا خوەت نـەوێنی، وە خـواری و کـزی
ئـامانەن عـادەت، وە درۆغگـۆیی
نەکەیت غەیر لە سدق، ڕاسی و خوەشخۆیی

١- عاشقە دەردە دارەکان.

وە ڕاسـی هـەڵسە، وە ڕاس دانیشە
وە ڕاسی بۆ خوەت، زەحـمەت بکێشە
ڕاسـی سـەرمایەی، فـەخر بـەشەرەن
درەخت ڕاسـی، سـاحێب سـەمەرەن
دیـبای ئـیحساسات، پـاکی بپۆشە
دیـنت وە دیـنار، وە کـەس مـەفرۆشە
لە سـەرەڕێگە، سـەرخـەو نـەشکێنی
تـا خـەو ئـاشۆو پـاشۆ نـەوێنی
تـەنیا و ئـابەڵەد، مـەدە لە مـلە
ئـاخر گـیر ئـەخوەی لە ئـاخر پـلە
هـەرگیز نـەفرۆشی، خـاسێ وە خـراو
خـراوەی خـراو، ئـەوێنی وە چـاو
شـەواڵ نـەکـەنی، تـا نـەدەی لە ئـاو
حـەساوت نـەکـەن، بـا وە نـاحەساو
هـەروا وە نـاحەق، مـەیەرە قسـە
زوان لە قسـەی، نـاحەق بـووەسە
تـا لێت نـەپرسن، مـەیەرە جـواو
قـسـەت ئـەمێنێ، نـیمەو نـاتەواو
زەم کەس نەکـەیت، تـا نـەکـەن زەمت
بـا وە بـەنِد زەم، نـەوەسن دەمت
دەم بـوەس لە زەم، بـا نـەکـەن زەمت
ئـەر نـەوەسی دەم، ئـەوەسن دەمت
مـەکـەر وە عـادەت، مـینا شکێنی
تـا وە شکـیاگـی، مـینات نـەوێنی

بوخت ناحەق نەکەیت، وابزانی خاسە
هەرگیز وە درۆ، نەیەژی ڕاسە
هەرگیز نەتاشی، سەرێ وە بێ‌ئاو
ڕیشت ئەتاشن، نیمەو ناتەواو
خوەت بۆخوەت هەرگیز، نەوی وەقازی
ئەر بیت وە قازی، زوو خوەت مەبازی
وە مەمبەر بۆخوەت، بچی خەتەرە
هەر سوحبەت بکەیت، بۆ خوەت زەرەرە
ئاوێ بڕژێنی، خوەلاسەی کەلام
وە خەمو خەفەت، جەم ناوێتە جام
کەسێ بۆ کەسێ، بکەنێ چایە
خوەی تێی ئەکەفێو ئیتر دەرنایە
هەرکەس بێگانە، بکاتە خوێش خوەی
حەتمیەن وە گورگ، ئەدا مێش خوەی
ئەر توولە مارێ، پەروەردە کەری
حەتمی بزانە، زەهرش مەوەری
ئەر ناز بەچە، عەقرەو بکێشی
ئەشێ بکێشی، ئێشێ لە نێشی
هەر بنا نریا، بۆ تەواوی‌یە
هەر تەواو کریا، بۆ خراوی‌یە
دیبایە بڕیا، بۆدڕین ئەوێ
ئەرباخێ نریا بۆ بڕین ئەوێ
هەر مەنێ پڕ بوو بۆ ڕژیان ئەوێ
هەر سەگێ هار بوو بۆ کوژیان ئەوێ

کـــەنین وە قـــەهقە، ئـــاخر زاری یـــە
درۆ بـــــــێ درۆ، شـــــەرمەساری یە

هـەرگیز مـوفسیدی، مـەکـەر وە پـێشە
بـاعیس تـەفرەقەی، ئـەقوام و خـوێشە

نەخشەی ڕیشەکەن، بۆکەس مـەکـێشە
بێشك ڕیشەی خوەت، دەرتێ لە ڕێشە

هیچ نەچیت وە سەر، دەنگ‌وبلس‌خەڵك
با گوێت شل نەوێت، بۆ قـەی بێ‌کەڵك

تووش شـەڕتەکـا، قسـەی پـڕ و پـووچ
حەشا لە سوحبەت، بێ‌سوود و بێ‌سووچ

بکـەر وە عـادەت، شـەو بـێداری شـەو
وە تـــاعەتەوە، بـێزار بـەر لە خـــەو

نـــاڵە و پـــاڵە کـەر، وە دڵ نـەك وە دەم
بشـــۆرە گـونات، وە ئـەسرین چـەم[1]

مـــەڵهەمەن پسەی دەرد، زامـــان کـاری
وە گـــــریانەوە، شـــــەوان بـــــێداری

بـەڕاســی بکـــە، تـــۆبە وە ئـــیخلاس
بـاعیس نـەجاتە، تـۆبەی ڕێك و ڕاس

هەر کەسێ نەی‌وێت، مـورشیدێ کـامڵ
ئـەگـەر «لوقـمانە»، شـێتە نـەك عـاقڵ



١ - چاو.

## وە تەڵەی کەڵەك

یەك جاری دەوڵەت، وە تەڵەی کەڵەك
مـــلەتی کـــردگە، وە ڕێـــوی‌و دەڵـــەك
لە هـــەر کـــوێ دزو، دەخـــەڵێ بـــوێ
چـــەڵماس‌و چـــەڵماخ، چـــەپەڵی بـوێ
چـــەکوو چـــەکۆچن، چـــەقۆ کـــەشێکە
پـــــڕڕوو ڕوودار، یـــەك ڕوورەشـــێکە
قـــــەدیم قـــــرتگ‌و، قـــوڕمساخێکە[1]
دیـــن وە دیـــنار دەر، قـــەرەزاخـــێکە[2]
یـــا قـــەوم فـــروش و، یـــا قـــازاخـــێکە[3]
مـــــار نـــاهامار، هـــەر ســـۆراخـــێکە
هـــەم لە کشـــوەری‌و، هـــەم لە لەشکـــەری
ئـــەیکەنە مـــەئموور، بـــۆ ڕەنـــج بێوەری
فـــەنی بـــۆ فـــنوون خـــزمەت مـــلەت
مـــەوادی‌و مسادی بـــێ قـــەدرو قـــلەت
ئـــــەسڵ‌و فـــــەرعیان نـــــیە نـــاقزن
ڕەفـــــیق قـــــافڵەو شـــــەریك دزن
١٣٤٠ی هەتاوی



---

١- جاکەش، دەوپت
٢- چەنە باز، مفت وێژە.
٣- چەکداری دەولەت، عازەب.

## ئامۆژگاری بۆ یەك قومارباز

قــاپ قــومارخــانە، قــاپ قــومارخــانە
قـــاوەخانەنیش، قـــاپ قـــومارخـــانە
لۆقـــیای لۆقـــن، لۆق لە قـــنگ بـــڕیاگ
قـــەدر خـــۆ نـــەزان، دۆڵ قـــنگ دڕیـــاگ
کـــــۆنەدارزیــاگ، وەك کــەمتار کــەفتگ
قـــاڕی قـــومارباز، لە مـــاڵگەل خـــەفتگ
کـــەوە پـــیر بـــووگی، یـــاڵت ڕزیـــاگـــە
لە هــــــەزار لاوە، کـــــۆمت کـــــزیاگـــــە
زکت زل بـــــووگە، وەك مـــــەشکەدۆچن
دەم وەك کــــــاسە کــــەل، دەس لەتـــەچن
دەم وەك بـــــلۆوچەی، ئـــــاسیاوە کـــۆنە
خـــوەت خـــاس ئـــەزانـی، بـــۆ گـــەنی چـــۆنە
بـــــەعد لە حـــــەفتا ســــاڵ، ئـــەمە حـــاڵتە
هـــــــەرشەو بـــــۆ قـــومار، مـــاڵە و مـــاڵتە
کـــرمت زل بـــووگە دی ئـــاکـــەیت چـــاری
هـــەر خـــوریا مـــەشغووڵ وەشـــارەوشـاری
وە ڕۆژ هــــــیلاکو، شـــەو بـــێ ئـــارامـــی
ئـــــارامت نـــــیە، بـــــۆ کـــــاسە ڕامـــی
بـــــەسە عـــــەیاری، تـــــا چـــە ئـــەنازە
کـــــۆنە ئـــــەفرۆشی، وە نـــــرخ تـــــازە

خلس لێت شێویاگە، باش مەخشووش بووگی
جك و بلك نەما، لاچەو تووش بووگی
مناڵەکانت، پووکَو پاکیان
نیات نانەکەی، خوەت وە چاکیان
خاسیت نەماگە، بە غەیر لە خراو
عەرەقی پێست، گرد عەرەق شەراو
عەترت نەماگە، هەر چس و فسی
شۆلەکەی ترپ، هەوانەی تسی
هەی پەنەی نەگبەت، یەچ پەنێکیت
سن بۆ هاتگ، چە بۆ گەنێکیت
بەسیە دارزیە، مەگەر مناڵی
بێ حەیا تا کەی، حەفتاو پەنج ساڵی
پات ها لە گۆی گۆڕ، نزیکە بمری
تازە تەماتە، کلك و مل بگری
مەر بمری وەرنە، هەر یە کارتە
بۆ «پۆکەر»[١] «ڕامی»،[٢] شارەو شارتە
وێڵ و بەرەلاو، بێ سەرو دومی
تا ڕۆژی پەیدای، دوانزە ڕۆژ گومی
نە نوێژ نە ڕۆژگ، نە تاعەتت هەس
کەی لە دەس قومار، ئیسراحەتت هەس
زوان بووەسە، لە قبەی ناحەق
بترسە لە نار، شەرارەی دۆزەق

١- جۆری قوماری بە پەڕانە.
٢- پیشین.

دی کـــــەمتر مـــینای حـــەیات بشکـــێنە
لە پشت سەر ناحەق، بـۆ کـەس مـەخوێنە
دی چیت پێ بـێژم، بـێ نـامووس‌و نـەنگ
مـــینای خـــاترت، کـــەم بـدەر وە سـەنگ
ئـــەر حـــاڵی نـاویت، شـیر خـام خـوەردە
بـــــا حــــاڵیت بکـــــەم، وە وردە وردە
نـام چـەت پـێ بـێژم، مـەشکە دۆچـن زك
چەفت بەد چەمیاگ، سـەر تـا پـا هـەرلك
هەی خوەت وە قەور خوەت، سا چەن خەبیسی
ســــەگ‌و خـــنزیری، کـــەسیف‌و پـیسی
دزو درۆزن، چـــــــەقەڵ‌و چـــــــەپەڵ
خــــویڕی‌و خـــەواڵــو، فـــاسق‌و دەغـــەڵ
وە زڕە نـــــــیە، نــــــوور ئـــیمانت
لە خـــوەت لەق‌تـرە، عـــەهدو پـــەیمانت
بـــاز هــــەم مـــاگـــتە، واز نـــایەرم لێت
ئـــەشێ بـڕژێنم، شـیر حـەفت ماڵە پـێت
هـــــێمانێ مـــاگـــتە، ئـــەر زەمت بکـــەم
لە خــــراوەی خـــوەت، پـڕ دەمت بکـــەم
بـــووگی وە لانەی، مـیکرۆب هـەزاردەرد
نـــامووس ئـــەفرۆشی، بـــۆ قـومارو گـەرد
بــــێ قـــەوڵ‌و قـــەرار، بــێ ئـــیعتیباری
تـــــف لە دیـــــارت، هــــەر تــا دیــاری
سەودات بێ سوودە، دەس‌مایەت پـووچە
مەکـرت وەسـە شـار، سـەدهەزار کـووچە

شەیتان لە شوومی، شێوەت بێچارەس
لە شاروکووچە، مەکرت ئاوارەس
فریو دریاگی، ڕازیو ناڕازی
مردنت فەرزە، لە قوماربازی



## حاجی بەتاڵە[1]

حاجی بەتاڵە، حاجی بەتاڵە
حاجی وەو حەجە چیتە بەتاڵە
فامت نەمەنیە و، عەقڵت مەحاڵە
ڕاسی بیت وە پەن، ڕسوای سەدساڵە
تو چیت وە «مەکە»، ماڵ خودا دیتە
موسڵمان نەویت، کافریش بیتە
تا نەچویت وە حەج، شەخسێ مەعقوول بیت
کەی ئەوەن دەربەن، مەنافع پوول بیت
شەخسێ چوو وە حەج، قورس بوو ئیمانی
تو ئیمانت چیو، دینیش لە بانی
خەرقەی شەرافەت، کەنیتە لە وەر
ڕوو سیەی دیوان، خوداو پەیغەمبەر

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی بە تکاو تەقازای کوڕی حاجی «حەیدەر»ی کرماشانی کە باوەژنەکەی لە زەمانەی حکوومەتی «شا»دا لە دەبیرستانی شەوانە دەرسی پیاوانی گەورەی وتووەتەوە، نووسیوە.

ماشین شەخسی، زندەگی سەرشار
سەروەت و دەوڵەت، پوڵ بێ‌شمار
ئاخر عومرتەو، ئەوەڵ ماڵداری
باب لەعنەتی، لە تەمەعکاری
بەرگەشتە حاجیت، خیلافت نیە
پوڵ وە نەفع داین، کەفافت نیە
لەی ئاخر عومر، وەیە دڵ خوەشیت
داخڵ لە جنبەی، جبهەی جاکەشیت
ژن حاجی ئەسڵەن، سەودای نیە
ئینشا و ئیملا و، مەفادی نیە
یە بەدبەختیت بی، کی وادارت کرد؟
ڕشوە دای وە زوور، سەواددارت کرد؟
تەوالت کەردە و زەریف و نەزیف
چمان وە دەس خومت، دەیدەی وە حەریف
ئەمر بە مەعرووف، نەهی لە مونکەر
ئەگەر دیسنداری، بگرەی وە نەزەر
حاجی خەرەفەو، بی مەغزو هووشی
بی هەمەچیزو، ناموس فرووشی
حاجی ڕسوایت، لەی شارە بەسە
ژنت وە زکپڕ، چوودە مەدرەسە
ئەڕای گوزەران، مەعاش حاجی
گەرد شاگردەیل، کەیدن وڕاجی
تو کە حاجیت و، شوغڵت عەلافە
کار بیڕەویە، وە تو خەلافە

نــەمینی لە دەور، هــەر بچوو گـم بـوو
عـــەیب نـــیە ژنت وە مــوعەلم بــوو
تـا دەرسـی بـویشی، دو دوِرس خـوەنیە
حاجی ئەڕام بـویش، دی چـەی مـەنیە؟
حـــاجی دارِزیــەی، یــەچوو مــەنیتە
بــرج وە بــرج پــویل، ژنــەت ســەنیتە
لە ڕەنگ گـــەردیایتە، نـــیلیەو بـــیتە
دەس لە دیــن کــیشای، پــویلیەو بــیتە
حاجی «حەیدەر» بیت، بیت وە حەیدەرەك
وە پـاڵدوم دەرچـیت، نەویت وە بەرەك
«ئەحمەد» ئەر ڕەفتار، حـاجیگەل واسـە
تـــف لە ســـەرومل، ئـەویانە خـاسە



## باسی مورشیدانی ئەهل حەق

پـــیر پـــاك نـــەزەر، پـــیرپاك نـــەزەر
ئـــا «ســـەید بـــراکـــە» پـــیر پـاك نـــەزەر
ئەر مەكەرد وە سـەنگ، سیا یـەك نـەزەر
تەبدیل مـەكـەردش، بـە دانـەی گـەوهەر
جـــە فـــەسڵ زمســـان، وەرو قـــەهاری
مـــەداش وە مـــێهمان، مـــیوەی بـەهاری
صـــــحیح القـــولَن لە ئـــەهل شـــعوور
لە دەی ئـــاوەردەن، شـــامیو ئـــەنگوور
دارای كـــەرامـات، كـەشف و كـەرەم بـی
چەند ساحب كەرەم، لە دەورش جـــەم‌بی
كـــەلام تـــەموور، زەمـــزەمەی جـــەمش
نـــــاڵەی مـــەستانەی، دەور حـــەرەمش
هـــوهووی دەروێشـــــان، تـــەكـیەنشینش
ســـەرشار لە بـــادەی، لوتـــف پـــڕتینش
بەند دەرئاوەران، گۆشەی جـەم خـانەش
مـــوستەفیز وە فـــەیز، خـــاك ئـاستانەش
سۆز سەدای سـەوت، چـزە و كـزەی دڵ
دڵ ئەر جەسەنگ بی، مـاوردش وەكـوڵ
«ئـــەحمەد»ئـی دونـیای، دوون مـەكـارە
هـــەر یـــە كـــارشەن، شـــووم بـــەدكارە

عـامی و عـالم و سـەید و ئـاغە و شـێخ
بنچینەی قەڵای کێش نـەکـەند جـە بـێخ
بەی تەور چـەرخـناش، چەرخ پـڕستەم
تەکیەداریش‌دا، ئەو وە «سـەید روسـتەم»
بە فـەزڵ و بـەخشش، بـە عـەتاو کـەرەم
بێ شك شایە بـی، خـاس‌تر لە «حـاتەم»
سـەر سـپەردەی خـاك، ئـەو زاتـە پـاکـە
جـاگـیر جـادار، ئـا «سـەید بـراکـە»
دارای کـەرامـات، کـان کـۆی کـەرەم
کەرەمدار نەوی، کس وەك «سەید ڕوستەم»
چون خوەر ئـاوا بـی، لەمـەغرب زەمـین
زەڕەی باتن دا، وە «سەید شـمس‌الدین»
«شمس‌الدین» چون شەمس، مەشرق بی‌تاین
ڕۆشـن کـەرد وە نـوور، ئـاداب ئـایین
پـایەی ئـوستوار، بـورهان حـەق بـی
سیمای سـەعادەت، شـەوق شـەفەق بـی
ئـوستاد ئـیرشاد، ئـەهل حـەق وە حـەق
دەلیـل بـورهان، بـاتن بـی‌و مـوتڵەق
تەی کەردەی ڕاگەی، ڕاسی وە ئـیخلاس
پـەی بـەردەی ئـیکسیر، کـیمیاشناس
نـایافت نـایاب، نـادر نـامی
بـوڵەند بـی پـایەی، عـالی مـەقامی
شـێر بـێ‌ئەندێش، بـێشەی هـونەر بـی
ئینتخاب کـەردەی، سـاحیب نـەزەر بـی

بـــوزورگەواریش وا بـــەرمەلا بـــی
بـــەرخـــوردار ڕۆژ قـــاڵ و بـــەلا بـــی
پـــیر مـــەیخانە و، نـــازکێش نـــاز بـــی
خـــەتم سـەر حـەڵقەی، ئـەهل نـیاز بی
فـــەیاز فـــازڵ، مـــەسنەدنشین بـــی
مـــحبوب القـــلوب، ئـــەهل یـــەقین بی
نـــەوید نـــەوای، جـــەرگەی مـــاتەم بی
دەرمـــــان دڵان، دڵـــــەی پـــڕغەم بـــی
ڕەهـــنمای ڕەهبەر، ڕاگـەی ڕاسـان بـی
چون سەرو سەر تەڵ، بێشەی خاسان بی
باز هەم چەرخش وەرد، چەرخ چـەپنگین
تاج «شەمس» نیا، وە سـەر «نـصرالدیـن»
نـــور بـــینایی، دیـــدەی نـــوورین بـــی
جـــاگـــیر لە قـەلبو، گـیان شـیرین بـی
جـــەلاڵ و جـلوەی، جـەمئارای جـەمەن
جـــەم نـــمای خـــاتر، خـــاتر نـاجەمەن
شا باز شەش دانگ، تـەلارخـانەی جـەم
ستارەی شەمس و، نەوەی «سەید ڕۆسەم»
حـــەق کـــۆتا نـەکـات، تـا دێـر زەمـانە
زەڕەی نـــوور وەشت، لەو خـــانەدانـــە
وەو «ســـولتانە»[1] وا، وە ســاقی ســاقەن
«ئەحمەد» بـە دیـدار دیـدەت مـوشتاقەن

١- مەبەست «سولتانی ساقە» کە مەزاری نەزدیك بە شاری نەوسوودە.

## دانش

ئــــارامش دونــــیا، گشت بــە دانشــەن
دونــــیای بــیٚ‌دانش، کـەی ئـارامشـەن

کشت مـــەزرەعەی، دانش پــڕ بـەرەن
کشت بــیٚ‌دانش، بـــەهرەش خـەتەرەن

بـــوستان فـــەزڵەن، پــڕلە مـــیوەی فـام
دانشـــەن پـایەی، بـوزورگی[1] و مـەقام

گوڵ باغچەی عیلمەن، وا پڕ سـەمەرەن
دانــەی سـەمەرش، دوڕو گـــەوهەرەن

دانش شەوق و زەوق، فەخرو سروورەن
بــیٚ‌دانش لە زەوق، زنـدەگـی دوورەن

شەخس بیٚ‌دانش، کـەڕە و کـوێرە و لاڵ
بیٚ فەهمەو شعوور، بیٚ‌عەقڵە و کـەماڵ

دانش ســـەرچـەشمەی، ئیمان و دیـنە
دیــن بــیٚ‌دانش، دی[2] کـەی شـیرینە



١- گەورەیی.
٢- ئیتر.

## کار

«محی‌الدین» وەمەیل، «محی‌الدین» وەمەیل
یەك ڕۆ «محی‌الدین» مەیلش کەرد وە مەیل
بە وێنەی مەجنوون دڵ لە غەمان کەیل
شەهید شەیدای شێت شێوەی لەیل
وە ئارەزووی لەیل ڕوو کەرد وە دووجەیل
مەڕیزا جە شەوق ئەسرینان چون سەیل
بە وێنەی فەرهاد دێوانەی دیرین
شێت شەیدای شەوق شیرینی «شیرین»
چاکدا وە کەمەر بازوو کەرد گوشاد
تەن دا وە قەزا یەزدان کەرد وە یاد
واتش: یا بێچوون وە ئومێد تۆ
قوڵەنگش هۆرگەرت ڕوو کەردش وە کۆ
واتش وە قوڵەنگ: کارم زەرووره
داوام هەن چەنی کۆی «کانی کووره»
یا بکەر وە گەنج بێ پایان غەرقم
یا نێش مەودات غەرق کەر لە فەرقم
یاوا وە چەشمە جۆشاو خورۆشا
چەن کەفێ لە ئاو سەرچەشمەش نۆشا
واتش: سەرچەشمەی حەیات و ژینم
«شیرین» و «فەرهاد»، بەستەن یەقینم

سا تویچ چون شیرین بێ وەفا مەبەر
جەفاکێش تۆم بێ سەفا مەبەر
شەرتە بتاشم وە تیێشە سەنگت
بەرزکەم لە عالەم ئاوازەی دەنگت
مەغسەڵ دەم سارات پڕ لە جەلاکەم
خاکت موتابق خاکەتەلاکەم
سەنگت گشت بە دوڕ لەعلو گەوهەرکەم
چەشمەت وە چەشمەی حەوزکەوسەرکەم
خاستەر لە فەرهاد یادگاری کەم
تا ئاوی کافی وە لێت جاری کەم
وشک بایرت خورەم و ئەرزکەم
چون «لبنان» وە باغ ئاوازەت بەرزکەم
نەقشێ بسازم یادگاری کەم
دەورو بەرت گشت وە گوڵکاری کەم
حەوش و حەولت گشت پەی یادگاری
گشت بکەم وە کشت گوڵ و گوڵکاری
وا بۆ لە ئەتراف پەرێ دیدەنت
بەیۆن پەی لەزەت ئاو نۆشیدەنت
مەبۆ وە تەرحێ ئاوت جاری کەم
بەهرەبەرداریت لە مرواری کەم
یادگار دەور ڕۆزگاری کەم
ئاوت وە شەفای دەرد کاری کەم
چوار دەورت وە باغ میوە ئحداس کەم
ئستەخرێ وە مەیل مەرامم خاس کەم

بـــەر بـــایرت وە کشت زایـــەرکـــەم
کـــان جـــەواهـــێر وە لێت دایـــەرکـــەم
تـــەخت نشـــتنت وە دڵـــخواهـــی کـــەم
قـــابل وە نشـــتن شـــەهەنشاهی کـــەم
نـــامت لە دەوڵـەت «ئـێران» مـەشهوورکەم
سەنگت سەرتاسەر وە سورمەی «توور»کەم

جواو چەشمە:

چەشمە لە جواو «محی‌الدیـن» بـەی تـەور
شیرین چون «شیرین»لە رووی شەرم شەور
واتش: ئەی «فەرهاد» رەنج بـەردەی تـاقیم
بـەو شـەرت بـاقی بـۆ حـەیات بـاقیم
ئـــەر ریشـــەی کـاوم بـەراری لە بـێخ
پـارە پـارە کـەیت وە سـەر مـەودای تـێخ
جـــەرگم ئـــاوێزان بکـــەران لە مـــێخ
گـیان شـیرین شـەرتە لێت نـەکـەم درێـخ
بشکـــاوە جگـــەر ســـەر قـــولەی کـــاوم
جـــاری کـــەر لە چـــەم هـــووناو چـــاوم
وە زۆر بـــــازوو، وە نـــێش تـــیشە
بـــەرئاوەرە ســـەنگ ســـەختم لە ریشـــە
شکاف دەر سینەی سەنگم چـون پـەڵەنگ
بـازکـــەرە مـــەجرای ئـاوم وە قـــوڵەنگ
هـــەرکـــەسێ لە کـــار نـــەبۆ هـــەراســـان
مـــوشکڵ تەرین کـــار مـــەکـــەرۆ ئـــاسان

وازح لە «چەشمە کۆرە» شەنفتش
خوروٚشا غیرەت چون نار وە نەفتش
بەرئاما چون شێر جەنگی لە بێشە
پەی ئەحیای ئاوش دەس دا و تێشە
کاو سەر قولەش ئاوەرد وە دامان
خێزا لە «چەشمە کۆرە» ئەلئامان
وە زۆر بازوو مەودای قوڵەنگش
فەڵەك شکاوا پەراشەی سەنگش
وە تێشەی فوولاد وا تاشا سەنگش
مەنمانا جە دوور چون بلوور ڕە نگش
پەراشەی پرشنگ ئەڵماس سەنگبڕ
خێزان مەڕێزان ڕێزان وێنەی دوڕ
ڕیشەی مانعش، لە ڕیشە بڕی
چاك كەرد گریبان سەرچەشمەش دڕی
نە وە ڕۆ ئارام نە شەو بی خاوش
تا بازکەرد مەجرای مەمبەع ئاوش
دەی سا وەك «فەرهاد» کەمەر شکاوا
یەئس حاسڵ نەکەرد وە مەتڵەب یاوا
ئەو مەردە مەردە پشتکارش بۆ
جای دەس دیاریو یادگارش بۆ
بار ڕاسی مەردان تاقەت کارە
شەخس بێتاقەت هەر باری لارە
ئەر ئاو وە نەرمی کار بکات بێدەنگ
سۆراخ مەکەرۆ سینەی سەخت سەنگ

جای سەد مەن گەندوم وە مەودای قوڵەنگ
دایـەر کـەردو کشت لە سـوٚراخ سـەنگ
دەوروبـەر چـەشمەش وا وەگـوڵ کـاڵان
بـی وە تـەفریگای نـازك نـەوهاڵان
ئـازیزان دەس دەس وە ئـارەزووی دڵ
مەشیان وە سەیران سەرچەشمەی پڕ گـوڵ
مـەویان وە زیـنەت زیب ئـارای گـوڵان
فـیشتەر بـی شـیوەن شـین بـوڵبوڵان
بـێ کـارە دایـم، کـاری خـراوە
لە نـاو ئـیجتماع، نـاوی بـەدناوە
سـفرەی کـارگەر دایـم پـڕنانە
بێ کـارە بـێ نـان هـەم بـێ ئـیمانە
دەسـمایەی بـێ کـار کـوێری و کـزی یە
ئـاخر بـێکاری دزی و حـیزی یە
بـێ تاقەت لە کـار کـاری خـراوە
بـێ کـارە کـاری هـەر نـاتەواوە
کـارگەر مـەحبووب، ئـەنزار خـەڵکە
بـێ کـارە گـوٚشتی تـاڵەو بـێ کـەڵکە
بـێ کـارە کـاری دایـم نـاقزە
خـوداوەن لە عـەبد بـێ کـار عـاجزە
کـارگەر داراو بـا کـارو کـەڵکە
بـێ کـارە کـاری سـەرباری خـەڵکە
کـارگەر سـاحێب مـیکنەت و مـاڵە
بـێ کـارە لات و شـووم شـەڕکاڵە

## هەندێ لە پێش بینیەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی»[1] هەر وا بووگەو هەر وا ئەوێت

خوشك‌و برای مەهابادی
گشت لێ بدەن تەپڵی شادی
کوڕو کەنیشك‌و ژن‌و پیاگ
هەڵ کەن بەیداخی ئازادی

★ ★ ★

بۆ ئازادی لە مافی ژین
بە یەکیەتی‌و بە هێزی تین
چ کاریگەر چ زارعین
تێ‌هەڵدە کەن مورتەجعین

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

ئێران وەکوو تەنوور ئەوێت
پڕ لە ئاگری سوور ئەوێت
بلادی فارس خاپوور ئەوێت
پڕ لە شین‌و شتوور ئەوێت

★ ★ ★

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم هونراوەیە لە ساڵی ١٣١٥ی هەتاوی گوتووە بەڵام بە داخەوە زۆربەی ئەم شێعرانە فەوتاون وە هەر ئەمەی لێ ماوەتەوە.

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

دەمێ دەورەی مەلاّ ئەوێت
ئێران پڕ لە بەلاّ ئەوێت
سەنگەر لە سەر قەلاّ ئەوێت
قەتڵ بە ناو «الله» ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

تا بێ تەقەی داس و چەکوش
گوێ شل مەکەو بگرەو بکوش
با بزانی غەیر لە ئەمە
باقی خشەس و مشەمش

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

جەنگی سێهەم شرووع ئەوێت
لە هندو چین وقووع ئەوێت
قەتعی تۆبەی نەسوح ئەوێت
شیوعی ساحێب فتووح ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

دەستێ‌ترە خەریك ئەوێت
ئیسلام لەوا شەریك ئەوێت
شەمع شەمعوون تاریك ئەوێت
ڕێی زندەگی باریك ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

مساواتی دایم ئەوێت
دەستی ئیسلام قایم ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
جەنگو غەوغا بەرپا ئەوێت
زڵم زاڵم کۆتا ئەوێت
دەست مەزڵووم باڵا ئەوێت

★ ★ ★

هەروا بووگەو هەروا ئەوێت
ئاخر ئەمر هەروا ئەوێت

ئـەگـەر دەربـێت شـێر لە بێشە
نـەڕویَو مـا ویَ[١] بـیَ ئەندێشە
وە قـولَەنگ بـیَ یـا وە تـێشە
ئـەشیَ بشکـێنین ئـەم پـێشە

★ ★ ★

هـەروا بـووگەوهەروا ئـەویَت
ئـاخر ئـەمر هـەروا ئـەویَت

★ ★ ★

## تاکە شێعر

تـاریخ دەوران، دنـیا بـخوێنین
دوژمن ئـەر شـێروێ، پشـتی بشکـێنین

★ ★ ★

چە تەحەولات، سـەخت ئـاماو ویـەرد
نامەرد گوَی مەردی، لە مـەیدان نـەبەرد

★ ★ ★

تاکەی دلْ وە مەیل، بێ مەیلیت ڕێش بوَ
مەبوَ چێش کەرِوَ، تەکـلیفش چـێش بـوَ

★ ★ ★

١- نێرومێ.

دەست هەوسار کەر، بۆکەر سەرت
نەوا کەناوێ، بکەفێتە بەرت

★ ★ ★

مورغ الفراق، هەر شەو وە تاقی
هەر تاق تاقشەن، حەق تاقەو باقی

★ ★ ★

بێ وە کرێوەی، زەمسهەریر سەرد
سەنگ مەبیا وە ئاو، ئاو مەویا وە بەرد

★ ★ ★

مەردانە وە شوێن، نامەرد نەکەفی
بە دڵ بێدار بەر، بە چاو ئەخەفی

★ ★ ★

بار زڵمو زۆر نەکێشین وە دۆش
نەکێشین قسەی ناحەساو وە گۆش

★ ★ ★

شاعێر چون ڕوستەم، مەیلش بۆ وە فەرد
مەکەرۆ هەزار، قولەی قاف وە گەرد

★ ★ ★

بێ وە ستارەی، سەعد ئێرانی
ئەر ئاخر نەبۆ، وە پەشیمانی

★ ★ ★

## ئافەرین

ئافەرین خاست، شکان پێشەی خوەت
تێشەی بەدنامیت، دا لە ڕیشەی خوەت
مادی و ڕیاییو، بێ وجدان بووگی
مەعلووم بۆ سوود خومت، بێ ئیمان بووگی
کەفتیە بازار، بەدیو گومڕایی
لە گەڵ چەند نەفەر، نە خوەت تەنیایی
خاس وادارتیان کرد، لە ڕیگەی ڕاسی
بردتیان بە ڕێی، خودا نەشناسی



## ئەر هەی ماڵ خراو

ئەر هەی ماڵ خراو، نعمەت زایەکەر
عومرت فانیە، فکر وێت بکەر
فکر وێت بکەر، ئەرهەی دێوانە
وەختێ خەبەر بێت، بچیت وە لانە
لانەی زڵماتی، پڕ خوٚفو خەتەر
هەر بچیت وە تێی، دی نایەی وە دەر



## کاڵی گوڵاڵەت

کاڵی گوڵاڵەت، یاخوا کاڵ نەوێت
شیرینی شێوەت، هەرگیز تاڵ نەوێت
کام ڕۆ لە دەور، دنیا باقی بی
سەرگەرم سەودای، بادەی ساقی بی
★ ★ ★

## خودا حافزت

کەسێ ئەر جە من بە دڵ ڕێشا بۆ
یا خۆ چەنی من ڕەنجی کێشا بۆ
گەردەنم ئازاد بکەران ئارۆ
گەر بە دڵ ڕوخسەت بدەران ئارۆ
خودا حافزت من شیم وە ڕاوە
دیدنی دیدار ها شیو بڕیاوە
★ ★ ★

## ئەی چەرخ

لە ڕاسی ئەی چەرخ، چەواشەی چەپگوون
عەیار حەفتڕاز، جادووی پڕئەفسوون

چێش واچوون چەنیت چەرخ چەپیواز
جادووی پڕئەفسوون عەیار حەفتڕاز
ڕاسیت چەنی کەس، تا سەر نەوەردەن
وەکام تەختو تاج، بازیت نەکەردەن
چێش مەبۆگەردش چەپت وە ڕاس بۆ
تا مەردان لە بەند نامەرد خەلاس بۆ



## تۆوێت کەر قازی

ئازیز مەرگ وێت، تۆ وێت کەر قازی
پەی زلّف یا ڕوخسار ئاوات مەوازی
بەدبەخت بای ئەگەر، پاسە بیت ڕازی
دلّ وێت نەدەری وە مای حجازی



## مەجنوون وە بێتۆ

مەجلس بێ بادەی، مەیلت خوەش نیەن
مەجنوون! وە بێ تۆ لەیلت خوەش نیەن
بادەی بێوادەی، ئەجەل نۆش کەردی
چون خەسرەو شیرین، فەرامۆش کەردی



## سەرێ چەنی تۆ

سەرێ چەنی تۆ، نەنالۆ شەوان
یا پایێ پەی لات، نەیۆ وە دەوان
ئەو سەر سەرنگوون، گڵ کۆی تازە بۆ
ئەو پا گەزەی مار، بێ ئیجازە بۆ
ئەو کەس نەکەرۆ، سەیران باغت
مەست نەبۆ بە سەیر، بەرزی دەماغت
دەست و پا بەستەی، جەلاد گەور بۆ
ئەو جە ئەو فێشتەر، سزاش سەد تەور بۆ



## تانە مەدەری

تانە مەدەری، لەی ڕۆزگارە
هەرگوڵ مەوێنی، پابەند خارە
توێچ یەك خارێكی، های لە پەڕەی گوڵ
دڵ گوڵ لە ئێش، نێشت مەدۆ چڵ



زمسان پیری، گەرمی مەیل سەرد کەرد
گەرمی و نەرمی دڵ هەر دووکەرد وە بەرد



## عەقڵ وەکەلەس

عـــەقڵ وەکـــەللەس نـــەك وە مـــەلایی
نــــان وە خـــوداس نـــەك وە فـــەلایی
★ ★ ★
خـــــــــودا بـــــــــدا ڕزق کـــــــەسێ
لە ئـــــاتای غـــــەیو بـــۆی ئـــەڕەسێ
خـــــــودا بـــــووڕێ ڕزق کـــــەسێ
چـــاوی ئـــەقوچێ‌و دەمـــی ئـــەوەسێ
★ ★ ★

## «لەیلا» فدای مەیل

«لەیلا» فدای مەیل، دڵـەی کـەیلت بـام
فدای سەردی ئاه، گـەرمی مـەیلت بـام
فـــدات بـام سـەوزەی، بـاوەفاو مـەیلم
وە مـــەیلم مـــەدام، جـە غـەمان کـەیلم
خەیلێوەن خەیاڵ، خـاڵت چـەنی غـەم
چـــۆقم مـەدەرۆ، شـەو تـا شـەفەق‌دەم
تـــا لە مـــەردومەك، دیـــدە بـــۆ نـوورم
بـــە دیـــن دیـــدار، دیـــدەت زەروورم
★ ★ ★

## سەوزەم، ئەسیرم

سەوزەم ئەسیرم، سەوزەم ئەسیرم
زانای وە چە تەور، بەردی ئەسیرم
وە چە زەنجیرێ، کەردی زەنجیرم
وە چە دامێ دای، تا مەحشەر گیرم
وە چە مەراقێ[1]، واکەردی پیرم
بەردی وەفاو مەیل، وەرین لە بیرم
★ ★ ★

## ئەگەر دوو دیدەت

ئەگەر دوو دیدەت، وە باز بنمانی
باز خجڵ مەبۆ، لە بازگەردانی
سیمای سوورەتش، مەغسەڵ دادە بۆ
پەی دڵڕبایی، دڵ ئامادە بۆ
دیدەش وە بادەی، مەی مەس کەردە بۆ
وە ناحەق قەتڵ، چەن کەس کەردە بۆ
لباس عسەزاش، لە بەر کەندە بۆ
زڵفش وە شەماڵ، شادی شەندە بۆ
★ ★ ★

---

١- تاسەو ئارەزوو، خەم‌وکوڵ.

## شەرت بۆ جە داخت

شەرت بۆ جە داخت، شۆخەکەی چاومەس
یەك نەونەمامێ، باوەرم وە دەس
بنیشووم لە ساش، وە ئارەزووی دڵ
بۆ بنیەم وە بۆی، زڵفش چون بولبوڵ
غەمخوار نازکێش، بنیشۆ وە لام
بەرئاوەرۆ خار، بێ مەیلیت لە پام
ڕاستە تۆ نازکێش، هەم نازارەنی
وەلێ بێ ڕەحم و، دڵئازارەنی



## هەندێ لە بیرەوەری یەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی»

«میرزا ئەحمەدی داواشی» لە شاری «پاوە» میوانی یەکێ لە دۆسانی دەبێ کە خێزانی ناوی «کەوکەو» دەبێ وە کاتی نیمەڕۆ خوەراکی کووکوویان بۆ ساز دەکا. «میرزا ئەحمەد» بۆ دەس خۆشانەو سپاس و ڕێزگرتنی ئەو خانمە فی‌البداهە ئەم شێعرانە دەڵێت:

یـا مـن پـیر بـووگم، نـەماگـە هـۆشم
یا سـەدای «کـەوکەو»، مـەیۆ نـەگـۆشم
ئەو کووکووی کۆکۆ، «کەوکەو» ئاوەردەن
وەشتەرەن جەکۆ، «کەو» کەواو کـەردەن



«میرزا ئەحمدی داواشی» ئەم شێعرەی لەوڵامی دەم چەپەڵی سـەرگوردێکی کورد سەپارەت بەگەلی کورد گوتووە.

خۆ کورد باوك کورد، باواگـەورە کـورد
ئێژی: کـورد کـەرە، جـەناب سـەرگورد
حەیفە ئەسڵ خوەت، بەرداگـە لە دەس
بـووگی وە نـۆکـەر، بـێگانەی تـەرەس
هەر خوەت چەپەڵی، سەرتاپا هەر نەنگ
نیە هیچ گـەلێ، وەك کـورد بـافەرهەنگ



- «میرزا ئەحمەد» ئەم شێعرەی بە کەسێکدا وتووە کە بێ شارەزایـیو زانسـتی دینی بۆ خەڵك فتوای شەرعی داوە:

نـــە مــــەلاو نــــە نـیمەمەلا
بـــــــێ‌سەوادو دەم بـــــەرەلا

بــۆ گــیان مــەردم بــویتە بەڵا
دەروون مەفرەق ڕووکــەش تــەڵا

بـــەسە ئـــیتر دەمت بــوەس
فــتوا مــەدە لە ڕووی هــەوەس



«میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم دوو بەیتە شێعرەی کاتی ماڵ ئاوایی لە یەکێ لە دۆسانی خۆشەویسی دەڵێت:

حــوکم حــاکــمەن، مــەرگ مــوفاجات
ڕازیم وە مەردەن، نەك دوور بام جە لات

وە مەجبوور بەرووم، ڕووی وێم وە ڕاوە
مــەیلت مــەکــێشۆ، پــام وە دمــاوە



«میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم چەند شێعرەی لە وڵامی «سازنە» یەکدا گوتووە کە بێ ئیحترامی کردووە.

من ئەگــەر کــوڕم، خــۆ خــوەم ئــەنوێنم
دەوڵــەکــەت ئــەدڕم، ســازت ئــەشکێنم

وەك بـــەردو ئـــاسیاو، ئــەچنم نـــیقت
زەنگ ئـــەدەم ســـازت، ئـــەوڕم پـیقت

لە جـــیایی ئـــەنعام، کـــراس و کـەوات
ســـەرە گـــەورەکـــەی، ئـــەوڕمە دوات



ڕۆژێ لە ڕۆژان «میرزا ئەحمەدی داواشی» بە دەعوەتی سەردارێکی «باوەجانی» لەگەڵ قوێخایەکدا بەسواری دوو ئەسپ دەڕۆن بۆ گوندی «میرئاوا» کاتێ دەگەنە بەر ماڵی ئەو میرە «ناڵبەند» خەریکی ناڵ کردنی ئەسپی ئەمیردەبێ. سەردار بە ئەو پەڕی ڕێز و خۆشحاڵی‌وە لە «میرزا ئەحمەد» ئیستیقباڵ دەکا و ئەڵێ، پێم خۆشە لەم حاڵەدا شێعریکمان بۆ بفەرمووی. «میرزا ئەحمە»دیش گورج ئەم تاکە شێعرە بەیان‌دکا:

گەرەکتە ئێمە لە خۆت خوەشحاڵ کەیت

ئەشێ ئەسپ من‌و ئەم قوێخاناڵ کەیت



ڕۆژێ شاعێرێ بە «میرزا ئەحمەد» ئەڵێ:

ڕێزە ڕێزەت کەم، وەك ڕیزەی کاشی

خاست ئەناسم، «ئەحمەد داواشی»

«میرزا ئەحمەد» لە جوابی‌دا ئەڵێ:

مەنقووشەن وەك نەقش، دانەی نەقاشی

بەڵێ پێم ئێژن: «ئەحمەد داواشی»

باوك من داواشی‌و، کار بە دەس نۆدێ‌و

ئەمە کوڵۆیە قەن، ناو باوك تۆ کێ‌و؟

هیچ مەنعت ناکەم، لێت ناگرم تاوان

کێ قسەی گرتگە، لە بەچکە گاوان[1]

---

١- ناوی باوکی ئەو دوو شاعێرە «حەمە گاوان» بوود.

دەمت برك ئەدەی، هیچ نیەن باكت

نانەكەی باوكت، ئەنێمە چاكت

پەلامت تیَدەم، وەك پلنگ پرجۆش

ناگەیەتە دادتا، هەزار «ئازەرنۆش»[١]

كابرای شاعیر دەڵێ: باكاكەیشم بێرم، «میرزا ئەحمەد» ئەڵێ:

مەر ئەمە بازار، خەڕاتو دۆمە

كاكەیشت بێری، بۆ گەلەكۆمە



ڕۆژێك هونەرێك بۆ تاقی كردنەوەی «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم موعەممایە بۆ دەنێرێ:

وەسفێم مەنزوورەن، دانای سوخەن سەنج

ئەوەڵ حەرفش نۆ، ئاخر حەرفش پەنج



وڵامی میرزا ئەحمەدی داواشی:

ئەو كەس تۆ جەرگت، بە موژەش هەلارە

حەسابش نە سی، حەرفش چوارە

وەك سەرحەدداران، جە شاهان یاخی

هەرهای لە هەوەس، قاپی و قاچاخی

وێت مەخفی كەردەن، جە پەنای پەردە

وە ڕۆژا عابد، وە شەوا جەردە

١- ناوی ئەندازیاری جادە سازیەكە بووە.



ڕۆژێ «فاتمە» خانم هامسەری «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەڵێت تۆ ئەم هەموو شێعرانە بۆ خەڵك دەڵێت بۆچی شێعرێکیش لە وەسفی من ناڵێت «میرزا ئەحمەد»یش ئەم چەند بەیتە لە وڵامیا دەڵێت:

شەماڵ دەخیلەن، وە یاد جاران
سەرێ بکێشە، وە «کانی خەیران»

دوور وە دوور، سیمای «فاتە» ئەوینی
هۆشت بێ شەماڵ، مل خوەت نەشکێنی

فریت نەدا، وەو خاڵو لێوە
بترسە ڕاکە، ژن نیە دێوە

پاشان فاتمە خانم ئەڵێ: خۆزگە نەمدەگوت شێعرم بۆ بڵێی «میرزا ئەحمەد» ئەڵێ: خانم خەجاڵەت بە خۆم شێعر بە قەوارەی خاوەنیا دێت.



«میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم چەن شێعرەی بۆ خانێ زۆرکار نووساوە بەڵام بەداخەوە زۆر بەی ئەم شێعرەفەوتاوە

## ئاغەی ماڵ وێران

ئاغەی ماڵ وێران ژن'وە زۆرەکە
لە ماڵ دەرکریاگ حاڵ ناجۆرەکە

هەی لە شەلیل[1] شڕ پاڵوو دڕیاگی
لە بەرەك و ژێرزك، شۆڕ و بڕیاگی
ساختمان نەوساز سەدساڵ لەمەوبەر
نە دەروازەی هەس نە دەر نە پەیکەر
مەنزڵگای دەڵ و تڵ و تانجیە
سەگ تیا بخەفێ ناحەلانجیە
ماشینێکی هەس مودل سیوشەشە
خاسە بۆ شۆرەت دڵی پێ خوەشە
گازی بەرعەکسە بۆ فەرمان بڕین
بۆقی نەماگە مەگەر وە تڕین
دفرنسیاڵ خراو گیربوکسی لارە
وە بۆق ڕێ ئەکا سوح تا ئێوارە
موتری داغانە وە ڕوغەن سووزی
شاری کەڕ کردگە شیرەی ئەکسووزی
چوار لاسیکی هەس بووگن وە هەسان
بۆ پەنچەرگیری هە رئان هان لەشان
لە یەك دەسەناز فەنەر ئەشکێنێ
گاوێ ڕێ بکا سێ شەو ئەمێنێ
هەرتا گازی دا چوار دەری بازە
ئێژی داڵێکە خەریك پەروازە
هەرکەس نەیدیگە نازانێ چۆنە
ماشین خان بوگە قورازە کۆنە

---

١- پاڵتاو ـ لیباسی شۆڕ.

خـان تـف لە سـەرو دەس و گـۆچانت
بـێفەڕ چـەفتەچەفت نـاو خـەیاوانت

★ ★ ★

## بەهار

هـامدەردو هـام فـەرد، ڕۆزگـارەکـەم
پەرسا بیت چـوونەن، نـەوبەهارەکـەم[1]
یـاوا پـێم نـامەی، وەش بـۆی بـەهاریت
دوڕومـەرجـان و، لەعـل و مـرواریت
حـەقیقەت ئـوستاد، نـەقاشیت کـەردەن
وەشتەر لە بـەهار، گـوڵپاشیت کـەردەن
وەش بای وەش نـامەی، کـیاستی وە لام
هەی وێم وە سەرگەرد، نێش خامەت بام!
مـەڵهەم بـێ پـەی دەرد، زامـان کـاری
زام سـارێش کـەردی، پـەی یـادگاری
لە دڵ نـێش خـار، غـەم بـەر ئـاوەردی
هەی یـادت وە خـەیر، وا یـادم کـەردی!
سـوڵتان بـەهار، زیـبای زەڕین ڕەخت
خاستر لە جاران، قەرارگەرت لە تەخت

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی لە جواوی نامەی مەلا «محی‌الدین صالحی» نووسیوە.

مــەئمور تــاین کــەرد، بەشەب و ڕۆدا
خەڵاتبەخشان کەرد، وە کـەش و کـۆدا
ڕەنگین کەرد بە ڕەنگ، ڕەنگامەی ڕەنگین
خـاس‌تر لە دێـبای، ڕۆم و هـند و چـین
سـپای گـوڵاڵان، پـۆشان ڕووی زەمـین
بەهار دونیاش کـەرد، وە ڕەوزەی بـەرین
ئەوەڵ «گـوڵ نـەورۆز»، بـەرمەیۆ وە بـەر
ڕەنگینەن چون ڕەنگ، خاڵ ڕووی دڵـبەر
دێـبای ئـەڵوانش، پـۆشا کـەرد وە بـەر
ئابی و ئەزرەقی و ئـەحمەری و ئـەخزەر
«بەڕەزا» لە ڕووی، خـار ئـاخێز کـەردەن
چون زوڵف شۆخان، سەرپەل دێز کەردەن
شـیرین‌تەر لە زوڵـف، کـۆرپە کناچان
تـازەو تـەڕ لە بـان، گـۆنای گـوڵ پـاچان
«بەنەفشە» لە تۆی، چەمەن بـەردەن چـیم
دێـمای دیـمشەن، وە شـنوێ نـەسیم
تماشاش وەشـەن، هـەر شـام و سـەحەر
مەدرەوشۆ چـون خـاڵ، ژێـر لێـو دڵـبەر
«نەرگس» چون دیـدەی، نـزاکـەت داران
مـەخموور و مِـەستەن، سـەبا و ئـێواران
«شەوبۆ» لە «شـاهۆ»، سـەرکێشان ئـەوبەر
بەهار گوڵ ڕێـزان، کـەردەن دەشت و دەر
ڕەونـەق دان «زەمـەق»، لە سـەر مـەزاران
کەچەن چون سەروێن، شای شـەدەلاران

«لاڵــە» و «هــەڵاڵە»، وە نــاز مــەخێزۆ
چون دیـدەی عـاشق، سـەیلات مـەڕێزۆ
غونچەی نەشکوفتەی سۆسەن دان جلووس
شیرین چون بوتەی، مەمکەی نەوعەرووس
«ڕێــواس» چـون بـاڵای، بـەرز ئـازیزان
ئــاخێز کــەرد وە نــاز، خـێزا لە ڕێـزان
«چنوور» چەپەی گوڵ، وێش کەرد وە سەردا
عــەتر ئـەفشانیشەن، وە دەشت و دەردا
گــوڵ بــاغان لە بـاغ، شکـۆفان بـێ‌غەم
بە نـاز بـاز کـەردەن، پـەی بـولبولان دەم
«کەوکەبی» «گوڵ ڕوز» «سەرو»و «یاسەمەن»
چەمەن خوەش لە بۆی یاس‌و «نەستەرەن»
«شــەقایق» بـە نـاز بـاز بـە سـەد تـەرزە
ئـــاوەردش چـــنار چـــەمەن وە لەرزە
«خەتمی» «خاتەمی» «خادەمی» «ئەتڵەس»
فەرش کەردەن چەمەن چین‌چین‌و دەس‌دەس
«بـەهار» واڕێـزا و، خـێزا و ئـاخێز کـەرد
دەشت و دەر و ماڵ لە، گوڵ لەبڕێز کـەرد
«کەڵان» خەلاس کەرد، جە بـەند زیـندان
بـــە لوتــف بــاری، پــادشای یــەزدان
کـــڵاو وە کــڵاو، بــەرزی وە بــەرزی
بگــێڵۆن وە ســۆز، پـەی کـەڵە هـەرزی
تـــەتاران پـــەنای، ئـەو وەرمـــەغاران
بـێ خـۆف‌و خـەیاڵ، جـە مـیر شکـاران

«کەوك» پا نەخشین، سوبح جە سای کەمەر
قنیات وە غونچەی، نەشکوفتەی سەحەر
چون سەمتوور ساز، سەداش سەد تەرزەن
ئاوازش نە پای، کۆساران بەرزەن
هاژەو قیژو قاز ژ رووی کەمەردا
پەرواز وە دڵواز وە دەشتو دەردا
«ڕەشۆڵە» سەرشار وە پاسارەوە
بەو سەوت نەوای نەوبەهارەوە
چەهچەی «پەرەستوو» بە ڕەسم ساڵان
بەرزەن جە یانەی ویشان جە ماڵان
زیڕ زاڕ «تەیر» پەڕندەی پڕباڵ
مەحزوونی دارۆ پەرێ ئەهل حاڵ
ماباقی مەلان چەنی «کەبووتەر»
جە بەند زندان ئستخلاس یەكسەر
«هود هود» تاج شەوق شادی نە فەرقەن
سەرتاپا وە بەرگ تەڵایی غەرقەن
چەکاچاك «چەرخ» چریکەی «شایەن»
هەر یەك پەی شکار ویشان بین تایەن
«ترمتە» و «واشە» و «باڵەوان» و «باز»
شکار مەکەردن بە چەنگاڵو گاز
«شێر»ان سەرەفراز «پەڵەنگان» خوەش ڕەنگ
جە شۆن شکار مەگێلان بێ دەنگ
«تەیر»و «تەوار»و باڵدارو بێ باڵ
باڵ بەر ئاوەردەن هەر یەك وە یەك حاڵ

بـەنا بـە خـاتر شـای نـەو بـەهاری
ئـامان بـە سـامان گـوڵو گـوڵ کـاری
وە هـەور ڕەحـمەت وە بـادو بـاران
ڕەونـەق دا بـە ڕەنگ قـولەی کـۆساران
گا هەورو گـا بـاد گـا خـوەرو گـا وەشت
قـەوس‌وقەزەح دان لە دایـەرەی دەشت
وە نـاز بـەر مـەیۆ سـادە سـەیاران
سـەفا مـەبەخشۆ بـە دیـدەی یـاران
ئەوەڵ بەر مەیۆ «گوڵ نەورۆز» چە خـاك
بە وێنەی «مەجنوون» بەرگ بەدەن چـاك
دوەم «بـەنەفشە» جـە سـەحن بـاغان
بـەر ئـاما پەی سـەیر بـوڵەند دەمـاغان
«بـەڕەزا»ی بـەرزان وا بـی ئـاوێزان
دەسـتەی زڵـف دێـز ئـازیزان بـێزان
«سۆسەن» وێـنەی خـاڵ نـازك نـەوهاڵان
مەدرەوشۆ نـە جـەمع جـومڵەی گـوڵاڵان
بەرپا بی خەیمەی خـەرگای «یـاسەمەن»
فەزاش پەی سەیرو سەفاش پەی چـەمەن
«نەرگس» وێنەی چەم مەست مەی‌خواران
مـەستو خـومارەن سـوبحو ئـێواران
«لەولاو» لوولیـان لوول دان وە هـەمدا
چـون زڵـف ئـازیز چـەن پـیچو خـەمدا
«لەولاو» لوول وەردەن نە ڕووی قەسرەوە
هـەر هـا وە خـەیاڵ سـوبح و عـەسرەوە

بـــەهار چـون ساقی، گـوڵ چـون پیاڵە
«شەونم» چون قەترەی، مەی لە «هـەڵاڵە»
وە بـــــەهای گـــیان، دڵــدار مـــەفرۆشا
گـــیان مـــەدا وە مـەیل، بـوڵبوڵ مـەنۆشا
«چـــنوور» چـــەم وەردەن، وە ڕاخـانەوە
«عـــەنبەر» وست وە کـــاو، ئـــێڵاخانەوە
«بید» چەنی «چنار» سەر کێشان وە ئەوج
وە شـنۆی نـەسیم وە هـەم مـەدان مـەوج
«گـــردو»ان گـــردین شـــانان شـاخشان
فەرش کـەردەن چـەمەن وە سـاچاخشان
«چـــــناران» وەردەن، چـــەم وە چـــەمەدا
چـــەم مـەدان مـەدام، وە ڕووی چـەمەدا
«یاسەمەن» سیمای، سیمین وە تەن کەرد
وێش وە ســـتارەی، تـاك چـەمەن کـەرد
درەخـــتان جـــە نـۆ، جـام مـەی نـۆشان
جە سەر تا وە پـا، بـەرگ سـەوز پـۆشان
«بـوڵبوڵ» جـە شـادی، مـەوانـا ئـەشعار
مـەوات: وەش ئـامای، فـەسڵ نـەوبەهار
ڕازنــــای گـــــوڵان، بـــە ڕەزاو مـــەیلم
مـەدهۆشم لە بـۆی، عـەترش، دڵ کـەیلم
شکـــــۆفە کـــــەنی، بـــە ڕووی نـــازەوە
نـــــەوازا بـــــوڵبوڵ، بـــە ڕووی بـــازەوە
ئامادە کـەردمن، دەهـەن، غـونچەی گـوڵ
بە نـاز کـەرۆ واز، پـەی بـۆسەی بـوڵبوڵ

چـەمەن بـەستەن دەیـر، بـەهار لە بـاخان
شکـۆفە کـەردەن، شـاخان چـراخـان
«سێف» کێشا وە سـەر، بـرقەی گـوڵناری
جـوقە[1]دان بـە وێش، پـەرێ دیـاری
تەل کێشان «مێوان»، چون هـەردە جـاران
خـەیاتەش لوولدا، چـون زوڵـف یـاران
«بەی» و «هەڵووچە» و «شێلانە» و «گێلاس»
نیاشان وە سـەر، جـوقەی تـاج ئـەڵماس
«قۆخ» دێبای حەریر، دوارە کـەرد لە وەر
مـا بـاقی داران، مـدران وەرانوەر
دار «ئـەنار» بـرقەی ئـاقیقی لە سـەر
چـون لەب و ڕوخسـار شـۆخان دڵـبەر
بـەهار ئـیمساڵ، «حسب‌المـرام» بـێ
چـەمەن پـڕلە گـوڵ، دڵ پـێش ئـارام بـێ
«ئـەحمەد» وە قـوربان، شـەق خـامەتەن
هـەر ئـان مـونتەزیر، ئـامای نـامەتەن
«ئەحمەد» ڕاست ماچی وەشەن نەوبەهار
وەلێ بـۆ کـەسێ نـە دڵ نـەبۆش خـار



١- تانج.

## بەرزە چناریٚ

بەرزە چناریٚ، بەرزە چناریٚ
لە «بەرزە»[1] ها دیم، بەرزە چناریٚ
سیمای سیمین تەن، سیمین عوزاریٚ
گوڵیٚوا نەویەن، لە هیچ گوڵزاریٚ
نازك و نازار، قەمەر تەلعەتیٚ
شەکەر گفتار و شیرین لوعبەتیٚ
ماە مشکین پۆش، زڵفان موشکینیٚ
موشك ئەفشان نە دەور، جام جەمینیٚ
سەر و سەراویٚ، سەوڵ چەمەنیٚ
ئاهووی[2] بیٚ ئاهووی[3]، سەحرای خوەتەنیٚ
قامەت قیامەت، قەمەر ڕوخساریٚ
نازك و نازار، نزاکەتداریٚ
خونچەی گوڵباخچەی، تازە ڕەسیدٚە
شکۆفەی شیرین، شەونم چەشیدٚە
هیٚمان خاس مەزەی، عەشقش نەچەشتەن
تازە نوور عەشق، وە ڕووشا وەشتەن
کەو بی، کۆتر بی، تەیر بی، تەوار بی
چەرخ بی، شاهیٚن بی، باز بی، شکار بی

١- ناوی لا دیٚیەکی «قەڵخانی»، کەهاو سنوورەلە گەڵ «باوە جانی».
٢- ئاسك، خەزاڵ.
٣- بیٚ عەیب.

با مار گیسووش، مەشغوڵ بازیش بی
چون تورکان نە تەرك، تیرەنازیش بی
لە گیان ویەردم، هەواڵ لێش پەرسام
لە تیرەنازی، تورکان نەتەرسام
بە وێنەی مەجنوون، لە غەم کەیلەوە
تەکم دا وە لای، لەیل وە مەیلەوە
واتم: ئەی سەوزەی سەفای سەرکانی
ڕەشتەی لەقای حەق، حەیی سوبحانی
سەرو کام چەمەن؟ سێف کام باغی؟
پەروەردەی کام شاخ، بوڵەن دەماغی؟
سەوزەی کام سەحرای؟ گوڵ کام گوڵشەنی؟
بە دیدە و بە دڵ، مەدەی ڕەوشەنی
بەت کام شەتی؟ سۆنەی کام تافی؟
سیمورغ کام خان؟ حەفت قولەی قافی؟
نازارم! بە ناز، چەنیم نازکەرە
بە ناز قاپی ناز، لە ڕووم بازکەرە
نەشەم کەر وە شەهد، شیرەی کەلامت
بفەرما چێشەن، شۆرەت و نامت؟
خەرمان گیسووی، موشکین وست وە دۆش
شیرین چون شیرین، شۆخ شەکەر نۆش
بەر ئاما بە ناز، لە پەردەی شەرمێ
ڕێزنا ڕازان بە نەرمە نەرمێ
بێ دەنگ، وە دەنگێ، دایۆ جواوم
کام دەنگ، وە بێ دەنگ، کردی کەواوم

وات: نـــامم «قــەمەر»، نــازکێش نـــازم
بـــاز شکـــارکـــەرۆ، دیـــدەی شـــابازم
«چـــنار»، «چـــنارم»، ئـامام وە «بـەرزە»
«بـــەرزە» لە بـــەرزیم، ئـــامان وە لەرزە
«ئەحمەد»! چون «چنار»، تەن وە لەرزەوە
لەرزانـەن وە بـای، بـەرزی «بـەرزەوە»[1]



## سیاپۆش

ســـــیاپۆشەکـــــەم، ســـــیاپۆشەکـــــەم
وەش ئامای ئـەی مـای[2]، سیاپۆشەکـەم
شـــۆخم شـــیرینم، شـــەکـــەرنۆشەکـــەم
چون شـەکـەر وە شیر، تـازە جـۆشەکـەم
گوڵ بۆی گـوڵ ئـەندام، گـوڵ فـرۆشەکـەم
نـــەشتەر دای لە زام، تـــازە جـــۆشەکـــەم
زەحـــــاك زاڵـــم، مـــار نـــە دۆشـــەکـــەم
بـــۆ قـــەتڵ نـاحەق، مەزڵووم کـۆشەکـەم
گـــۆشوارەی تـەڵای، زەرد نـە گـۆشەکـەم
نـــیای بـــار مـــەیل، وێت لە دۆشـــەکـــەم

---

١- ناوی ئاوایی‌یەکە لە «قەڵخانی» وە هاو پەڕەی «باوە جانیە».
٢- مانگ.

«کرماشان» بە نوور، وێت ڕوخشان کەردی
چرای بەرق و تۆڕ، پەرێشان کەردی
بازاڕش واگەرم، پڕ گەوهەر کەردی
بەخش و مەحاڵش مونەوەر کەردی
«فەیز ئاباد» جە فەیز، فەزات ڕوخشانەن
وە هەر جاش مەدیای، گشت درەخشانەن
«سیلوو» «سەر ئاسیاو»، «مە لامیرانی»
جە ئامات پۆشان، دێبای عەمرانی
«پشت بەدەنە»[1] تا «بەرزە دەماغ»
«سێ ڕای پەهلەوی» تا «دامەنەی باغ»
دریان بە جەلای ڕەنگ و ڕووت پەرداخ
هەرکەس مەوێنۆت، هەر مەکێشۆ ئاخ
«سەراو» سەرچەشمەی، سەراوش جۆشان
«کۆ سفید» دێبای، سفیدی پۆشان
«پەڕاو» پەڕ تا پەڕ، پەڕفشانیشەن
هەر پەڕێ دووسەد، پەڕ نیشانیشەن
«بێستوون» وە یاد، «فەرهاد» دیرین
پۆشا پەردەی تەم، جەداخ «شیرین»
«ئەشکەفت» و «بەلووچ» «هوڵ هوڵ» و «هەژدەر»
هەر یەکێ یەك تانج زەڕ نیان وە سەر
«خوڕیلە» و «خورێن»، فارغ لە غەم بی
«چاڵاوە» و «گاچاڵ»، سەبز و خوڕەم بی

١- ناوی مەحاڵ و کێوەکان لەم هۆنراوەدا هی کرماشانە.

تـاقۆسان جـەنۆ، بـەزم خـوسرەو بـەست
غولآمان سف سف، کەنیزان دەست دەست
«نـەکـیسا» بـە نـەزم، نـەوای عـەنبەرین
بێدار کەرد «خـوسرەو»، لە عـەشق شـیرین
«بـارابـود» مـەدا، موژدەی ئـامای ئـەو
شـۆر شـیرین وست، لە قـەلب خـەسرەو
خوسرەو لە شادی، غەرق لە شەوق شـوور
شکۆفا چون گوڵ، فەرماش: بـە «شـاپوور»
ئـیمشەو شـیرینم، خـەیاڵش کـەردەن
گـیسووی کـەمەندش، وستەن وەگـەردەن
کـەڵکەڵەی کـۆکـەن، یـا «پـەرویز» شـەن
وە «شـەو دێـزەوە» و ڕسـتاخیزشەن
یـا هـەواڵ مـەرگ، کـۆکـەن شنەفتەن
ئاشوفتەن «شاپوور»، «شـیرین» نـەسرەفتەن
«شاپوور» نە جای من، عوزرخـوایش کـەر
خـاستەر نـە جـاران، پـەزێرایش کـەر
«نـەکـیسا» نـەزمێ بـە دڵ خـوایی ئـەو
«بـارابـود» بـەزمێ، خـوەش ئـامایی ئـەو
کـەنیزان هـەر وەك، مـەهو مـەهپارە
سـەف بـدەن لە دەور، ئـەو چـون ستارە
وێت بـەر بـە سـاقی، سـۆز و گـودازش
«شـاپوور» شـیرینەن، بکـێشی نـازش
مـەبادا شـادی و شـەوقش بـەتاڵ بـۆ
شـیرینم ئـەوقات، شـیرینش تـاڵ بـۆ

«تیمچە» و «چەنانی»، وە گوڵگەشت کەردی
«کرماشان» یەکشان، وە بەهەشت کەردی
باش بالآدەس، جومڵەی مەهوەشان
هەر لە «کوردسان» تاوە «کرماشان»
قەدەم وە قەدەم، پڕجە گوڵ کەردی
جەمین جام «جەهان»،[1] وە مەنزڵ کەردی
نور وەشت لە سەر، قاپی نمرەی هەشت
وەشت و نیشان دای، هەشت قاپی بەهەشت
جەمینت چون جام، جەم نمای جەمەن
خورشید لە شێوەی، شەوقت ماتەمەن
ماه مەعزوور لە ڕووی، ماه ڕوخسارت
شەکەر شەرمەندەی، شیرەی گفتارت
نەرگس و سۆسەن، سەر ئەفگەندەتەن
«لوولووپەڕ» مەلوول، لەب پڕ خەندەتەن
گوڵباغی بێ ڕەنگ، گۆنای گوڵناریت
مرواری پەشێو، دانەی مرواریت
عاقیق بۆ لەعل، لێوت خجڵەن
سێف بۆ سێف زنج، داغش لە دڵەن
گەرگەرەی گەردەن، بلوور بێ گەرد
مینای مەی پەرێش، سەر مەدۆ وە بەرد
نارنگی جە لای، نارنگی مەمان
نەوێنیش ئامان، ئامان وە ئامان

---

١- مەبەست مێوان خانەی «جەهان» لە «کرماشان».

سوورەت سیمای ساف، چون ئاو حەیات
مەوج مەدۆ چەنی، تاریکەی زوڵمات
بوتەی ناف چون گوڵ غونچەی نیلووفەڕ
شکوفتە و نیمباز، وە عەتر خوەی تەڕ
یا ناف ئاهووی، سەحرای خوەتەن خێز
چون خوەتەن وەتەن، کەردەن موشك ڕێز
«کرماشان» لە بۆی، زوڵف تۆ یەكدەس
تا مەحشەر کەفتەن، مەس لە بان مەس
لە رووی قورس مای، ڕووی چەن عەقرەبەن
خوێنی کورد و فارس، تورك و عەرەبەن
دوو هیلال وە بان، بەدر کاملّدا
دەرس مەجنوویش، وە چەن عاقلّدا
موژەی خەدەنگ خۆی، ڕیشەی جگەرکاو
ئەر وە شەست ناز، بیدەی لە «پەڕاو»
«بێستوون» چەنیش، پەڕتا پەڕ تەواو
مەدۆزۆو سۆزۆو، مەکەرۆش وە ئاو
ئاخر چۆن نەدۆ، خودا مەرگ من
هەر ئان مەدەی سەد، تیر لە جەرگ من
کوشی[1]، مەبەخشی، هەر چێ سەلاتەن
«ئەحمەد» تا مەحشەر گیان بە فداتەن
بەو سولسولەی زلف، سیات زەنجیرەن
تا مەحشەر زەلیل، زام ئەو تیرەن

---

١- نەکوژی.

# ئازیزم مەیلم

ئــــازیزم مـــــەیلم، ئــــازیزم مـــــەیلم
چــە نــۆ تــازە بـی، جـە لای تـۆ مـەیلم
جــۆش ئــاوەرد دلەی، ژ خـــەمان کـەیلم
جاریەن هـەر شـەو، جـۆی ئـەسر سـەیلم
بەوێنەی مەجنوون، مەحرووم کەفتەی لەیل
هەر لەیل لەیلمەن، جە هـەردەی دوجـەیل
سا تۆیچ بۆ چون لەیل، سەوزەی سۆسەن خاڵ
تــــاڵێ زلـــفەکـەت بـدەر وە شـــەماڵ
پـــەی ســاکـــنی دەرد، شــفای ئیش زام
چـــــەنی نـــەسیمش، بـاوەرووش وە لام
وەشـــــەن ئـــەر شـــەماڵ، بـــەیۆ وە ڕاوە
چـــە تــایە ژ زلــف، تــۆش هـان وە لاوە
وە مـــەرگت قـەسەم، شـەکـەر ڕێـزەی ڕاز
جـــەو دەم ئـــەرواحـــم، مـەشۆ وە پـێشواز
ڕازیـــمەن نـــە ڕای تـای گـیسووی دڵـبەر
نـــە جـــای مــزگانیش بـدەم گـیانو سـەر
پـــەی چـی ڕێـزەی ڕاز نـازت دڵ پـاچان
ئــەر بــۆ فــدات بـام، شـەهیدم مـاچان
ئــەحیانەن ئــازیز، ئــەگــەر من مـەردم
گـیان جـە ڕای تـوغرای، زلـفت سـپەردم

ئــــەمجا ژەو دەمـــــدا، شـــۆخ نـــازارم
تــەشریف بــار وە پــای، سـەنگ مـەزارم
وە حــــــەسرەتەوە، نــۆ نـەمامەی نـۆم
پـــــەنجەت بــــماڵە، وە خـــاك گـڵكۆم
ئـــــەمانەت فـــــەرزەن، شـــۆخ شـــیرینم
مـقرازگـازەکـەت، شـی کـەر پـەی شـینم
پەخش کەر چون رەیحان، زڵفت لە دەورم
دەر سـاعەت مـەبۆ، وە بـەهەشت قـەورم
لە جـاگــەی تـەڵقین، سـوورەی یـاسینم
بــــــملاوێنەوە، ئـــــیمان و دیــــنم
دەم بـنیەر وە بـان، گـڵکۆی تـازەکـەم
واچـــــە هــەی شــەهید،! تـیرنازەکـەم
واچە هـەی مـەجنوون حـاڵ پـەشێوەکـەم
هــــیجران کـێش دەرد خـــاڵ لێـوەکـەم
پـــێکیای پــەیکان، مــوژەی تـیرەکــەم
مـەقتووڵ نـاحەق، بـێ تـەقسیرەکـەم
مەست بادەی مەی، لەبچـەش نـەکـەردە
بـــەسێ حــەسرەتان، وە گــڵکۆ بــەردە
ســەرهۆر دەر مـن لەیـل، خـاترخـوارتـم
زام بــە سـۆ کـەفتەی، پــای مـەزارتـم
بــدیە مــن پــەی تــۆ جـەرگم پـڕنێشەن
وە نــاخوون سـێف، ڕوخســارم ڕێشەن
ئـــەوسا نــەپەرسام، چـێشەن ئــازارت
ئـــیسە مـــەناڵووم، لە پــای مـەزارت

ئـــەرچـــی بیٚ سـووە، لەی سـەروەختەدا
زاری کـــەیت وە بـــان، خـــار ســـەختەدا
وەلیٚ بـــۆ وە یـــاد، ویــەردەی وەریـــن
نـــە چـــەمان مـــەست، بـــڕێزە ئـــەسرین
بەڵ قەترەی ئەسرت، بگنۆ[1] وە ڕووی خاك
وە حـــــەسرەتەوە، خـــاك کـــەرۆ نـــمناك
جـــەو دەم پـەی مـەڵهەم، زامـان خـەستەم
وە گـــــڵکۆوەوە، مـــەگـــنۆ وە جـــەستەم
بـــە وێـــنەی ئـەنفاس، مـەسیحای مـەریەم
ئـــەحیام مـــەکـەرۆ، قـەترەی ئـەسر چـەم
وە ئـــیلا «ئـەحمەد» بـە دڵ مـەردەی تـۆن
تا مەحشـەر سەوزەم ئیمان هەردەی تۆن[2]



١- بکەوێ.
٢- وەسیەت نامەی «میرزا ئەحمەد» بۆ نگار لەپاش مردن.

## دیدەم لە دووریت

دیـــدەم لە دووریت، تـــاقەتم تـــاقەن
دڵ نـــە گـــێج مـەوج، دەریـای فـیراقـەن
مـــێهر مـــەیلت وا، جـــاگـــیرەن لە دڵ
لە یـــادت نـــیەن، ئـــانێ دڵ غـــافڵ
هەناسەم چون دووی، «دەماوەن»[1] دەم دەم
مـــەخێزۆ دەم دەم، لە دەم وێـــنەی تـــەم
لە شـــالوولەی عـەشق، گـاز ئـاتەش‌خێز
ســـارا ســـووزانـــەن، ســـەما تـەم‌ئەنگێز
بـــڵێسەم بـــەرزەن، وە بـــەرزی بـــاڵات
چـــوونەن بـۆی بـۆسۆم، نیاوان وە لات
دڵ دایم لە تۆی، مەکتەب‌خانەی عـەشق
خەت ئەبرۆی تۆ، کەردەن وە سـەرمەشق
وە نـێش مـــوژەی، تـێژت چـون قـەڵەم
وە هـــووناو جـــەرگ، مـــەکـەرۆ ڕەقـەم
لە ئارەزۆی دین، دیدەت بـەی مـەزموون
ئـــینشا مـــەکـەرۆ، وە هـووناو هـوون[2]
وە ســـیخ مـوژەت، سـۆراخـەن جـەرگم
زووخاو مـەیۆ لێش، تـا بـە ڕۆی مـەرگم

۱- قولەیەکی ئاگر ڕێژە لە نزیکی «تاران» کە ئیستە خامۆشە وە جار جار تەم‌و دووکەڵی لێ هەڵ دەسێ.
۲- «میرزا ئەحمەد» مسراعی دوەمی ئەم بەیتەی وەهایش هاوردوە:
لە ئارەزووی دین دیدەت بەی مەزموون   لەیـــلام وەیـــلانم بـــەتر لە مـــەجنوون

حەیفەن زام نێش، موژەت سارێش بۆ
له دووریت ئانێ، بێ ئێش نێش بۆ
با هەر چڵ بدۆ، چەنی دەرد وێش
چك چك چكەی زووخ، زامت بەیۆ لێش
چریقەی چۆقەی، قرچەی جەرگ و دڵ
ئاگروارانەن، ئازیز وەلحاسڵ
دڵداریێ وە نێش، موژەی دڵبەرش
ڕێش نەبۆ ڕیشەی، دڵ یا جگەرش
ئەو دڵە تەواو، توا بۆ وە تێخ
ئەو جەرگە لەت لەت، بەر بەیۆ لە بێخ
«ئەحمەد» دڵ زەدەی، زام موژەی تۆن
اَلحَمدُلله، زامش هەر بە سۆن[1]



١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» سێ بەیتی ئاخری ئەم شێعرەی بە ئەم شێوەیش هاوردوە:

ئەو جەرگە تەواو توا بی وە تێخ — ئەو دل پارە بۆ بەر بەیۆ لە بێخ
لەو ساوە «ئەحمەد» زەدەی زام تۆن — پا بەند حەڵقەی زڵف دام تۆن
قەرارش بڕیا بێ ئارام تۆن — ویرد زوانش زکر نام تۆن

## تەقازای ئیعدام

قیبلەم ئیعدامم، قیبلەم ئیعدامم
حەقە سادر کەی، حوکم ئیعدامم
ئیعدام وەشتەرەن، هەی نەونەمامم!
نەك هەر ئان نمەك، مەدەی لە زامم
با ڕەحمت نەبۆ، ئەرچی بێچارەم
بۆ بەی سزای سەخت، بدەر قەنارەم
ئەمر بفەرموو، فەڕاشان چاو
پەتم لە زلْفت، هەڵ خەران وە تاو
لە حەڵقەی زلْفت، حەڵقاوێزم کەن
لە دار باڵات، سەراوێزم کەن
وە نێش موژەت، بزمارڕێزم کەن
دووچار عەزاب، ڕستاخێزم کەن
وە بەیانەدا، مەولەقم کەران
وە تێغ ئەبرۆت، شەق شەقم کەران
ڕازی‌یەن «ئەحمەد»، وا بە فیدات بۆ
وە شەرتێ قەبرش، جە سەرەڕات بۆ
پا بنیەی پێش‌دا، وە ناز بویاری
نەقش پات وەسەن، پەی یادگاری

★ ★ ★

واتم: سەد ئۆخەی، من بیم نەمەردم
گەنج خەسرەویم، وە دەس ئاوەردم
دەس کێشام وە بان، سیم سافەدا
شەستم خوارد وە زەنگ، قاپی قافەدا
ناغافڵ سیمورغ، لێم بی خەوەردار
نەوێنی خوری، لێم چون زەهرەمار
وات: کێن؟ شێتەن! دێوانەی هەردەن!
یا وێڵەو بەدبەخت، ڕاش غەڵەت کەردەن؟
ئەر «ڕوستەم» کەردەن، عەزم قاف من
سەر بەر نەکەردەن، لە مەساف من
واتم: عاشقێ، نەکردە مەشقم
وێڵ و نابەڵەد، سەرەڕای عەشقم
وات: عاشق مەبۆ، هەر نامراد بۆ
یاوێنەی «مەجنوون»، یا چون «فەرهاد» بۆ
یا وێنەی «وەلی»، دێوانەی «شەم» بۆ
وە شەوق شوعڵەی، شەم خاتر جەم بۆ
یا چون پەروانان، بێ پەروا و بێ غەم
بۆزیۆ وە شەوق، شوعلەی شەم کەمکەم
عاشق مەبۆ عیشق، ئەو مەزاقی بۆ
وابۆ تا مابۆ، عەشقش باقی بۆ
سەرمایەی هەنگوفت[1]، عەشق ناکامی‌یەن
ئەر کامڕەوا بۆ، دی بەدنامی‌یەن

---

١- گەورە، زۆر.

عـــاشق مـەبۆ زووخ، زام دڵ وەردە بـوٚ
عـــەشق و ئـارەزوو، وە گــڵ وەردە بـوٚ
بـنۆشۆ جـە مـەی، هـوون دڵ جـامێ
بـــوٚ مـــەزە و لەزەت، بـەسە ســڵامێ
عـاشق مـەبۆ نـوور، عـەشقش لە چـەم بـوٚ
چـەم چـەنی چـەمان، لە چـەم و خـەم بـوٚ
وە بادەی خـەیاڵ، مـەعشووقش مـەس بـوٚ
وابــوٚ، نـیمنگای، مـەعشووقش بـەس بـوٚ
«ئەحمەدْ»! مـەرد نـیەن، ئـەر عـاشق نـەبۆ
عــاشقی خــوەشە ئــەر فــاسق[1] نــەبۆ



١- بەدکار ـ دامێن تەڕ.

## ئازیزم شەوبۆ

ئـــازیزم شـــەوبۆ، ئـــازیزم شـــەوبۆ
ئـــارەزۆم ئـــەکـــرد، بـــوێنم شـــەوبۆ
بگـــێرووم وە دەس، بکـــەرووم وە بـــۆ
بـــزانـــم چـــوونەن، چـــەنی زڵـــف تـــۆ
زار و زویـــــر[1] و زەدەو[2] زام بـــە ســـۆ
غـــەمین و غـــەمبار، خـــار غـــەم وە کـــۆ
پـــەشێو بیم چـون زڵـف، پـڕ پـەشێو تـۆ
چون مەجنوون وە یاد، «لەیـلا» دام وە کـۆ
دیـم نـیشتەن جـەمعێ، یـاران خـوەش‌خۆ
جـەم کـەردەن خـەرمان، گـوڵاڵان کـۆکـۆ
یـەکـێ وە لێشـان، نـەو نـەمامەی نـۆ
دەس بەرد یەك دەستەی، شەوبۆی «شاوەکۆ»[3]
بەخشـا پـێم و وات: ئـی دەسـتەی شـەوبۆ
بـاب تـۆن ئـیمشەو، بـۆش کـەر تـا وە ڕۆ
زام کـۆنە و نـۆم، کـول ئـاوەرد وە سۆ
کـەفتم وە خـەیاڵ، خـاڵ و زڵـف تـۆ
ئەو کە دەس ئاوەرد، من هـەم دەس بـەردم
ئەو دەسەی شـەوبۆ، جـە دەسـتش گـەردم

---

١- خەمگین و مات.
٢- لی‌دراو، پێکراو.
٣- کێوی بەرز و جوانی «شاهۆ».

هــەرتا بــۆش کــەردم، تــەواســام مــەردم
بــۆی زڵــفت ســەوزەم، وە یــاد ئــاوەردم
ئــیستشمامم کــەرد، وە ئــارەزۆی وێــم
مــەزەو فــەزای زڵـف، تـۆ نـەبەخشا پێم
وە تــەشخیس وێـم، شـەوبۆ و زوڵـف تـۆ
فـەرقش زیـاد بـی، ئـێد کـۆ ئـەو جـە کـۆ
شــەوبۆ فـەقەت هـەر، وە شـەو مـەدۆ بـۆ
چوون قەیاس کەرووم، چـەنی زوڵـف تـۆ
زوڵـف تـۆ شـەوبۆن وە شـەو تـا سـەحەر
ســوب مــەبۆ وە عـوود، نـیمەڕۆ عـەنبەر
وە عـــەسر مــەبۆ، وە دەســتەی عــەبیر
گــیان بــدەی جــە ڕاش، نـمەیۆ وە گـیر
مەغریب عادەتش، ئێدەن چون «ئەژدەر»(١)
مەپێچۆ وە توولّ، بالاّت چون «عەرعەر»(٢)
یـە کـێ بـۆ جـە ڕاش، سـەر سپەردە بـۆ؟
چون من ناغافلّ، دەس پـەیش بـەردە بـۆ؟
دێـــوانــە وە مــەرگ، وێش نــیەن ڕازی
چــون «ئــەحمەد» وە مـار، بکـەرۆ بـازی



١- ئەژدەها.
٢- دارێکی شۆخ و شەنگ.

## ئازیز نگاتەن

ئــازیز نگــاتەن، ئــازیز نگــاتەن
تاکەی وێنەی باز، شەش دانگ نگـاتەن
تـوورەی تـوغرای زلّـف، زەرد تـاتاتەن
نـەقش نـەقاشی، گـۆشەی گـۆناتەن
چــون جـەیران جـەلد، ئـاما و لواتـەن
سـەیادان سـەرسام، دیـدەی سـیاتەن
وە جـام جـەمین، جـیلوە و جـەلاّتەن
جام «جەم»[1] لە لای، جەمینت مـاتەن
دەمت سـەرچـەشمەی، ئـاو حـەیاتەن
«ئەسکەندەر» بۆ ئاو، جۆیای زوڵماتەن
«ئـەفلاتوون» لە فکـر، فـام تـۆ مـاتەن
«لوقـمان» مـونتەزر، ڕێـزەی دەواتـەن
عـفەت و عـسمەت پـاپێچ پـاتەن
مانگ و خوەر هەر دوو، مـات لەقـاتەن
قـامەت قـاخ لە داخ، قـەد و بـالاّتەن
قـنیاتم[2] وە گـەرد، خـاك پـالاّتەن
سـەر و مـاڵ و گـیان، فـدا لە ڕاتەن
خـۆراکـم خـەیاڵ، خـاڵ ئـالاّتەن

---

١- جامی جەهان نما.

٢- سەبووری.

دەردم گـــرانـــە، دەرمـــانی قـــاتەن

ئـــەگـەر مـەیلت بـۆ، داروومـ لە لاتـەن

گـۆش دەر وە عـەرزم، گـیانم فـداتـەن

قـــامەتت وێـــنەی، شـــاخ نـــەباتەن

بـەخشی یـا کـوشی، چـەم دەسـەڵاتەن

ئـــەر نـفرینم کـەیت، وە مـن خـەڵاتەن

هـــەم حـــەج ئـەکـبەر، ڕۆژ فـەرداتـەن

ســـەر بـــەڵاگـــەردان، دەرد و بـەڵاتەن

«ئەحمەد» تا زندەی ڕووی سەر بساتەن

دوور وێ یسا نـزیك گـیان وە فـداتـەن



## یەك شەو ئارەزوو

یەك شەو ئارەزوو، یەك شەو ئارەزوو
بۆم هات وە عەمەڵ، عومدەی ئارەزوو
لەحاف پەڕنیا، دۆشەكەی پەڕقوو
چمان شاهێ بیم، ئەو شەو تا شەوسوو
دیم ئازیز وە ناز، ئامان وە بەرم
دەست چەپ كێشا، وە دەور سەرم
دەست ڕاست نیا، وە بان دڵم
گوشاد بیقاپی، سەختی موشكڵم
ڕۆشن كەرد وە نوور، حوسنش چراغم
مەس بی وە بۆی زڵف، وەشبۆش دەماغم
زاخاو دا وە دڵ، پڕ زووخاوەكەم
خەو بەخشا وە چاو، شەو بێ خاوەكەم
چون تاوس وە پەڕ، سەراپام پۆشان
لەبالەب لە مەی، لەبان پێم نۆشان
وە ڕێزەی ڕازان نازك خەیاڵی
ژەنگ زام و زووخ وە جارێ ماڵی
گا پارە مەكەرد، گاهێ مەدۆزا
گا مەلایم بی، گاهێ مەسۆزا
شەكەر مەنۆشا، بە دڵ پێم جارێ
گا سزام مەدا، وە سیا مارێ

گا شیشەی شادیم، وە بازی مەشکەست
گا بازهەم بە ناز، مەکەردش پەیوەست
گا خومار مەکەرد، گا مەکەرد مەستم
گا مەدا نەنقەس، دەس‌بۆش وە دەستم
گا مەدا نێش و گا مەکەرد نۆشم
ئەو نێش و نۆشە، هەر ها لە هۆشم
گا عەزاب مەدا وە خارو خەسم
گا مەدا دەستەی زڵفان وە دەسم
گا تەهدید مەرگ، وە قەتڵم مەکەرد
گا ئومێدەوار، وە وەسڵم مەکەرد
چون «خضر»[1] تەی کەرد، پێم ڕاگەی زوڵمات
ڕەهنماییم کەرد، وە ئاو حەیات
وەلێ نیاوام، وە ئاوات ئاو
بە نائومێدی، بێدار بیم لە خاو
«ئەحمەد» تا مەحشەر هەر نامرادەن
وە کام نیاواو هەر دڵ ناشادەن



---

١- مەبەست حەزرەتی «خضر» زندەیە.

## میرزام وە قەڵوەز[1]

مـــیرزام وە قـــەڵوەز، مـــیرزام وە قـــەڵوەز
یەك ڕۆ پەی تەقدیر، ڕام کەفت وە «قەڵوەز»
دیـــم کـــە نـــازارێ، ســـەوزە و بـــاڵابەرز
وە نـــاز مـــاوەردش، قـــولەی قـــاف وە لەرز
ئاهووی خوەتەن خۆ، خەیاڵی و خـــاوێر[2]
خاو خاو مەویارا و، سەر مەوست وە چێر
ئـاهوو کـام ئـاهوو، قـۆچ مـێش چـەم بـی
ئاهووی بێئاهوو[3]، چون ئاهوو کـەم بـی
ئـــاهوو ویـــارێ، دیـــم تـــاکـــە کـــەڵێ
کـــەشیدە قـــامەت، ســـەرو ســـەرتەڵێ
لاقەید[4] لە سەییاد، مـەست و بێباك بـی
ئـەو کـەڵ کـەڵێ بـی، لە کـەڵان تـاك بـی
کـــەڵ چـــەنی ئـــاهوو یـــاویان وە هـــەم
ئاهوو سـڵخۆ بـی جـە کـەڵ مـەکـەرد ڕەم
ئـــاهوو مـــەواتـــی تـــەوارو تـــەیەر بـــی
بێ غـەمو خـەیاڵ سـەرشار لە سـەیر بـی
چەرخ مەداش وە چەم، چون باز پەی نەچیر
ســـەیادان وە دام، زڵـف مـەکـەرد زەنـجیر

---

١- تافگەیەکی جوانە لە نزیکی شاری «نەوسوود» بەزوبانی هەورامی بە تافگە قەڵوەز دەڵێن.
٢- نێوان بێداری وخەو.
٣- بێ عەیب.
٤- بێباك.

هـــەر ڕاویـــاریٚ، مـــەدیا مـــەداش گـــیر
شکـــار مـــەکـــەردش، لە جـوان و لە پـیر
مـــن پـــیر زەرهـــان، حـــەفتا ســـاڵە بـــیم
لە پـــــیری خـــــەریك، ئـــاه و نـــاڵە بـــیم
دیـــم دەســـتەی زلـفان، سـیاش لە سـەردا
چـــون ئـــەفعی بـــەردا، لە ڕووی کـەمەردا
هوجووم ئاوەردن، هـەر یـەك وە سـەد تـار
تـــاریٚ سـەد ئـەفعی، ئـەفعی‌یە سـەد مـار
هەر ماریٚ سەد گاز، هەر گازیٚ سـەد نـیٚش
هەر نیٚشیٚ سەد دەرد، هەر دەردیٚ سەد ئیٚش
هەر یەك لە سەد لا، دڵ گەستەن پـەی ویٚش
دڵ لە ســــەد لاوە، زووخـــاو مـــەیوٚ لیٚش



## خاترم وە خار بێ مەیلیت ڕێشەن

دڵم پـڕئێشەن، دڵم پـڕئێشەن
دڵ لە ئێش دەرد، دەردت پـڕئێشەن

خاترم وە خار، بێ مەیلیت ڕێشەن
نەمەز ئازیزگیان، حاڵ تۆ چێشەن

ناوەشیت ئازیز، ناوەشم کەردەن
جە ناڵای دەردت، دڵم پڕدەردەن

بێ ڕەنگیت بەردەن، ڕەنگ لە ڕوخسارم
ئازارت وە سەخت، مەدۆ ئازارم

پەشێوی زڵفت، وا پەشێوم کەرد
بار لەبانت، بار بە لێوم کەرد

زەردی ڕوخسارت، زەردی بەخشاپێم
هەر وێم مەزانوم، چەنی دەرد وێم

تەبت بێ تابم، کەردە بی یەکجار
ناڵەت سەندە بی، لە دڵم قەرار

ناڵەت مەکەرد بەند، جەرگ و دڵ پارە
بێ چارەم کەردی، تا تۆم کرد چارە

خسار خەمانم، بەرکریا لە دڵ
جە وەشیت دیدەم، شکۆفام چون گوڵ

چون بولبوڵ ئەی گوڵ وە ئارەزۆی دڵ
یاوام بە مراد، مەتڵەب بی حاسڵ

ئــــومێدەوارم جـــــەمین پــەڕەی گــوڵ
تــەشریفت وە خــەیر بــەردەن وەمـەنزڵ

ڕەونەق دای بەڕەنگ ڕەنگینت چـون گـوڵ
دانــەو دام وە گــوڵ نــیای پـەی بـوڵبول

تــۆ هــەر ئــەو گــوڵی، گــونا گــوڵناری
مـــن ئـــەو بــوڵبوڵم، هــەرهام لە زاری

گــــیرو زەنـــجیرو، گـــرفتار تــــۆم
زەبـــوون زامـــی، زەدەی خـــار تــۆم

«الحـــمدلله»، جـــەمین جـــامەکـــەم
وە ناسۆر نەکـەفت، یـەك جـار زامـەکـەم

ئـەر مـەدیام زڵـفان، سیای مشکین‌فام
بە خام خەم بەستەن، لە ڕووی نوقرەی خام

ئەر بێ نوور مەدیام، دیدەم دیـدەی مـەس
و دیــدەت قــەسەم، مــەویام وە قـەقنەس

یــا مــەدیام زڵــفان سیای مشکین فـام
بە خام خەم بەستەن لە ڕووی نوقرەی خام

ئەر بێ نـوور مـەدیام، دیـدەی نـوورینت
یــا پــەشێو مــەدیام، شــێوەی شیرینت

بــەر لە تــۆ مــەدام، گــیان وێـم لە دەس
وە مــەرگت قـِەسەم، ئـەر بـاوەڕت هـەس

ســیمای ســیمینت، بــە زەردی مــەدیام
یــا گــەرمی مـەیلت، وە سـەردی مـەدیام

فــەوری بــادەی دەرد، ئـەجەڵ مـەوەردم
بــەر لە تــۆ گــیانم، تــەسلیم مـەکـەردم

خار عەشق تۆم، ئەوەن لە جەرگەن
هەرساتێ دووریت، پەرێم سەد مەرگەن
خورد و خوەراك و فكر و خەیاڵم
شەهدم، شەربەتم، شیرینم تاڵم
یومنم، نگینم، فەڕم، ئیقباڵم
کشتم، دانشتم، عەقڵم، کەماڵم
شادیم، سروورم، زەوقم، زینەتم
قابلم، قووەم، قەدرم، قیمەتم
مرواری و مەرجان، دانەی زمڕووتم
دوڕم، گەوهەرم، لەعلم، یاقووتم
عەیشم، عەشرەتم، شادیم، نشاتم
قووتم، قنیاتم، بسانی حەیاتم
بەتم، بۆرچینم، سەرسەوزم، قازم
چەرخم، شاهێنم، بوڵەندپەروازم
کەوکم، کۆترم، تەیهووم، تەوارم
واشە و بساڵەوان، شاهۆم، شکارم
نەیم، نەمامم، سەوڵم، عەرعەرم
یاسم، نەرگسم، عوودم، عەنبەرم
باغم، بوستانم، چەمەنم، دەشتم
ڕەوزەم، ڕزوانم، قاپی بەهەشتم
گوڵم، سونبولم، تەسەلای دڵم
مەلهەم زەدەی زام، دەرد قاتڵم
وەنەوشەم، شەوبۆم، سۆسەنم، یاسم
دۆسم، دڵسۆزم، هەی دیدەی ڕاسم!

حەتمی بزانە، خاڵ نوختەی بێ گەرد
وە مەرگت من هەم، تەرك دنیام مەكەرد
«الحمدلله»، وا تۆ نەمەردی
وە پێم تەرك عەیش، دنیا نەكەردی



## قیبلەم قەرارم

قیبلەم قەرارم، قیبلەم قەرارم
بڕیان لە هیجران، دووریت قەرارم
دووریت هەر ئەوەن، مەدۆ ئازارم
شیرینم لە گیان، شیرین بێزارم
ئارەزۆی خەیاڵ، وەسواسەت هەر شەو
خەو حەرام كەردەن، لە تاسەت هەر شەو
مەر «شیرین[1]» شیرین[2]، بە شیرینكاری
بنوازۆم بە دڵ، بدۆم دڵداری
ئەر جارێ «شیرین»، دەست وە گەردەنم
مەدیام بە ئاوات، بەر لە مەردەنم
ساڕێش مەویا زام، دڵەی سەدپارەم
مەویا وە باعیس، عومر دووبارەم

---

١- ناوی نگارە. ٢- جوان.

وە ئیلا «ئەحمەد»، مەدام مەردەی تۆن
تا مەحشەر «شیرین»، ئیمان هەردەی تۆن

★ ★ ★

## قیبلەم خەیاڵان

قیبلەم خەیاڵان، قیبلەم خەیاڵان
کارێ پێم کەردەن، سەودای خەیاڵان
عەقڵ و فام و هۆش، گرد بەرد وە تاڵان
ها بیم وە وازکەفت[1]، وامەندەی ساڵان
وا وە پێم پۆشای، ڕەدای عەبداڵان[2]
کەشکۆڵم هەڵگرد، پەی گەشت ماڵان
نامەی مەجنوونیت، بەست وە گەردەنم
مۆر لەیل کریان، تا ڕۆی مەردەنم
کافی یەن وەسەن، ئەوەن جەفا و جەور
مازە ئارەزۆت، بسوەرم وە قەور
«سەنعانم» کەردی، «تەرسا» تەرز تەور
کێ کەردەن چون من، حەفتا ساڵە سەور؟
«ئەحمەد» ئەو «سەنعان» حەفتا ساڵەتەن
نامش سەبت لە لەوح، سەر قەواڵەتەن

★ ★ ★

١- پیری لەکارکەوتوو.

٢-گەڕیدەی ماڵ بەکۆڵەوە، ئاوارەی دەشت و کێو.

## هیجران

تا کەی لە هیجران دووریت بنالْم؟
تا کەی بێمەیلی، هاوار وە مالْم؟
تا کەی چون قەقنەس، ئاهر بشۆ لێم؟
بێدینێ چون تۆ، باوەڕ نەکا پێم
هەر من چون «فەرهاد»، ئاوارەی چینم
شەهید شەیدای، شێوەی شیرینم
هەر من پەرێ تۆ، هوون دڵ وەردم
هەر من پەرێ تۆ، گرانەن دەردم
نە نە وە ڕاسی، ڕاز نەباتەکم
بوویەرە چێشەن، تەقسیراتەکەم
هەر من چون مەجنوون، وەیلان هەردم
زەلیل و زار و زەبوون و زەردم
تۆ بیت وە «تەرسای»[1] لاو شێوە شیرین
من بیم وە «سەنعان»[2]، دەیری[3] بیم لە دین
من هەر لە سەفا، تۆ لە جەفا بیت
گونای من چێشەن، وێت بێوەفا بیت



---

١-کچێ بوو «نەسارا» کە شێخی «سەنعان» عاشقی بوو.
٢- عارفی مەشهوور «شێخ سەنعان».
٣- خوێنسارد، گوێ بە هیچ نەدەر.

## ئازیزم پیری

ئـــازیزم پـــیری، ئـــازیزم پـــیری
ڕا مـــەدەر بـــە دڵ، وەســـواســـەی پـیری
تـــۆ هـەر ئـەو هـەڵوای شـەکـەر و شیری
مـــەڵهەمی پـــەی دەرد، بـــێدەوای پـیری
شـــاباز شـــەش دانگ، تـــەڕلان تـــەواری
چـــمانێ تـــازە، جـــۆیای شکـــاری
تـــۆ هـــەر ئـــەو شـاباز، مـن ئـەو نـەچیرم
وە زەنـــجیرەی زلــف، ســیات ئـــەسیرم
لە تـــۆی بـــۆتەی مـــەیل، تـاونای وە تـاو
جـۆشم دای وە جـۆش، هـەتا بیم وە ئـاو
وە ئـــاگـــر عـــەشق، ســـوزیام و ســوختم
هەی بەدبەخت بە خۆم، هێمای نـەپوختم
بـــەرزەن بـــڵێسەی ســـووزان نـــەفتم
چـــون پـــیرەداران، ســـووزیام و کـــەفتم
خاك و خوون پۆشان، سەر تـا پـا لەشـم
هـــەر ئـــان وە نـــەسیم، یـــاد تـــۆ گـەشم
ســـەوزەم مـــەسازووم، وەی زام وە سـۆوە
بـــا تـــازەوە بـــێ، وە ئـــامۆشۆوە
وەســـەن وەس دەردەی، تـێشە وە ڕیشـەم
پـــیر و نـــاتەوان، مـــەشکێنە پـێشەم

با هەروا وەی دەرد، بێ دەرمانەوە
بپێچم پای سەبر، وە دامانەوە
با هەر وەشت بۆ، لەی دونیای فانی
هەزار ساڵە بای باز هەم جوانی
با «ئەحمەد» پیر بۆ، پەرێش زەروورەن
چون جە سەفای حوسن، پڕ سەفلت دوورەن



## حەی و بەی و نەی

ئاغە خەیاڵم، ئاغە خەیاڵم
پەشێوەن پەی تۆ، فکرو خەیاڵم
لە بەدبەختی بەخت کەچی ئیقباڵم
تا مەحشەر لە ئێش، زامەت ئەناڵم
وەزعم وەخیمە، بێحاڵەن حاڵم
حاڵ زانێ نیەن، هاوار وە ماڵم
بادەی ئشتیاق، مەیل تۆ وەردم
ئارەزووی دیدار، دین تۆ کەردم
چون بولبوڵ مەحرووم، فەسڵ بەهارم
بە دینت چون گوڵ، دڵ ئینتزارم
پەی نموونە دیم، یەك تاکە گوڵێ
بەر ماوەرد خار، غەمان لە دڵێ

مەست بیم وە دین، دوو دیدەی مەسش
بێ خۆف بیم لە تیر، ئامادەی شەسش
ناغافڵ شانا، وە قەسد پەی قەسم
قەت بی لە قەڕن، قەفەس نەفەسم
بێ هۆش و گۆش بیم، بەرلوام لە هۆش
وا بیم نەشنەوام، قسەی کەس وە گۆش
نەرگس و سۆسەن، سەفای سومبڵ دیم
چون بولبوڵ ئەوگوڵ، وە کەیف دڵ دیم
سیمای سفیدسیم سیمین تەنێ دیم
بالا سەرو سەوز سای چەمەنێ دیم
تورەی تای توغرای، تاوس تەرزێ دیم
بێ بەلا عەجەب بالابەرزێ دیم
شیرین شەمع شەوق، شەب ئەفرۆزێ دیم
هیمانێ دەی بی، مەن نەورۆزێ دیم
زیبای تەبیعەت، کۆو دەشتێ دیم
چە دیم چە بێژم، چە بەهەشتێ دیم
بی حەیا دوو حەی، پێچ وەردەی یەك نەی
پەی پەی مەدان وەی، بۆسە لە دوو بەی
حەی حافز بەی بی، لە سەر نەی‌دا
«کەی» دان وە سەر «جەم»، «جەم» وە سەر کەی‌دا
«ئەحمەد»! وەسەن وەسف حەی و بەی و نەی
ئاخر بەی ڕەنگت مەکەرۆ چون خوەی

★ ★ ★

## پەروین بێ‌پەروا

دارا مـــوراد بـــای، دارا مـــوراد بـــای
یـــاخوا هـــەمیشە، دارا مـــوراد بـــای
هەر ئـانێ وە لوتـف، خـوداوەن شـاد بـای
لە بـــەند مسەینەت، دنـــیا ئـــازاد بـــای
سـەرشار و شـاداب، شـاد و بێ‌غەم بـای
مەدام چـون بـەهار، سـەبز و خـوڕەم بـای
بـەهارت هـەر وەك، ڕەنگ و ڕووی دڵـبەر
بۆ وەشـتر لە بـۆی، بـۆی گـیسووی دڵـبەر
وە شـــاد بـویاری[1]، چـــەنی ئـــازیزان
ئـــازیزان ئـــازیز، وە لێت نـــەبێزان
ئـازیز كـام ئـازیز، وەش بـۆی بـەهاری
نـافەی مـوشكین بـێز، ئـاهووی تـەتاری
قـنیات[2] وە چـووزەی، چـنوور ڕاخـان
مەشام كـەیل وە بـۆی، شـەوبۆی ئـێڵاخان
خـــاوێر خـــاڵدار، خـــوەتەن پـــەروەردە
گـوڵ لە دەمـــاغ پـڕ، پـەڕەی گـوڵ وەردە
دەرد بـــێ دەرمـــان، وە دڵان بـــەردە
سڵخۆو خـەیاڵی، لە سـا[3]سـڵ[4] كـەردە

---

١- ڕابوێری.
٢- ڕازی ـ سەبوور.
٣- سێبەر.
٤- ترێز، ئیتریس، دووری كردن.

هـــەڵۆی وە هــەڵمەت، لاچـــین لاخـــێز
شـــاهێن شـــەش دانگ، شکـــار نـــەپارێز
چەرخ چابوك چەنگ، چەرخ چەم شـیرین
چەم وە ناز باڵدەر، «سەنعان» بـەر لە دیـن
تەن وە تۆی کاڵای[1]،ئاڵای[2] واڵای[3] شەنگ[4]
بە شۆخی و شـەنگی، پـۆشابیش قـەشەنگ
بـــەو تـــەورە شـــاباز، ڕووی ڕۆزگـــارێ
نـــــەویەن لە تـــەلار، هـــیچ شـــەهریارێ
وە نـوقڵ مـەجلیس، کـام شـیرین کـەردەن
بـــە شـــیرین شیرین، بـاس دیـن کـەردەن
واتـــــم: دیـــــن مـــــن، دیسن خـــاسانەن
دیـدەم پـەی دیـدەی، قـامەت ڕاسـانەن
بـــەدبەخت کـــەسێوەن، لێش هـەراسـانەن
مـــەحروومیش جـە دیـن، دیـدە مـەسانەن
زمســـان ئـــیمساڵ، ئـــەرچـی قـەهار بـی
لە شـــەشبەهمەن[5]، گـــوڵ ئـــاشکار بـی
لە ســـــڕ قـــــودرەت، پـــــەروەردگاری
ســـێ فـریشتەی خـەیر، وە جـارێ بـاری
فـــــەڕ ئـــــێزەدی، مـــــەوارا لێشـــــان
شـاپەڕ، بـاڵ وە بـان، «کـرماشان» کـێشان

---

١- پارچە. ٢- بەرگی بووکەڵەی مناڵان.
٣- پارچەی تەنگ و شاش، جلە بووکی کچولان. ۴- جوان ولەبار.
۵- هەم ناوی مانگی بەفرانبارە وەهەم ناوی بەشێ لە «کرماشانە»کە هۆنەر هەر لەو مانگەداو لەو شوێنەدا هۆنراوەکەی گوتووە.

وە ئـــیلا لافـــاو ئـــاو «قـەرەسوو»[1]
ئـانی «کـرماشان»، نەکەرد ژێـر و ڕوو
هەر ساڵ چون ئیمسال، کاش مەدیام جارێ
لە شـــەش بـەهمەن، خـوڕەم بـەهارێ
«ئـــەحمەد»! نـــاوێنی، دی وا بـەهارێ
هـەر هـەورێ بێرێ و «پـەروین» بـوارێ
«پـەروین» بـێ‌پەروا، پـەروانـەم کـەردی
مـەجنوون بـیم بـەتر، دێـوانـەم کـەردی
تـــۆ «تـەرسا» ئـاسا، مـن «سـەنعانتم»
ئـــەر قـەبووڵ بکـەیت، مـن قـوربانتم
وە قـــەید مـــۆبەت، گـــیر دامـــتم
تـۆ هـەر ئـەو خـواجـە و مـن غـوڵامتم
بـــۆ تـــاڵێ لە زڵـــف، زەرد تـەڵاییت
تـاڵ تـاڵە لە دەور، دیـدەی شـەهلاییت
چـون حـەڵقەی زنـار[2]، بـووزە گـەردەنم
بـا مـوریدت بـام، تـا ڕۆی مـەردەنم



١- ناوی ڕووبارێکی گەورەیە لە کرماشان.
٢- ناوی ئەڵقەیە کە مەسیحی ئەی‌کەنە ملیان.

## ئازیز خەیاڵان

ئــــازیز خــــەیاڵان، ئــــازیز خــەیاڵان
چێش کەرووم چــەنی، سـەودای خـەیاڵان
ئـــــارەزووی خـــەیاڵ، نــازك نــەوهاڵان
کــــریشمەی گــۆشەی، دیــدە غــەزاڵان
پۆیلە و پەلکە و زوڵـف، وەنـەوشە خـاڵان
بـــێ گــــەردی گـــەردەن، بــاڵا شمشاڵان
بـەردەنم نـە جـەمع، جـوملەی عـەبەداڵان
عــەقڵ و فکــر و فـام، بەردەن بـە تـاڵان
بادەی مەجنوونیم، جە نـۆ نـۆش کـەردەن
هۆشداریێ چون تـۆم، فـەرامـۆش کـەردەن
لە دووری ســـەوزەی، نـــزاکــەت فــرۆش
کڵاوزەڕ[1] لە فەرق، پەلکەی ڕەش لە دۆش
چــــەم تـــا ڕۆ بـــێخاو دڵ بـــێ قـــەرارەن
دڵ هــــــەر مـــــونتەزر، چـــەم ئـــینتزارەن
«ئەحمەد» چون مەجنوون، سەرعی سەرگەردان
هــــەر ســــەر بـــماڵە، وە خـــاك هـــەردان



---

١- لە ڕابردوودا ژنانی کورد کڵاوی پڕلە سکەی تەڵایان لە سەر ئەکرد کە پێیان ئەگوت «کڵاوزەڕ».

## یەك ڕۆ چون مەجنوون

خــار خــاتر کــەیل، خــار خــاتر کــەیل
یەك ڕۆ چون مەجنوون، خار خـاتر کـەیل
چون «مەجنوون» وە یاد، دین دیدەی لەیل
وە مــەیلەوە ڕوو، نــیام وە «دوجـەیل»[1]
مەڕێزام ئەسرین، حەسرەتان چـون سـەیل
وە یاد ماوەردم، چـون خـاو خـاڵ «لەیـل»
پــەشێویا و پـەشێو، پـەرێشان خـەیلێ
ڕام کەفت وە مـەنزڵ، قـەدیمگای «لەیـلێ»
وە پــــەژارەوە، بــــەرلوا هــــۆشم
دیـم دەنگــێ بــێ‌دەنگ، ئـاما وە گـۆشم
دیم «لەیلەن» وە مەیل، «مەجـنوون» مەلاوان
دڵ ئەر جەسەنگ بی، چـون مـۆم مـەتاوان
واتش: ئەی «مەجنوون»، سەرعی[2] سەرگەردان
پــۆست پساکــەندە، وە بــەرد هــەردان
یە کـام دەردێ‌وەن، لێت ئـەسەر کـەردەن؟
گەرمی مەیل «لەیل»، لە دڵ بـەر کـەردەن؟
ڕاس واچە پەی چێش، وا مەیلت سـەردەن
گەرمی مەیل «لەیل»، وێت لە یـاد بـەردەن

---

١- شوێنەکەی مەجنوونی لەیلا. ٢- لێوە، شێت.

کەڵپۆس[1] دۆسی، لەیل لە دۆشت بی
حەڵقەی غوڵامی، لەیل لە گۆشت بی
بادەی موحیببەت، لەیلێ مەنۆشای
ڕەدای[2] ڕەهبانی[3]، لەیلێ مەپۆشای
مەی مەیلو وەفای، لەیلێ نۆشت بی
چ خەیرەن وا لەیل، فەرامۆشت بی
بێ غەم مەویاری، وە «دوجەیلە» وە
نەمەدیەی وە ڕووی، ماه لەیلەوە
واتم: فدات بام، لەیل خاتر خار
لەی بێ مەیلی یە، مەبەر دڵ ئازار
بەی تەورەن گەردش، چەرخ پڕستەم
نمازۆ تا سەر، دو مەیل چەنی هەم
لە تۆی[4] بۆتەی[5] عەشق، وە ئامێتەوە
وە ئاواتەوە، بتاوێتەوە
ئەو وەختە وەختێ، گیر داوت بیم
دەست و پا بەستەی، زوڵف خاوت بیم
فریفتەی فریب، گۆشەی چاوت بیم
وە هەرجا مەچیای، لە ڕکاوت بیم
ئەرواحم چون هەنگ، لە پەی ئاوارە
کەردە بیت وە گوڵ، گۆنات بێچارە

---

١- عەبای تیسکن لە پێستە پەز. ٢- لیباسێ کە لە سەر لیباسانی تر لە بەر ئەکرێ.
٣- عابدی مەسیحی کە لە دەیردا عیبادەت دەکەن و گۆشەنشینن.
٤- لە ناوی. ٥- کوورەی تاواندنەوی زێڕ و زێووشتیوا.

وە تـــای تـورەی زلّـف، سـیای بـۆ عـەبیر
زەنـسجیرش کـــەردی، بـــەردی وە ئـەسیر
شـــەهید شـەیدای، شـیفتەی شـێوەت بـیم
وە خـــەیاڵ خـــاڵ، لێـوت لیـوەت[1] بـیم
دەردم دەردێوەن، خاڵ نوختەی بێ گـەرد
مـــوبرەمتەر نـــیەن، دەردێتـــەر لەو دەرد
زمســـان پـــیری مـــەیلم کـــەردەن ســـەرد
ئەر پێم بێژن گیان، تـەڵخە لێـم چـون دەرد
وە ئـــیلا بـــمرم، پـــێشەم وە خـــاك بـــۆ
خـاك وە زووخ زام، حـەسرەت نـمناك بـۆ
ڕیشـــەی شـادانـەی، عـەشقم لە تـۆی دڵ
سەوزکەرۆ جە نـۆ، بـەر بـەیۆ چـون گـوڵ
ئـــەر چـون گـوڵ وە بـاد، پـەڕە، پـەڕە بـۆ
هـــەر پـــەڕە وە چـــەند هـــەزار زەڕە بـــۆ
دووبـــارە گـــــەردم، وە هـــــەرد بشـــانۆ
«ئەحمەد» هـەر سـەنای، «لەیـلێ» مـەوانـۆ
«ئـەحمەد» تـا مـەحشەر لەغـەم کـەیلەنان
لێـــویای لێـــوەی لێـــوی لەیـــلەنان



---

١- شێت.

## ئازیز غەمانم

ئـــازیز غـــەمانم، ئـــازیز غـــەمانم
ئـیمشەو دای وە بـاد، عـومدەی غـەمانم
وەگـــیانت قـەسەم، ئـاگـر وە گـیانم
گیان کەفت وە تۆڕدام، دوو دیـدەی خـانم
تـا تـەشریف ئـاوەرد، وە پـەرداخـەوە[1]
بـەری کـەرد سوورەت، وە دولاخـەوە[2]
دەســتش دا وە زولـف، سیای بـۆ عـەبیر
چەرخش دا وە چەم، چون باز پەی نەخجیر
جـــەڵا دا وە جـــام جـــەم جـــەهانبین
ئاهر وست وەگیان شیرین چون «شـیرین»
پـــەردەی ســـینەمای، ســینەی دا لاوە
وشك مـەویا هـەر کـەس، مـەدیا وە پـاوە
پـەشێو بـیم مـەدیام، زوڵـف پـەشێوش
ئـەنگوشت نـاز بـە نـاز مـەنیا وە لێـوش
ســیمای مـوعەممای مـەعنەویش عـەیان
عـەیان کـەرد وە شـەو نشـان دا بـەیان
دەم چون غونچەی گوڵ نەشکوفتەی باخان
نـەفەس بـۆی نسـیم، سەبای ئێڵاخان

---

١- جوان و لووس کراو.

٢- سەر پۆش، ڕووسەری.

قــــەتارەی لیــــرەی، تــاقیەی فــەرقش
کــەردە بــی وە نــوور، ســەراپــا غــەرقش
تــــاقمەی تــاقیەش، هــــەوا دا لە فــــەوق
ڕەخشان بی چون مای، چواردەی پڕ شەوق
مـوژگانان چـون تـیر، تـورکان تـەڕدەست
مـــەدان وە جــــەرگم، پـەیاپەی پـەیوەست
وە نـــــاز دیــــدەی، نـزاکــەت فــرۆش
کــــەردە بی هــەزار، عــەبد دوڕ، لە گـۆش
ئــەو شـــیرینی شــەهد، شـیرەی کـەلامش
کەردەن چەند هـەزار، کـەس وە غـوڵامش
شیرینیش «شیرین»، «پـەروێز» وە بـێز بـی
لەبــانش لە شـــەهد، شـەکـەر لەبـڕێز بـی



## قامەتم چون قەوس

دۆسـان حـاڵ وێـم، مـەواچـوو پـێتان
مـەر ئـاگـا نـیەن، وە حـاڵ وێـتان؟
سـەرتاپا مـەعیووب، زامـم قـەهارەن
عـەیبانم یـەك یـەك، گشت ئـاشكارەن
قامەتم چون قەوس، قەزەح[1] چەم وەردەن
بـەدەن هـوون ئـالوود، زامدار دەردەن
مەغز لە كاسەی سەر، یـەكسـەر نـەمەندەن
پـیری عـەقڵ و فـام، لە دەستم سەندەن
سـەدای تـەپڵەكـەی، گـۆشەكـەم خـەفتەن
چـون ئـاسیاو بـێئاو، ئـاوەكـەش كـەفتەن
چەم بی وە دووربـین، هـەوای تـەم و تـار
نـیشان مـەدەرۆ، دووان وە چـوار
لووت چون ئاوەزای[2]، قەڵوەزان[3] سمخت
تك تك مـەتكێو وە وەخت و بـێوەخت
دەم بـیەن وە نـای، ئـاسیاو خـراوە
پـەلە مـەشانۆ، وە هـەر دوو لاوە
دگـان بـەدتەركیب، یـەك یـەك تـاك و واك
زشت و ناپەسەند، چون چیخ چـاك چـاك

---

١- بوو كە بارانە، هەسوونە زەڕینە.
٢- زۆنگ، زەویەك ئاوی كەمی لێ هەڵدەقوڵێ و تەڕو شلە، باتڵاغ.
٣- تافگە، شەپۆلی ئاوی چەم.

ڕەنگ سیا چون چەرم، تای دەباغخانە
پۆرکەندە و فەرتووت، تانەی زەمانە
ئەو خوێن و ئەو گۆشت، ئەو هەوا و هەوەس
حەسارە ئارۆ، چون کەوك قەفەس
«اَشْهَدُ بِاللهِ» وە خودا سەد حەیف!
ئەو قسە و گوفتار، ئەو دەماغ و کەیف
ئەو خەندەو ئەخلاق، ئەو باڵای عەرعەر
خاس‌تر بی لە تار، توولْ نەیشەکەر
ئیسە نارەواس، لە گشت بازارێ
بێ ڕەونەق، کەساد، بێ خریدارێ
ئەو زەرەی گوفتار، شیرین شەکەروار
تەڵخ بیەن مەزاق، وێنەی زەهرەمار
پیری لە چەند لا، هوجووم ئاوەردەن
قافڵەکەی جوانیم، وە تاراج بەردەن



## شەم جەماڵەنی[1]

شەم جەماڵەنی، شەم جەماڵەنی
«جەماڵ» ئەگەر چە، شەم جەماڵەنی
بەحر کەرەمو، کۆی کەماڵەنی
دوڕ مەعریفەت، دانەی لاڵەنی
شیرین خۆی شیرین، خوەش خەیاڵەنی
وە سککەی سفەت تەلای قاڵەنی
ڕاستە مورغ عەشق، خەت و خاڵەنی
دارا پەڕ فەڕ، زەڕین باڵەنی
وەلێ باڵ بەستەی، زلف کاڵەنی
شێویاو شیفتەی، شێوەی کاڵەنی
جەماڵت جیلوەی، جەمین جامانەن
سەیرانت سەفای، نەو نەمامانەن
چون بولبوڵ مەدام، لە سەر شاخەی چڵ
قنیاتت بیەن، وە بۆی عەتر گوڵ
ئەر چە وێت ئەو گوڵ، موعەمبەرینی
لە لام چون حەلوای، شکەر شیرینی
وەلێ مەن لە تۆ، خەیلێ دڵگیرم
ئەر چە مەزانووم، وێم باتەقسیرم

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی لە وڵامی کەسێ بەناو «جەماڵ» نوسیووە.

نـــەپەرسای جـــارێ، لێـــمان هـەواڵـێ
نـــەکـــیانای وە لام، نـــامەو شـــەماڵێ
ئـــەوەن ئـــارەزووی، دیـــن تـــۆ داروومم
وەخـــتە لە دووریت، گـــیان بسپاروومم
سا تۆێچ بۆ چون من، ئارەزوومەن بـەر
بە شەرتو وەفـای، وەریـن پـابەن بـەر
ڕاســـــە دڵ وە دڵ، تـــــەمووشە دارۆ
ئـــساگـــاو بـــێداری، هـــەمیشە مـــارۆ
مـــەبۆ دەروازەی، مـەیلت هـەر واز بـۆ
نـەك بـەستەو بـێ دەنگ، ڕازو نـیاز بـۆ
گـــۆشەی دەروازەی، دڵ مـــەبۆ واز بـــۆ
پڕ لە دانـەی عـیشق، سـۆزو گـوداز بـۆ
خەیمەو خەڵوەت گـای، ئـازیزانش بـۆ
نـــەك چـــون پـایزان، گـوڵڕێزانش بـۆ
دڵ مـــەبۆ دایـــم، ئـــەگـــەر وە دڵ بـــۆ
دوو دڵ وەك یەك دڵ، مدام وە کـوڵ بـۆ
«جەماڵ» چەپەی گوڵ، وە جەماڵت بـۆ
«جەماڵ» لوتف حەق، شامل حاڵت بـۆ
«جەماڵ» بۆ بدەر، گـۆش وە عـەرز مـن
بشـــنەوە چـــۆڕەو، چـــەقەی لەرز مـن
ڕام کـــەفتە «قـەلوەز» قـاپی شـاری بـی
«قـەلوەز»، قـەلوەزە وەش دیـارێ بـی
«قەڵوەز» ئەگەر چە سەخت سەنگڵاخەن
بۆی بـەهەشت مـەدۆ بـاغات و بـاخەن

چـاگـە مـەویەری سـەفاو سـەیر کـەرە
مەسکەن کەر ئەو وەخت ئۆغرخەیر کـەرە

مەشی وە جایە سەحرای خوەتەن تـەرز
چـە جـایە، جـایە دڵنشـینو بـەرز

جـەدوەل کـاریەن دەورش درەخـتەن
پـاتەخت سـانو سـوڵتان وەخـتەن

حـەوزش مـوتابق حـەوز کـەوسەرەن
ئاوش ماچی شـەهد شـیرو شـەکـەرەن

وەشـــی مـەنزەرەش وا دڵ نشـینەن
وەش تەر لە بـەهەشت پـڕگوڵ و شـینەن



## شیرین شیرینی

شیرین شیرینی، شیرین شیرینی
فێشتەر[1] لە شیرین، شیرین شیرینی
وەش‌بۆ چون شەوبۆ، زلْف عەنبەرینی
بە ڕێزەی ڕازان، لەب شەکەرینی
وە ئایەنەی حوسن، جەمین چون جامی
ساحیب جەماڵ و، کەماڵ وفامی
موژەت چون خەدەنگ، زهر ئالووی پەڕپەڕ
نە غەیزن «باللە»، ئامادە پەی شەڕ
چێش مەبۆ «شیرین»، لە شەوان یەك‌شەو
وێت بەر بە «شیرین»، من کەر وە «خوسرەو»
تاج خوسرەوی، بنیەر لە فەرقم
چون «فەرهاد» مەکە، وە هووناو غەرقم
شیرینیت چەنی، «شیرین» بێ فەرقەن
چون «فەرهاد» تێشەی، عەشقم لە فەرقەن
زەلیل زامەت، بێستوونتم
غەلتیای غەلتان، خاك هوونتم
شەوێ چون «شیرین»، پەی سەرکەشی من
تەشریف باوەرە، پەی دلْوەشی من

---

١- زۆرتر.

سـارێش کـەر زامـان، خـار غـەمانم
دەردم دەوا کـەر، دەردت لە گـیانم

سـەرم وەر دارە، بـە ڕووی فـامەوە
بـنیەر بـە دامـان، هـەر وەو زامەوە

بـنواز وە ڕازان، ڕێـزەی نـەرم وێت
بـماڵ وە مـەڵهەم، مـەیل گـەرم وێت

خاستر لە شیرین، شـۆخ شـەکـەرنۆش
بـە ڕێـزەی ڕازان، باوەرەم وەهـۆش

بـنوازەم وە نـاز، ڕێـزەی نـازەکـەت
مەکوشەم وە غەمزەی، بێ ئەندازەکەت

دیدەت چون شـاباز، ئـامادەی شـەڕەن
چـەنگاڵش وە هـوون، عـاشقان تـەڕەن

«ئەحمەد» چون فەرهاد، دەیری دیرینەن
شـەهید شـەیدای، شـێوەی شـیرینەن



## قیبلەم وە دەردم

قـــیبلەم وە دەردم، قـــیبلەم وە دەردم
ئـــەگـــەر مـــەزانـــی وە ئـــێش دەردم
یـــەخ کـــەردەن ئـاوان، لە ئـاە سـەردم
زارم، زویـــــــــرم، زەعـــــیفم، زەردم
ئیستدعام[1] ئێدەن، سەوەزی بێ گەردم
گـــۆش دەر بشـــنەوە، قـــافیەی فـەردم
حەیفەن حەرف زشت، تۆ وە من ماچی
جەرگم وە سەر نێش، ئەڵماس مەپاچی
ئەگەر چـە مـن وێـم، جـەرگم پـاچیان
وە نـــار هـــجران، دووریت سـووچیان
پـــڕووزەی[2] ڕێـزەی، کـزەی کـەواوم
تکـەی چکـەی جـەرگ، زام زووخـاوم
سـەیل ئـەسرینم، جـاریەن چـون جـۆ
ســـەروازەن وە بـــان، زام کـــۆنەو نـــۆ
وێـــنەی بـــاوەقوش، نـــاڵای دەردمـەن
مەحروومی جە لەیل، شەفەق زەردمـەن
چون مارگەزدەگان،[3] چۆق وەردەی ئێشم
خـــارین و خـەمین، داخـــی و دڵـڕێشم

---

١- تەمەنام ـ تکام.
٢- سووتاو، بۆسۆ.
٣- مارلێ داوان.

هەی شۆخ! هەی شیرین! هەی شەکەربارم
هەی ئامان! مەڵهەم پەی گەزدەی مارم

گوڵم، سونبڵم، تەسەلای دڵم
مەلهەم زەدەی زام، دەرد قاتڵم

چنوور شاوەم، شەوبۆی ئێڵاخم
هومای گوڵشەنم، تاوس باخم

سەرمایەی فامم، دەسمایەی زەوقم
سەیقەڵبەخش[1] زەنگ ئایەنەی شەوقم

کەوکم، کۆترم، تەیرم، تەوارم
بازم، شاهێنم، سەیدم، شکارم

حەجاجم، حەجم، قیبلەی نیازم
شوکرم، تەوحیدم، ڕووزەم، نمازم

عورفم، عادەتم، دینم، ئیمانم
لەیلم، مەجنوونم، تەرسام، سەنعانم

بێ خۆف و خەیاڵ لە ئەغیارمی
نازار نازکێش خانەی خارمی



١- جەلادەر.

# شیرینی و تاڵی

دانەیە نوقڵم، هۆرگەرتەن[1] وە قەس
ئارەزۆم کەردەن، سەوزەی دیدە مەس
وێم وە دەست وێم، بنیەروو وە دەم
بووەری وەشەن، پەی تاڵی کەم کەم
چون یە چەندێوەن، هامدەمت تاڵەن
لە تاڵی دەمت، دایم پڕ ژاڵەن
دەم شیرین کەرە، وە شیرەی شەکەر
بەڵ ساتێ تاڵیش، بەر بشۆ وە بەر

وڵام:
میرزام خەیاڵەن، میرزام خەیاڵەن
ئارەزۆت کەردەن، یە خۆ خەیاڵەن
دەمێ لە ئەزەڵ، هامدەمش تاڵەن
شیرینیش تا ڕۆی، مەحشەر مەحاڵەن
ئەر ڕۆژێ سەدجار، بە شیر و شەکەر
بشۆریش تاڵیش مەبۆ زیاتەر
«ئەحمەد» ئەر شاعێر نازکخەیاڵی
تاڵی شیرینەن، لە بێکەماڵی



---

١- هەڵ گرتوە.

## شۆخ و شەنگەکەم

شۆخ و شەنگەکەم، شۆخ و شەنگەکەم
نازار مەحبووب، شۆخ و شەنگەکەم
بێ‌ڕای بێ‌مرووەت، دڵ جەسەنگەکەم
گومڕای بێ‌ئینساف، مەیل وە جەنگەکەم
سەرمەشق ڕەندان، نەوای ڕەمەکەم
بێ‌خۆف لە سەیاد، دڵ بێ غەمەکەم
جارێ بۆ بنیەر، دەم وە دەمەکەم
پەروانەم کەردی، شۆڵەی شەمەکەم
زیبارای زینەت، خوەش‌ڕەفتارەکەم
جەمین جەلابەخش، وە ڕوخسارەکەم
ساقی بادەی عەشق، مەی نۆشانەکەم
باش بالادەست، مەهپۆشانەکەم
مەهوەش مەدهۆش، مەی بنۆشەکەم
سەوزە و قەد باریك، ناز فرۆشەکەم
جارێ بۆبنیەر، دەم وە دەمەکەم
کان مەرحەمەت، کۆی کەرەمەکەم
موعەنبەر زڵفان، بۆ عەبیرەکەم
کەمانی ئەبرۆ، بڕژانگ تیرەکەم
کافیەن وەردار، دی زەنجیرەکەم
مەکوشەم بێ‌تاوان، بێ تەقسیرەکەم
حەریر کالاکەم، ئەتڵەس پۆشەکەم
عەرعەر بالاکەم، مار نەدۆشەکەم

مـەردانـە بـویەر، لە تـەقسیرەکـەم
قـەبوڵ کـەر لاڵـەم، کـوردە مـیرەکـەم
جـاریٚ بـۆ بـنیەر، دەم وە دەمـەکـەم
جاریەن چون هوون[١]، ئەسر[٢] چەمەکەم
بـینی کـەشیدە، سـیمای خـاوەکـەم
هـەناسە لە تـەرح، بـۆی گـوڵاوەکـەم
زنج گرد، لێو باریك، خاڵ نەجیمەکـەم
دەم تەنگ، گەردەن زەرد، سەوڵ سیمەکەم
مـەمان پـەروەردەی، حـەریر بـافەکـەم
بـەیزای سـوبحدەم، سـینە سـافەکـەم
سەر سەوز و بۆرچین، تورەی تافەکـەم
سیمورغ حەفت خوان، قولەی قافەکـەم
هەناسەم سـەردەن، جـەمین جـامەکـەم
نـەیشەکـەر قـامەت، نـەو نـەمامەکـەم
مازە[٣] بـا نـەمرووم، نـەزان حـاڵەکـەم
شـای زەرکـڵاوان، سـۆسەن خـاڵەکـەم
شـۆخم شـیرینم، شـەکـەر بـارەکـەم
لە قەند شیرین‌تر، خوەش گـوفتارەکـەم
دڵـبەرم تـۆنی، تـۆی دڵـدارەکـەم
دڵخوەشیم هەر تـۆی، تـاکـە یـارەکـەم
تۆیچ دەست کـۆتا کـەر، لە ئـازارەکـەم
کـەم سـزام بـدەر، هـەی نـازارەکـەم!

١- خوێن.
٢- فرمێسك.
٣- مەمێلە.

## «سینی»

«سـینی» قـەشەنگەن، سینی قـەشەنگەن
«سـینی» سـیمین‌تەن، سیما قـەشەنگەن
نەشکوفتەن، تازەن، گـوڵ‌غونچە ڕەنگـەن
گوڵ‌غونچەکەی وەك، «سینی» قەشەنگەن
ئـــەبرۆ کـــەمانەن، مـــوژە خـــەدەنگەن
مەیلش ها لە سـوڵح، نـازش لە جـەنگەن
نـــیاواو نـــیم‌ڕەس، هـــێما هـــەرکـــاڵەن
کـــاڵاو بـــاڵا بـــەرز، وەنـــەوشە خـــاڵەن
ســـــڵخۆی خـــەیاڵی، وەڵـــەدغەزاڵـــەن
ڕەوێـــڵەی ڕەم کـێش، ڕامـیش مـەحاڵەن
پـــــەری‌پەیکەرەن، حـــــۆری ســـرشتەن
سەراپـاش وە نـوور، خـودایـی ڕەشـتەن
ســـیمای ســـیمین‌تەن، ســـیمین‌عوزارەن
ســـەرو ســـەهی‌تەرز، ســەوزەڕوخسارەن
بـــــەهار شـــێوەش، ئـــەوەن پـــڕگوڵەن
گـــوڵ لە لەتـــافەت، لوتـــفش خـــجڵەن
بـــــەهار عـــــومرش، خـــەزانش نـــەبۆ
«الله» ڕەنگ زەردی، ئـــــەرزانش نـــــەبۆ
نەبۆ گوڵ‌غونچەی، ڕەنگ و ڕووش بێ ڕەنگ
نـــەوێنووم هـــەرگیز، ئـــازیز وە دڵـتەنگ

بێداد لە شوومی، چەفتی چارەی من
هاوار لە نەحسی، بەدستارەی من
شەڕجۆی شەڕناشۆی، تیرشەڕ لە شەس
قەساس قاتڵ، خوێنی هەزارکەس
جەردەی جادووگەر، تەریدەی تەڕدەس
بە موویە موحکەم، دەس و پای پیل بەس
وە بۆی بادەی مەیل، «ڕۆسەم» خومارکەر
وە ئیشارەی چاو، شێر وە شکارکەر
لەب وێنەی غونچە، نێش ناز چون خار
شیرین چون شەکەر، تاڵ چون ژارمار
نەمام هەستیم، لە ڕیشە ئساوەرد
وە بسای فەنا دا، گەردم بەرد وە هەرد
«ئەحمەد» هەمیشە، وە مەیلش مەسەن
تا مەحشەر وە تای، زڵفش پابەسەن



## دیدەم دیدەی بەد

دیدەم دیدەی بەد، دیدەم دیدەی بەد
لە دیدەت دوور بۆ، دیدەم دیدەی بەد
سەوڵ سیم‌ئەندام، سەرو سیما قەد
شیرینیت شیرین، خارجەن جە حەد
شەکەر زوانیت لە حەد بیەن ڕەد
وە زوان بەستی زوان «ئەحمەد»
مەسپارووت بە زات، «اَللّهُ الصَّمَد»
هەنی نەوێنی، لە دونیای دوون بەد
خاترخار مەبەر، چەرخ یەکارشەن
پای نازاران لەنگ، لە بازارشەن
شیرینێ نەوی، چون تۆ شیرین بۆ
سەوزە و بالابەرز، زلف عەنبەرین بۆ
«گوڵ ئەندام» کەنیز، دەست و جامت بی
هەزاران «بەهرام»، گرد دامت بی
«عوزرا» مەعزوورەن، لە ڕووی جەماڵت
«وامق» وامەندەی، عەقڵ و کەماڵت
«لەیلێ» پەشێو زلف، پڕپەشێوتەن
«مەجنوون» لێویای، خاڵ لێوتەن
«تەرسا» کەی چون تۆ، وەش تەرز تەور بی
«سەنعان» وا پەرێش، بێ‌تاب سەور بی

ئیسە من «سەنعان»، تۆ هەرئەو «تەرسای»
نەتەرسای لە حەق، ئەحوالْ نەپەرسای

خوەش بی تۆ «تەرسا»، من «سەنعانت» بیم
هەر ساتێ سەدبار، وە قوربانت بیم

ئیسە بۆ وە یاد، ویەردەی وەرین[1]
من کەر وە «فەرهاد»، وێت کەر وە «شیرین»

هەرئان مونتەزر ئامای ئازیزم
کەرۆ وە بەهار فەسلْ پاییزم



١- ڕابردوو.

## شەم جەماڵەکەم

شەم جەماڵەکەم، شەم جەماڵەکەم
ئاریێ های ئازیز، شەم جەماڵەکەم
تەسەلای دڵەی، پڕ خەیاڵەکەم
قووت غەزای ڕۆح، ماه و ساڵەکەم
ئەگەر مەپەرسی، چوونەن حاڵەکەم
ئەدیبەی عاقڵ، پڕ کەماڵەکەم
جەوساوە دیدەم، لە دیدەت دوورەن
خوار و خومار و، زار و بێ نوورەن
دیدەم کام دیدە، ئەو دیدەی ئاهوو
بە دین دیدەت، داروو ئارەزوو
نەقشش کارگای، دیدەم گەرتەن تەنگ
خاوەر دوور لە ڕووم، ڕۆمی دوور لە زەنگ
سوورمت سیمای ساف، چون ئاوحەیات
حەبەن لە حەڵقەی، دایەرەی زوڵمات
مەوج لەتافەت، لە ڕووی لەوحەی سیم
چون زەنجیرەی ئاو، وە شنۆی نەسیم
زەنەقدان چون گۆی ئاو لە هەر لاوە
موعەلەق مدران وە ڕووی هەواوە
غەبغەب وێنەی، سێف خوونساری ڕەشتەن
ڕەشتەی لەقای حەق، باغچەی بەهەشتەن

ڕوشــن وێــنەی دوڕ، لەتـیفـتر لە گـوڵ
گـوڵ لە لەتـافەت، ئـەو مـاتە و خـجڵ
بــەیازەی بــەیزای، بــلووری گـەردەن
عـــاشقان پــەرێش، زووخ دڵ وەردەن
سیمەن، سـفیدەن، سـافەن بـێ گـەردەن
بـــــەیازەن بــەرزەن، زەریــفەن زەردن
ســـیایی زلــفان، بـێ گـەردی گـەردەن
نـــەقش مـــانیەن، پــەرێم تــا مـەردەن
مەخسووسەن غونچەی، نەشکوفتەی دەهان
ڕەنگـــینتر لە بـــەرگ، گـولباغی لەبـان
زیبای تـەبیعەت، گـوڵکـاری کـەردەن
عـاقیق وە مـەعدەن، مـرواری کـەردەن
بـەڕێزەی ڕازان، ڕێــزەی شـەکـەرڕێز
شیرین چـون شـیرین، شـیرین پـەروێز
وە نــــاز عشــــوە، دڵ مــــەکــاونی
بــە مــەیل مــۆبەت، سـەنگ مـەتاونی
خۆرشید شەرمەندەی، شەوق شێوەتەن
ماه مەعزوور لەڕووت، ئەختەر لێوەتەن
شمشاد سـەجدە بـەر، بـەرزی بـاڵاتەن
ســـەرش سـەر بـوڵەند، گـەرد پـاڵاتەن
«تـــارانـــی» تـەرزان، «شـیرازی» شـێوە
هەرکەس مـوینۆت شـێت مـەبۆو لێـوە

«کەوك» خوەش‌خەرام پـای کـۆسارمی
سۆسك[١] سۆسەن خاڵ پـای نسـارمی



## وەسفی یار

ئاهوو لە سەر خەت، شمش زەڕێ دیـم
شـــمش ڕاویـــان، لؤلوی تـــەڕێ دیـــم
«لؤلؤ» بەستەی قولف، قـاپی قـەڵا دیـم
قـــەڵا لە شـــاخەی، تـــۆپێ تـــەڵا دیـم
تەڵای تۆپ لە فەوق، قولەی قـافێ دیـم
قولەی قـاف وە بـان، بـەحرسافێ دیـم
وە رووی بەحرەوە، دوو گۆی گەوهەر دیم
لە گەوهەر چەشمەی، شیر و شەکەر دیم
ئەو جۆی شیر ڕەوا، وە بـەهەشتێ دیـم
ئەو بەهەشت ڕەوا، وە گوڵ گەشتێ دیـم
یـەك جـەماڵ مـاە، دوو حـەفتەمێ دیـم
عەقرەب لە قـەمەر، غـەزاڵ‌چـەمێ دیـم
تیپ سەیاحی، دەیـجوور زەنگـێ دیـم
چەنی تورك مەست، مەخموور جەنگێ دیم

---

١- تەیهو، باڵدارێکە لە جنسی کەو بەڵام بۆرە

تورکان تەڕدەس، شەڕ جۆی شەڕێ دیم
تیرشان لە خۆی، ئاهووی بەڕێ دیم



## جام جەم جەمین

جام جەم جەمین، جەمین جامەکەم
تازە ڕەسیدە، نەو نەمامەکەم
حەکیم حازق، «لوقمان» فامەکەم
مەڵهەم دڵەی، تازەزامەکەم
کەمەند زوڵفت، بەخەی بێ‌درێغ
ماوەری سەد چون، قولەی قاف لە بێخ
وە تێغ ئەبرووت، دوو نیمم کەرە
وە ڕێزەی ڕازان، سەد قیمم کەرە
بۆ مەزەی لەزەت، زەردە خەندەکەت
پەی نەشەی مەستی، تازە بەندەکەت
وە بەهای گیان، وە پێم بفرۆشی
خوەشە خومت وە دەس، خومت پێم بنۆشی
وە موژگان تیر، موژەی شەست چەم
لە پا دەر تێریت، هەزار چون «ڕۆسەم»

ئەر وە دیدەی ناز، بدیەی وە «پەڕاو»[1]

«پەڕاو» پەڕ تاپەڕ، مەکەری وە ئاو



## سۆسەن خاڵێ دیم

شیرینی شێوەی، شەم جەماڵێ دیم

کان مەعریفەت، کۆی کەماڵێ دیم

چ قەد چ قامەت، چ شمشاڵێ دیم

چ سەرو سەهی، سۆسەن خاڵی دیم

چ سێف چ نارنج، پرتەقاڵێ دیم

نارنگی و ترنج، لیمۆی کاڵێ دیم

نەقش و نگین و، لەعل و لاڵێ دیم

دوڕو مەرجان و، لێو و خاڵێ دیم

زەنەخ چون گۆی سیم، تەڵای قاڵێ دیم

هەر خاڵێ قیمەت، یەك مەحاڵێ دیم

چ بەت چ بۆرچین، قوڵەنگ و قازێ دیم

چ چەرخ، چ شاهێن، چ شابازێ دیم

نەمەردام ساتێ، نە جای من مەویای

چون من دوو دیدەی، سیای وێت مەدیای

---

١-کێوێ بەرز و دیاری لە نزیکی شاری «کرماشان».

بەر مەشیا جە ڕای، ئی شەهد تاڵی
وێت مەدیای ئەو وەخت لێت، مەویا حاڵی
عەقڵ و فکر و فام، هۆش و بەشارەت
گشت بە نیم‌نگات، مەدای وە غارەت
وە ئیلا من وێم، تۆ هەر وێتەنی
بێ سوودەن واچوون، ماچی شێتەنی
من کەرە وە «کەوك»، دیدەت کەر وە «باز»
باز هەم تۆ ماچی وە من بێ حەفاز
فیدات بام شیرین، شەکەربارەکەم
لە شەهد شیرین‌تر، خوەش‌گوفتارەکەم
شاباز شەش‌دانگ، شۆن شکارەکەم
شاباڵ شاهێن، شەو بێدارەکەم
«چەرخ» چابوك چەنگ، چاو خومارەکەم
«هەڵۆی» وە هەڵمەت، کڵاودارەکەم
«کەوك» پا نەخشین، پای کۆسارەکەم
سۆسك سۆسەن، خاڵ سای نسارەکەم
ڕەوێڵەی ڕەمکێش، سەرقەتارەکەم
لاقەید لە شنۆی، میر شکارەکەم
بویەر لە تەقسیر، دەورەی ویەردە
مەکێشە وە بەین دۆسیمان پەردە
دڵ «ئەحمەد» بە تیر، نازت زامدارەن
وە مەڵهەم مێهرت، برینش چارەن

★ ★ ★

## بۆی عەتر گوڵت

بۆی عەتر گـوڵت، پـەی نـەشەی حـاڵم
نـــاغافڵ شـــەماڵ، ئـاوەرد وە مـــاڵم
عـــــــارفانەوار، وە چ کـــــــەماڵێ
ســـڵامش کـــەردم، پـــەرسام هـەواڵـێ
واتـــم: فـــیدات بـــام، پـەیك پـڕهونەر
مـــەحرەم ئـــەسرار، دڵـــدار و دڵـــبەر
قەدەمت وە خەیر، مـوشەڕەف کـەردی
پەی سەرفەرازیـم، تـەشریف ئـاوەردی
ڕاست واچە سـا دەی، سـەرم لە ڕێتەن
چـــمانێ نـــامەی، ئـــازیزم پـــێتەن
وات: بـــەڵێ نـــامەی، نـــازك خـــەیاڵێ
ئـــوستاد دانـــای، ســـاحێب کـــەماڵێ
بەستەن کیاستەن، پەیت چون دەستەی گوڵ
بـــاز کـــەر بـــوانـە، پـەی تـەسکین دڵ
دیم نامەی نامی، هام فەردەکـەی فـەرد
بـــەر ئـــاوەرد و دیـــم، مـوتاڵعەم کـەرد
بـــــۆسامو نــــیام، وە ســــەر بـــینایيم
ســـفیدم تـــەبدیل، کـــەرد وە ســـیاییم
ڕەفـــیق شـــەفیق، هـــەردە جـــارانــم
ســـەفا بـەخش، نـەخش بـەزم یـارانـم

دڵ مـــەدەر وە دەس، تـــازە نـەوڕەسان
وێت مەوزە وە دام، سەوزە و چاومەسان
دیـنشان پـەی دیـن، دیـنداران سـەمەن
ئـەرچ دیـن بـێ دیـن، دڵـبەر ستەمەن
نـمەشۆ وە یـاد، دۆسـەکـەی گـیانی!
ئـــەو ڕۆی کـونگەرە، وا وێت مـەزانـی
سـەیرکـونگەرەی، سـافو سـادە بـی
تـــماشای ئـــازیز، فـــەوقەلعادە بـــی
لەو ڕەســـــتاخێزە، قـــــیامەت خـــێزا
ئازیز پـەڕەی نـوور، خـوەرشید مـەبێزا
زڵف کەرد وە زەنجیر، خـاڵش بـە دانـە
بـــە دام مـــاوەردش، خـوێشو بـێگانە
هەر مـورغ ڕۆحـێ، مـەدیا ئـەو چـاوە
پـــاش پـــابەند مـەویا، بـەو دانـەو داوە
دوو مار دوو ئەژدەر، لە سەر دۆشش بی
پاسەبان حـەڵقەی، تـەڵای گـۆشش بـی
دوو تورك دوو کەمان، دووسەد تیرش بی
هەر تیرێ دووسەد، شێر نـەچیرش بـی



## من سەرعیو لێوە

من سەرعیو لێوە، تۆ وێنەی مەجنوون
تـــۆ دیـدە گـریان، مـن دیـدە پـڕهوون
تۆ پەی دین لەیلێ، مـن پـەی دیـن تـۆ
تۆ های لەکام کاو، مـن هـام لە کـام کـۆ
من پەی تۆ خەریك، تۆ هەردەی دوجەیل
من هەر شەیدای تۆ، تۆ هەر شێت لەیل
بەڵکە بای موراد، نە سەحرای دوجـەیل
مـن یـاونۆ وە تـۆ، تـۆ یـاونۆ وە لەیـل
یەك ڕۆ نە جایە، سەحرای خوەتەن تەرز
دا وە دەسـتمەوە، نـامەت «فـەرامـەرز»
نامەم گرت لە دەس شـێربەچەی شـێرگیر
مــوتاڵعەم کــەرد دیــام بـەو تـەحریر
جە وەشیت ئەی سەرو،نەو سوەیل ڕەشتەم
تەجدید بی جە نەو، عـومر گـوزەشتەم
گـلەگـی نـامای، نـامەت لێـم کـەردەن
نـامای نـامەی تـۆ، ئـەرواحـم بـەردەن
ڕاسە هـام وەکـێش، گـیسوو کـەمەندان
ئامێتەم وە عـەشق، سـەرمەشق ڕەنـدان
سا من کەی چون، تۆ زامـم خـەتەرەن؟
کەی چون تۆ دیـن و، دنـیام دڵـبەرەن؟

کەی من وینەی تۆ، خرقەپۆشانم؟
کەی من چون تۆ شێت، نازفرۆشانم؟

ڕاسە دوڕ نەگۆش، ساحێبهۆشانم
هامپیاڵەی بەزم، نازفرۆشانم

نازان چون خەفتان[1] وە سەر پۆشانم
ڕسوای ڕابتەی، مار لە دۆشانم

من بێ ترس لە تیر، تانەی ڕەقیبان
زوانم جە وەسف، شۆخان نەکێشان

شایستەی ئەوساف، وەسف سفاتی
من گلە داروم، کەم ئیلتفاتی

گلە وەگلە، ببۆ موتابق
نە تۆ چون جاران، نە من چون سابق

تەفرەقەی شادی و شۆر گرینم
بێ تۆ ئامێتەن، هوون و ئەسرینم

قەسەم بەو کەسە، نەزا و نەمەردەن
دووری باڵای تۆ، کارێ پێم کەردەن

هۆش و گۆش و نوتق، قە و عەقڵ و فام
عەشق و شەوق و زەوق، نەمندەن جە لام

وەختە بپۆشون، ڕەدای ڕەهبانی
پەنەم بواچان، «سەنعان» سانی

فێشتەر جە هیجران نەدین باڵات
جەو ساوە ئازیز، دوور کەفتم جە لات

---

١- جل و بەرگی جەنگی.

بـــاوەقوش ئـــاسا، شـــەوبێداریـــمەن
خـەڵكان هـەراسـان، شـین و زاریـمەن
من هەر ئەو مەجنوون، دێوانـەی لەیـلم
تۆ مەیل سەرد نەویت، من گەرمە مەیلم
یـەك نـیمشەو جـاریٚ، بـڕەس وە دادم
گوشاد کەر موشكل، عـوقدەی مـورادم
«شیرین» چون «فەرهاد»، «بێستوون» وە من
قوڵەنگ غەرق لە فەرق، غەرق هوون وە من



## زەبوونم کەردەن

ڕەمــز ڕۆزگــار، زەبــوونم کــەردەن
تەبدیل بە ئەحواڵ، مەجنوونم کـەردەن
لە گەردش چەرخ، چەواشەی چەپگەرد
بەرگەردەن موهرەی، تـاس تـەختەنەرد
ئەرچی کەس لە جەور، زوڵمش نەڕەستەن
ئەفشارم گەرتەن، شەش دەر لێم بەستەن
شانسم چەنی تاس، هـا لە کـەشاکـەش
دوو خاڵ ماوەرۆ نە جاگەی دوو شەش
هەر ئان خـامۆشەن، شـەمع شـادی دڵ
ڕۆشـن نـاوێ مـەر، بـە تـماشای گـوڵ
وێنەی پەروانان، بـێ پـەرواو بـێ غـەم
سووختە و کەفتەی، سایەی پایەی شـەم
زارو زویـــرو، زەدەی زام بـــە ســۆ
زاریمەن پەی بەخت، سیام شـەبو ڕۆ



## سووزانی جەرگم

«سووزان» سووزندەی، سووزانی جەرگم
زام بە سۆم کەردی، تا بە ڕۆی مەرگم
تا مەحشەر کەردی، زەدەی زامەتم
هەم دنیام سووزان، هەم قەیامەتم
بزووسکەی ئاهر، نازت بێ ئینساف
مەکەرۆ وە توور، ئەر بگنۆ وە «قاف»
وە نێش موژەی، خەدەنگ خۆی کاری
سوهەنای سەنگ سوم، «ئسفەندیاری»[1]
چون «ڕوستەم» بنیەر، وە قەوس ئەبرووت
بکێشە وە کێش، کێش باف گیسووت
بە سەد نزاکەت، سەوزەی نازفرۆش
بکێشە هەرتا، مەیاوی وە گۆش
وە ئیشارەی شەست، نازت بدەر لێم
تا لە ڕۆی مەحشەر، باوەڕ کەران پێم
بەڵ بۆ بە شاهید، «یوم‌الحسابم»
شەهید عشقم، نەدەن عەزابم
مەواچان: عەزاب قیامەت بی شۆن
قیامەت کەی وەك دووری باڵای تۆن



---

١- میلێ موحکەم و تێژی پۆلایی کە ئەسفەندیار بە هێزی بازو بەردی پێ کون کردوە.

## شەکەرنۆشەکەم

ئەرهەی شیرین شۆخ!، شەکەرنۆشەکەم
ئەرهەی زام بە سۆی!، دڵ وە جۆشەکەم
ئەرهەی شازادەی!، ترمەپۆشەکەم
حەڵقەی غوڵامیت، ها نە گۆشەکەم
مەمنوونم کەردی، نەونەهاڵەکەم
سەمەن بۆی سادەی، سۆسەن خاڵەکەم
سەرشار بیم لە شەهد، شەکەرگوفتاریت
مەمنوون بیم بە لوتف، بوزرگەواریت
چەشم و چراغ من، وە ڕەوشەن کەردی
یانەی دڵ مەسروور، وە گوڵشەن کەردی
وێنەی پەروانان، لە دەوران شەم
یەك ئیمشەو وە شاد ویاران وە هەم
من لە شەوق ئەو، ئەو لە شەوق دڵ
دەست بەرد یەك دەستە، لە وەنەوشەو گوڵ
وێنەی سەرافان، فەهمیدەی عارف
دیدەم دای بە تۆ، ئازیز وە تارف
تا سەندی لە دەس ئەو جەمین چون گوڵ
بۆ نیا وە بۆش، وە ئارەزووی دڵ
وە حەسرەتەوە، شکۆفەی چاومەس
نیام پەی جەستەی، خەستەم لە ڕووی دەس

مـــالاّم لە دیــدەو، بــۆ نـیام وە بـۆش
تـا مـەردەن نـیەن، جـە لام فـەرامـۆش



## ڕەعنای شۆخ و شەنگ

ڕەعنای شۆخ و شەنگ، ڕەعنای شۆخ شەنگ
شۆخ کەس‌نەدار، شەیدای شـۆخ و شـەنگ
پشت کۆتا پا بەرز، قەد بـاریك دەم تـەنگ
نیم نگا چون بـاز، چـەرخ چـەم قـەشەنگ
وە عــەرز بــەندەی، خــوار خـاتر تـەنگ
گۆش دەر بە شەرتێ، نەکەریش وە جەنگ
بــنوازەم بــە نــاز ســەوزەی خـاتر تـەڕ
وەســەن وە هــوونم دامــان مـەکـەر تـەڕ
هـەرهای لە گـوریێز، چـون غـەزاڵـەی بـەڕ
گاهێ های لە سـوڵح، گـاهێ هـای لە شـەڕ
وەســـەن کــۆتا کــە، چــەنیم داواو شـەڕ
دانی لە حەفت ئاو[1]، قـابت نـەویەن تـەڕ



١- داوتە لە حەفت ئاو مەبەست هۆشیاری و زیرەکی‌یە.

## سەوزە

دایـــم هـــامنشین، شـــای مـــەهوەشانم
هـــــامپیاڵەی بـــــەزم نـــــازفرۆشانم
وە ئەندۆهناکی، عـەرزەی وێـم قـەسەم
وە خاڵ ژێر لێـو، سـەوزەی وێـم قـەسەم
هــەر تــا نــەپیچۆن، وە سفیدبەرگم[1]
بــەرز نــەبۆ لە عــام، ئــاوازەی مــەرگم
ســـەرد نــەبۆ گــەرمی بــازاڕ فــەردم
شین نەکـەن شـۆخان، جـە ناڵای دەردم
تا سەوزەم ڕۆخسار، وێش وە سەرناخوون
وە ڕووی ڕەخـتمدا، نـەکـەرۆ گـوڵگوون
وە تـێشەی نــازش، نــەکــەنێ قــەورم
وە زاری نـــــەکــات، وە گــوڵزار دەورم
بــە ڕێـــزەی ڕازان، کــەرۆ گــوڵکاری
وە ســـەیل ئــەسرین، قــەترەی مــرواری
وە نســـــیم مـــــەیل ئـــاوپاشی کـــەرۆ
خاس چون شێوەی وێش، نەقاشی کەرۆ
«ئەحمەد» تیر ناز، سـەوزەش هـا لە دڵ
بـەر نـەشی لە دڵ، تـا بـەردش وە گـڵ[2]

★ ★ ★

١-کفن، جلی مردوو.
٢- قەور.

## قەسەم نامە[١]

دیدەم زەروور بی، دیدەم زەروور بی
دیدەم پەی دیدەن، دیدەت زەروور بی
جەو ساوە دیدەم، لە دیدەت دوور بی
زەینش نابینان، بیناش بێ نوور بی
ئیسە ها دیدەم دیدەت دیمەوە
مەردە بیم چمان زندە بیمەوە
شۆخم شیرینم شای شەکەرتەرزم
بە ڕووی لوتفەوە گۆش دەر وە عەرزم
ئەوەن ئارەزووی دین تۆ داروومی
وەختەن لە دووریت گیان بسپارووم
اَلْحَمْدُلِلّٰهِ دیدەم نەمەردم
دیدە پەی دیدەن دیدەت ئاوەردم
با دەست ماچ کەم قەزای دەست لێم
قەزای دوو دیدەی سیای مەست لێم
قەزای فکرو فام کەماڵەکەت لێم
جەمین جام قەزای جەماڵەکەت لێم
قەزای بێ گەردی گەردەنەکەت لێم
لە مینا گرەو بەردەنەکەت لێم

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی لە تەمەنی سی ساڵیدا وتووە.

قــەزای قــەشەنگی نــازو شــەرمت لێــم
قەزای مەیلەکەی وە مەیل گــەرمت لێــم
قەزای قەوڵو شەرت وەفاو مەیلت لێم
قەزای سەختی وەخت دڵەی کەیلت لێم
قــەزای مــەحەبەت مــێهرو وەفــات لێــم
قەزای قین و قــار ســوڵحو ســەفات لێــم
قــەزای شــیرینی ڕیــزەی ڕازت لێــم
قــەزای تــورکەکــان ئــیرئەندازت لێــم
قــەزای دڵســۆزیو دڵــنەوازیت لێــم
قــەزای شــیرینیو شــەکــەر ڕازیت لێم
قــەزای ئــیفادەو لارەو لەنــجەت لێــم
قەزای پاو خــاڵ دەس و پــەنجەت لێــم
قەزای خــاڵەکــەی نــەقش سینەت لێــم
قەزای وێــنەکــەی دی بــێ وێــنەت لێــم
قــەزای بــاڵاکــەی عــەرعەر بێزت لێــم
قــەزای شــاماران شــەڕئەنگێزت لێــم
قەزای مەسی مەی دیدەی مــەست لێــم
قــەزای عــەزیزی عــەزیزکەست لێــم
قــەزای ئــارەزووی عــوقدەی دڵت لێــم
قــەزای دڵــەکــەی پــڕ لە کــوڵت لێــم
قــەزای غــەریبی غــەریب کــەفتەت لێــم
قەزای ئێش سەخت زام نەسرەفتەت لێم
قــەزای زڵــفەکــەی پــڕ پــەشێوت لێــم
قــەزای خــاڵەکــەی ژێــر لێــوت لێــم

قەزای دوو دیدەی شەو نەخەفتەت لێم
چاوەڕێی ئازیز غەریب کەفتەت لێم
وە حەڵقەی زنار گیسووی وێت قەسەم
وە تاق محراب ئەبرووی وێت قەسەم
وە پێشانی پاك پڕ نوورت قەسەم
وە نوور دیدەی مەخموورت قەسەم
وە کوڵم گوونای گوڵناریت قەسەم
وە ڕەنگ و ڕوخسار بەهاریت قەسەم
قەسەم وە خاڵان خودا ڕەشتەکەت
وە گەشتو سەیران دەرو دەشتەکەت
قەسەم وە قامەت لارەو لەنجەکەت
وە گەنجووری ناز پڕ لە گەنجەکەت
قەسەم وە بینی سیمین خاوەکەت
وە بۆی هەناسەی گوڵ گوڵاوەکەت
قەسەم وە لەبان مەی گوونت قەسەم
وە دوڕدانەی دوڕ مەکنوونت قەسەم
وە سەحەر خێزی بەیانیت قەسەم
وە سەفای سوورەت سەرکانیت قەسەم
وە کێش کەمەند مشکینت قەسەم
وە چین چەتر پڕ چینت قەسەم
وە مەغرب رووی بەیانت قەسەم
بەیان وە مەغرب عەیانت قەسەم
وە نێش موژەی خەدەنگیت قەسەم
وە زیبای زینەت قەشەنگیت قەسەم

وە ڕووناکی ڕووی پێشانیت قەسەم
وە نەقش ئەبرۆی قەترانیت قەسەم
قەسەم وە خەندەو گریانت قەسەم
وە چەقەو قرچەی بریانت قەسەم
وە بۆی شەوبۆی زڵف شەوانت قەسەم
وە جسمو جەوهەر، ڕەوانت قەسەم
وە تاریکی لەیل وە نەهار قەسەم
وە سەختی زمسان وە بەهار قەسەم
وە فەسل تاوسان پڕ شەرەر قەسەم
قەسەم و پایز پڕ سەمەر قەسەم
وە بەرزی چنار سەوزی سەوڵ قەسەم
وە قەدرو قیمەت وەفاو قەوڵ قەسەم
وە نەزرو نیاز نەواڵەت قەسەم
وە ئاەو ناڵەی بێ ناڵەت قەسەم
وە کاڵی لیمۆو، زەردی بەی قەسەم
وە دەنگ ناڵەی نەوای نەی قەسەم
وە تریکەی تار مووکەشان قەسەم
وە چۆپی و چەپی مەهوەشان قەسەم
وە نەشئەی نمای نەوهاڵان قەسەم
وە دیدەی سیمای غەزاڵان قەسەم
وە تەجەلای خوەر وە قەمەر قەسەم
وە مانگو وە خوەر وە ئەختەر قەسەم
وە بادو باران هەورو وەشت قەسەم
وە سەفاو سەیران کۆو دەشت قەسەم

وە هەورو باران، بەهاران قەسەم
وە ڕەنگینی ڕەنگ نگاران قەسەم
وە بەفرەبەقووی یاهووان قەسەم
وە قەسپەی کەوان سەرکوان قەسەم
وە سیمای سوورەت دەروێشان قەسەم
وە ئاەو نالەی دڵڕیشان قەسەم
وە چەشمەی ئاوان گەرمو سەرد قەسەم
وە زکر تەوحید دارو بەرد قەسەم
قەسەم وە عەتر چنوور ڕاخان
وە فەزاو سەفای سەبای ئیلاخان
وە سروەو نەسیم بای بەهار قەسەم
وە تاڵ تاڵ زڵف کرژیار قەسەم
وە خەوش‌و خاشاک بای زلان قەسەم
وە خاڵ گەردەن کەڵملان قەسەم
وە ئاو کانی جۆگەو چەم قەسەم
وەو وەسڵو ئومید خاترجەم قەسەم
وەکۆی «ئاویەر» «کوردستان» قەسەم
وە نازکی ناز چاو مەستان قەسەم
قەسەم وە پیران سەحەرخێز قەسەم
وە جوان مەردان خۆ پارێز قەسەم
وە ئاو شەفای شادیدەر قەسەم
وە چەشمەی خزر «ئاویدەر» قەسەم

وە «ڕێزە»[1] و «زیکەی «ساراوەن»[2] قەسەم

وە دوودو دەمەی دەماوەن قەسەم

وە شێوەی شۆخان بێوێنە قەسەم

وە سەفای سەراو «شەروێنە»[3] قەسەم

قەسەم وە زەردی خوەراوا قەسەم

وە قەلەندران بێ ماوا قەسەم

قەسەم وە سەباو ئێواران قەسەم

قەسەم وە ماە و ستاران قەسەم

وە حوسن بەهار ئازیزان قەسەم

وە ڕەنگ‌زەردی ڕەز پایزان قەسەم

وە زام «فەرهاد» «بێستوون» قەسەم

وە داخ‌داری لەیل وە مەجنوون قەسەم

وە شێوەی شیرین وە پەرویز قەسەم

وە ئێش زامان دژنەی تیز قەسەم

وە ئەندۆهناکی عەرزەی وێم قەسەم

وە بەرزی باڵای سەوزەی وێم قەسەم

وە پەرێشانی زڵف تۆ قەسەم

وە نازاری ناز تڵف تۆ قەسەم

وە بێ دەرمانی دەرد دڵ قەسەم

وە ناڵەی بولبوڵ عەتر گوڵ قەسەم

وە مەیل لەیلێ وە «مەجنوون» قەسەم

وە «فەرهاد» وە عەشق «بێستوون» قەسەم

---

١- ڕێزە و زیکە ناوی شوێنێکە لە باوە جانی کە ناوی شەفا بە خشیان هەیە.

٢- ناوی کێوێکە لە نزیکی ڕێزەدا.

٣- شارێکە لە نزیکی جوانرۆ. (سەراو باڵاخانی).

وە نەقش شاپوور ڕەنج وە باد قەسەم
وە شوومی «شێرو»ی نامراد قەسەم

وە ناڵەی «خەسرەو» دەم خەو قەسەم
وە شین شیرین نیمەشەو قەسەم

وەی گشت قەسەمە ئەمن وەردەنم
دەك دەست چون دەین شۆ وە گەردەنم

دوو مار زڵفت بووزە لە دۆشم
چون «زەحاك» كەران سەر وە تۆی گۆشم

هیچ نیەم وە تەنگ ماجەرای ئێشم
شەرتەن تا مەحشەر نازیان بكێشم

سا بۆ تویچ چون من ئەر وەفاداری
مەسمومی وە مەی بادەی دڵداری

بنیشیم ساتێ وە ئارەزووی دڵ
ئەر سەم وە سەم بۆ سەم مەبۆ باتڵ

«ئەحمەد» سەناخوان شێوەی شەمتەن
ئەرچسە موبتەلای زەهر سەمتەن



## ئازیزم قاربی

ئــــازیزم قـــاربی، ئـــازیزم قـــاربی
ئــیمسال نــەوبەهار، لە بەختم قـاربی
ســومایی بــینای، دوودیــدەم تـاربی
دیدەو دڵ پـەی دیـن، تـۆ بـێقەرار بـی
چەمان چمان چـەم، لە چـەم بێزاریـی
چــون لە چــەمەدا، چــەم نـادیار بـی
قامەتم چــەمان، چــەمیان چــەم وەردەن
چـــەمانم چـــمان، چـــەمان پـردەردەن
لەیـــلم نــــەهارم، داج دەیــجوورەن
بـــینایم بـینام، بـێ تـۆ بــێنورەن
گـــوڵم ســـونبوڵم، تــەسەلای دڵــم
وەهــار فـەرەحش، نــیەن بــێ گـوڵم
بــوڵبوڵان یــەك یــەك، وە سـەرشارەو
بـــەو ســەوت نــوای، نــەوبەهارەوە
بــەو کــزەو ســووزەی، زەوق دڵــەوە
بە ڕووی گوڵ نیشتەن، وە ڕووی چڵەوە
هەر یەك وە نـەوعێ، شـین و زاریشـەن
هـــەر یــەك لە گـوڵێ، ئــینتزاریشـــەن
بــوڵبوڵەکـەی دڵ، مــن بـێقەرار بـی
بـــە دڵ مــەناڵا، گــوڵ نـادیار بــی

فـــغانش بــە یــاد، یــادگاریت بــی
مـەرامش بـەمەیل، شـەو بـێداریت بـی
گا مەست سەرشار، گـا پـەشێو لە دەرد
هەر شـەو مـەنالۆ، تـا وە شـەفەق زەرد
وێنەی پەروانان، سـووزیای پـای شـەم
کەم کەم گیان تەسلیم، مەکەرد وە بێغەم
چەقەی چریقەی، شـەقەی چـۆقەی دڵ
قـرچـەی قـەقنەسم، مـەنزڵ وە مـەنزڵ
مەشیا تەی مەکەرد، سەحراو دەشت و دەر
چون تەم نیشت لە بورج، قولەی «ئاویەر»
هەر ئەوەن پەی دین، دیدەت تـاسەمەن
«ئـاویەر» عـاجز، دووی هـەناسەمەن
سـا بـدیە دیـدەم، جـە هـەر سـەحەردا
وە دووی هـــەناسەم، لە «ئـــاویەر»دا
بەڵ ساتێ بە دیـن، دیـدەت بـێتەم بـۆ
ســاکــن لە دەرد و، فـارغ لە غـەم بـۆ
ئەسرینم چون ڕوود، ڕۆخانە[1] هەر ڕۆ
یـــا تـــاف لافـــاو، ئـــاو «گـــاوەڕۆ»
ســـەروازەن وە بـــان، کـــۆی بـــریانەوە
تـــوغیان ســـەیل کـــەرد، وە گـــریانەوە
دوور بــا شــــنەفتم پـــەشێوەن حـــاڵت
بـــۆ ئـــێش ســـەرو، بـــۆ زام بـــاڵت

---

١- ڕوود یەعنێ: چۆم، ڕووبار، ڕوار، بەڵام ڕۆخانە بە ئەو شوێنە دەڵێن کە ئاوی ڕووبار لە سەریدا جەریانی هەیە، جێگەی ڕوود.

لە تـــاوشت دەرد، ئــێش زام تــۆ
پـــەی ئـــاه و نـــاڵەی بـــێئارام تــۆ
ئـیسە بـرپاگـە، بـۆت ئـارامەکەم
بـۆزامت نـاسۆر، کـەفتەن زامەکەم
چێش مـەبۆ ساتێ بـێ ئێشش کەری
وە مـەڵهەم مـەیل سـاپێشش کەری



## دیدەم بێ دەماخ

دیـدەم بـێدەماخ، دیـدەم بێدەماخ
ئەو ڕۆ دیم دیدەت، دیدەم بێدەماخ
خـەم دا لە غـەمدا، قـامەتم بـێقاخ
پەی بێ دەماغیت، هەر مەکێشام ئاخ
هەر های لە گوریز، چون باش تەتاران
وێت پـەنا مـەدا، لە مـیرشکاران
من هەم چون سەیاد، لە گۆشە و کنار
جۆیات بیم مەخفی، نەك وە ئاشکار
سـەرسام سـادار، ئـاشوفتە حـاڵێ
دیم ئـاما ویـەرد، بـەچە غـەزاڵێ
مەشغووف بیم لە کەیف، شادی دام وە دڵ
ڕەنگین بێڕەنگم، ڕەنگینتر لە گوڵ

چـــمان وه پـــێم دای، دنـیا سـەرتەمام
پـــەی دینت دیـدەم، بـی وه ڕەهـنمام
دیا له قودرەت، دانـای سـاحێب سـڕڕ
لەتۆی تـاریکی، مـەدرۆشا چـون دوڕڕ
شـــیرینان ئـاسا، شـــازاده دەســـتوور
دوور وه دوور مەدیای، وه ئەو بەزم سوور
دیدەت چون شاباز، تۆڕکەردەی شکـار
مەست نەو چون جاران، غەمین خومار
دیـــم کـــه وه بـــازی، نـــداری مـەیلێ
مـــــاتی، مـــاتڵی، عـــاجزی خـــەیلێ
دەستەی زڵف دێـز، سیای ڕەیـحانیت
مەلوول بـی وه بـان، تـەخت پـێشانیت
پڕچین بـی له قـین، ئـەبرۆی کـەمانیت
سەنگ مەکەرد وه ئاو، نگـای نـەهانیت
مــاه ڕوخســـارت، گـرفتەی غـەم بـی
بـــه دیـــن دیـدەت، دیـدەم مـاتەم بـی
غـونچەی دەهـانت، بـه نـاز شکـوفتەن
ئاخ به نـێش غـەم، ڕیشـەی دڵ سـفتەن
نــەمەردام بــدیام، جـــارێ جـــەماڵت
بـــبۆسام دەس و، پـــەنجەی شـمشاڵت
بغەلتام چون تاس، تـەختە نـەردەکـەت
بکەفتام وه خاك، پای بـێ گـەردەکـەت
دوو دیـــدەم وه گـەرد، پـاڵات بـساوام
ســـەیر کـــردام بـــاڵات، هـەرتا بـتاوام

بە وێنەی بولبوڵ، وە ئارەزووی دڵ
بێهۆش بکەفتام وە بوی عەترگوڵ
وێنەی پەروانان، لە دەوران شەم
بسووزام وە شەوق، جەماڵت کەمکەم
ئومێدەوارم، نەبۆ وە ئاوات
بازهەم بماڵووم، چەم لە خاك پات



## ئازیز غەمینەن

پووشین چون پەرچەم، مەحز ئیحترام
مەلوولەن وە بان، بالای نەونەمام
ڕیشەی دەسماڵان، لفکەی کەلاغیش
پەشێوەن وە بان، بەرگ قەلاخیش
نە شادی و نە شەوق، نە مەزاقشەن
گرەی غەم لە توی، ئەبرۆی تاقشەن
تسۆز غەم گرتەن، ئایەنەی ڕەنگش
تەبدیل کەردەن ڕەنگ، شێوەی قەشەنگش
شەماڵ بسۆ چون من، دڵ وە ناڵەوە
ئەو تسۆزە لە ڕووی، ئەو بماڵەوە
شەفاف دەر وە شەوق، شێوەی قەشەنگش
دوبارە چون گوڵ، ڕەنگین کەر ڕەنگش

دەستە کەر زلفان، سیای چین‌چینش
چین‌چین کەر وە بان، جام جەمینش
دایەرەی دو تاق، ئەبرۆش پڕ زەوق بۆ
لەب خەندان چون گوڵ، دڵ پڕلە شەوق بۆ
ئومێدەوارم، رَبُّ العالمین
هەنی نەوێنم، ئازیز وە غەمین



## یەك زلانێ هات[1]

ئیبتدا بە نام، یەکتای ئیلاهی
نگارەندەی چەرخ، لە ماه تا ماهی
سانع سەنعەت، سەماوات و ئەرز
سازش دەهندەی، هەر یەك وە یەك تەرز
بەرعەکس جاران، یەك زلانێ هات
رایحەی رەیحان، بەخشا وە وڵات
زلان ئەگەرچ، بایە خەتەرەن
خاس‌تر لە شەماڵ، دیسم موعەتتەرەن
شەمیمش وێنەی، رەوزەی بەهەشت بی
فەزاش فەرەح‌بەخش، سەفای گوڵ گەشت بی

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی لە جواوی نامەی یەکێ لە هاوەڵانی نووسیوە.

خلس‌تەر لە شەماڵ، شەیدای شەوق لە شەر
بەو تەور پۆشا بی، سەحرا و دەشت و دەر
ساف‌تەر لە نەسیم، خوەش بۆی موعەتەر
ئەمبەرئەفشان کەرد، «ڕوانەر» یەکسەر
سەرسام بیم واتم: داخم یە چێشەن
یاوا پێم و دیم، نامەی تۆ پێشەن
دیام بەو نامەی، عەمبەرڕێزەوە
بەو گوفتەی شیرین، شەکەرێزەوە
پڕ ئیلتفات بی، مەملوو لە بەینەت
فارغ بیم لە غەم، پەژارە و مەینەت
ئیزهار کەردە بیت، پەی تاسەخواریم
من بەتر بە تیر، دووری تۆ کاریم
ئومێدەوارم، نەسەبۆ بسە ئاوات
باز هەم بماڵووم، چەم نە خاك پات
بەشارەت نامەی، شیرین عیبارەت
غوسە و هەم و غەم، گشت دا بە غارەت
وە بۆی بادەی مەیل، عەتف سەفای تۆ
سەفا دام لە دڵ، وێم بە وەفای تۆ
بەو ڕێزەی، ڕازان عەمبەرین تۆ
بەوگوفتەی شیرین، شەکەرین تۆ
سەرشار و شاداب، لە شیرەی قەندت
لە فەردان فەرد، دانا پەسەندت
شاد بیم بە نامەی، موخلس‌نەوازیت
بە ڕوقعەی ڕەقەم، نوکتەپەردازیت

ئـەشعارت یـەك یـەك، سـەرافـی کـەردم
بـە ئـاهەنگ نـەزم، عـەرووز ئـاوەردم
یـەك نـەهج و مـیزان، بـێ تـەفاوەت بـی
توحفەی تـازەی تـەڕ، پـڕ تـەراوەت بـی
هەر چەند ئازیز گیان، دوڕ شکـافیت کـەرد
وەلێ چـەنی مـن، بـی ئـینسافیت کـەرد
چون چەندێ بە جەور، دڵ پارە کـەردی
بـێچارە چـون مـن، بێچارە کـەردی
خـەمدا قـامەتم، خـاس‌خاس لە غـەمدا
بـە مـورغ ڕۆحـم، دانـەی سـتەمدا
پـەروازەن وە ڕووی، سـەحرای عـەدەمدا
غـەرقەن لە گـێجاو، بـەحر مـاتەمدا
بە نێش سەر نێش، خاس نەقاشیت کـەرد
تـازە کـەردی زام، نـمەك پـاشیت کـەرد
بـاقی «والسّـلام»، «ئـەحمەد» فـداتـە
تـووتیای دیـدەش، گـەرد پـاڵاتە



# شیرین تاڵی‌یەن

شـــیرین تـــاڵی‌یەن، شـــیرین تـــاڵی‌یەن
شـــیرین شـــیرینیم بـــێ تـــۆ تـــاڵی‌یەن
چون قەقنەس جەستەم، کۆی زوغاڵی‌یەن
ئەفسووس شیرین کەی، تاڵیش حاڵی‌یەن
دڵ لە تـــاو تـــەو ئـــەڵهای ئـــاوشەن
گـــــل مـــەوەرد لە گـــل، گـــلاراوشـــەن
دڵ لە تـاو تـەوو، تـوونو تـاوی خـوەی
وشك‌و سووزانەن، لە بـێ ئـاوی خـوەی
چـــاو چـــمان ڕێشـــە، وە نـــێش تـێژێ
ئـــەو لە بـــاتی دڵ، خـــوێناو ئـــەڕێژێ
ڕەنگ زەردو زەعیف، لێـو وشك و پـڕبار
بـــــەهارم هـــەر ئـــان، زمســـان قـــەهار
بـــاغم بـــێ سـەمەر، بـاغچەم بـێ گـوڵە
بـــولبوڵم بـــێ گـــوڵ، مـــات و مـــاتڵە
ڕۆژم بـــی وە شـــەو، شـەو شـووم تـارە
دەردم بـــــێ دەرمـــان، زامـــم ئـــەوگارە
دەست‌و پـــا بـــەستەی، تـــۆڕدام دەورم
نـەماگـــە تـــاقەت، تـــەوانـــای ســـەورم
وەســـواســـەی خـەیاڵ، ئـەداو ئـارەزوو
سزام پێ‌ئەدەن، هـەر شـەو تـا شـەوسوو

ئـارەزۆو خـەیاڵ، ئـەدای وەسـواسـەت
خەریکن شیم کەن، هەر شـەو لە تـاسەت
لەو سـاوە «ئـەحمەد»، گـیر داوتـە
سـووزیاو سـووختەو، دڵ کـەواوتـە
زامـی هـەر بـە سـۆن، دەردی کـاریە
خـورد و خـوەراکـی، شـین و زاریە



## شنەفتم سادر کریان قەرارم

قـوربان قـەرارم، قـوربان قـەرارم
شـنەفتم سـادر، کـریان قـەرارم
ئـەر وێت بـە تـەدبیر، نـەکـەری چـارم
حـەتمی مـەکـێشۆ، ئـازیز وە دارم
بـفەرموو: ئـازیزا «ئـەحمەد» بێچارەس
کـەی قـابل ئـیعدام، یـا وە قـەنارەس
بـوەخشە خـەتاش، بـە تـای زلـف وێت
شـێتەن، دیـوانـەن، بـا بـواچـووم پـێت
ئەر داخ داری لێش، تویج هەر داخش کەر
گـوناکـارەنان، دیـلدوساخش کـەر
یـا وە ئـیشارەی، فـەڕاشـان چـاو
سـزاش دەر ئـەوەن، تـا مـەبۆ وە ئـاو

یــا بــازش بــەو زووخ، زامــان کــاری
بــــا هــــەر بــنالۆ، پــەی یــادگاری



## قوربان مەیلەکەم

قــوربان مــەیلەکـەم، قــوربان مــەیلەکـەم
تـازە بـی وە خــەت، نامەت مــەیلەکـەم
جۆش ئاوەرد دڵـەی، لە غـەم کـەیلەکـەم
خـــرۆشا ســیروان، ئــەسر سـەیلەکـەم
بــە غـــارەت بــەردی، فکـرو فـامەکـەم
نـــەشتەر دای لە زام، تـــازە زامــەکـــەم
کـــولیاوە زامـــان، نـــاسۆر کـــەفتەکـــەم
بێدار بـی ئـەروای، لە غـەم خـەفتەکـەم
ســـــەرتاپا وە نــــار، خـــەیاڵت گــرپیا
تـــاقەتم تـــاق بـــی، قـــەرارم بــرپیا
تـــا نـــامەت یـــاوا، بــۆ نــیام وە بۆش
ئـــاهر هــیجران، دووریت بـی خـامۆش
لە نــەشئەی نــامەی، بـــادە بــێزەکـەت
لە فـــەرمایشات، مـــەستی خـــێزەکـەت
شـــادم کـــەرد نسامەی، پـــڕ بـەشارەتت
بـە شـێوای شـیرین، خـوەش عـیبارەتت

یە کێ بۆ چـون تـۆ، سـاحێب قـەڵم بـۆ؟
دەستو قـەڵەمت، هـەر بـێ عـەڵەم بـۆ
مـەست بـیم بـەو نـامەی، عـەمبەرفامەوە
مـەڵهەموار نـیام، وە ڕووی زامـەوە
سـەرتاسەر نـامەت، ئـەدیبانە بـی
گشت پـەندو ئـەندەرز، تـەبیبانە بـی
«ئـەحمەد» وە قـوربان، شـەق خـامەتەن
هـەر ئـان مـونتەزیر، ئـامای نـامەتەن



## بیجاڕ کەی بیجاڕ مەحبووبە جاڕەن[1]

«بیجاڕ» کەی بیجاڕ[2]، مەحبووبە جارەن

ماوای مەحبووبان، هەزار هەزارەن

بێ‌نازی نییە، یەکسەر بانازن

غەریب نەوازو، شەکەرین ڕازن

گشت کەمەند کلاف، مشکین لە دۆشن

هەم ناز ئەسێنن، هەم ناز ئەفرۆشن

«ئەرمەن» وە یەك، «شیرین» شیرین بی

ئەویش وە هوونی، شازادەی چین بی

«ئەرمەن» بێ شیرین، کەی سەفا دارۆ

هەر ڕۆ لە «بیجاڕ»، شیرین مەوارۆ

زمسان «بیجاڕ»، ئەر چە قەهارەن

لە بۆی گول ڕوخان، ماچی بەهارەن

گەردەن بێ‌گەردان، سەوزەو بالآبەرز

بەناز ماوەران، قولەی قاف بە لەرز

بەرگ ڕەش پەی نەخش، نزاکەت پۆشان

پەی عەزای «حسین»، جۆشان خرۆشان

دەس دەس ئەگرن تێنە خەیابان

نەوا بکەفن، لە بەر یەخبەندان

---

١- ئەم شێعرەی بۆ «آمان‌الله خان اردلان» کوڕی «غلام علی خان» نووسیوە.

٢- جاڕی دار بی.

ئــەگــەر بـاز کـەران، یـەخەو قـوڵفشان
شـــەماڵ بشــانۆ، دەســتەی زلْــفشان
نــەسیم عــەترش، پـەخش بـۆ وە ســارا
مەست مـەبان یـەکـدەست، داراو نـەدارا
قـــوربان لە دووریت، زامــەتم ســەختە
جــات خــاڵی، گــەرمە، بــازار تـەختە
خــوەش بــەرگوزارەن، شــەونشینیشان
شـــەکـــەر ئـــەواریٚ، لە شـــیرینیشان
هەر شەو چون شەوگڕ، بـەزم عـەرووسی
جەمن بۆ سوحبەت، خاسەی خـــووسی
شـــیرین‌تر لە گشت، کـــوردسانین
فـــارغ‌التـــحصیل، عـــیلم ئـینسانین
نــمەشۆ تــا ڕۆی، مــەحشەر لە هـۆشم
حـەڵقەی غــولامی، کــریان وە گــۆشم
ئارەزووی خەیاڵ، وەسواسەت هـەرشەو
خەو حەرام کەردەن، لە تاسەت هەر شەو
پەروانەکەی دڵ، بیٚ پـەروان هـەر شـەو
بیٚ‌سەر سەرگەردان، ئەر بـڕوان هـەرشەو
وە مــەرگت هــەر هــام وەو خـەیاڵەوە
ڕووم مەکـەرد وە ڕووی بـای شـەماڵەوە
چـون مـاوەرد نـەسیم، زلْـفە تـاڵەکـەت
چــەنی بــۆی عــەتر، لیـمۆ کـاڵەکـەت
مەدا پیٚم موژدەی، خـوەشی حـاڵەکـەت
هــێمان بــاقیەن، زەڕەی خـــاڵەکــەت

خاڵت وست وە خاڵ لە دایەرەی عەین
عەینەین عەینەینم، بەری کەرد لە زەین
سا دەی ئازیزگیان! پەی دەوای دەردێ
بکیانە لە گەرد، پالاکەت گەردێ
شایەد وێنەی گەرد، تووتیا بێ غەم
ڕێزەی بڕیزوون، لە ڕووی لەکەی چەم
لە ئێش زامەت، ساکن بۆ تاوێ
بەڵکە بە ڕاحەت، بکەرۆ خاوێ
وە ئیلا تا ڕۆی، مەحشەر بێ خاوەن
«ئەحمەد» وە ئاهر، دووریت کەواوەن



میرزا ئەحمەد داواشی
تەمەنی ٧٥ساڵی بیجار

## ئازیز وه حومام[1]

ئازیز وه حومام، ئازیز وه حومام
چمان تەشریفت بەردەن وه حومام
جەلا دای جەماڵ جەمینت چون جام
پەی ئاینەی دق ئامانی وه لام
پێچ دای وه زلفان سیای مشکینفام
پەشتانەن وه بان باڵای نەونەمام
خەمخەم، خەم وەردەن خەیاتەی خام تاو
دڵ ئەر جە سەنگ بی مەکەردش وه ئاو
خاڵت بە دانەو زلفت بی بە دام
مورغ ڕۆح بەردی وه سەرگەردت بام
تێغ ئەبرۆت بەیتەور خەتاتی خەت کەرد
جەرگ و دڵ و وڵك هەر سێت سێ لەت کەرد
دیدەت وه سرمەی سیای «توور» ڕەشتەن
چون فریشته نوور بە ڕووتا وەشتەن
شەفاف شێوەی شەوقت شیرینەن
تماشاش شەفای شەیدای حەزینەن

---

١- ڕۆژێ میرزا ئەحمەدی داواشی ئەڕوا بو دیداری هاوەڵیکی لەشاری «پاوە» بە ناوی «میرزا موحەممەد نەعیم» کە کارمەندی بنکەی تەندروستی بووە پاش ماوەیەك خانمێکی جوان و ڕازوە دێتن و بەقەس بەرانبەری «میرزا ئەحمەد» دائەنێ وه «میرزا موحەممەد نەعیم» ئەڵێ: «میرزا ئەحمەد» سەر هەل بڕە ئەم خانمە هاتوە تا تۆ شێعرێکی پیابڵێی «میرزا ئەحمەدیش» فی البداهە ئەم چەن شێعرەی پیا دەڵێ.

سـەیر جـەماڵت سـەفای گوڵگەشتەن
ئەر باز بۆ دوگمەی یەخەت بەهەشتەن
چـێش مـەبۆ دیدەم چەنیم نازکەری
بە ناز نازگۆشەی یەخەت وازکەری
تـا مـورغ ڕۆحـم بگـێڵۆ پـێشدا
با خاس حاڵی بۆ چێش هان وە تێشدا



## شیرین خەیاڵێ

شـیرین خـەیاڵێ، شـیرین خـەیاڵێ
حـەیفە کـەردە بـیت، وەیتەور خـەیاڵێ
عـەیبەن پەی شیرین، ساحێب کەماڵێ
بـدۆ لە خـەسرەو، وێش تـانەی تـاڵێ
ڕاسـەن مـن «خـەسرەو»، دارا ئـەختەرم
شـیرین جـە لای تـۆ، کەمتەر نـەوکەرم
حەیفەن پەی «شیرین»، شیرین تـەر لەقـەن
خـاستەر لە «شیرین»، شـازادەی ئـەرمەن
بـدۆ لە دەمـاغ، «خـەسرەوش» تـاڵی
شـیرینی «شـیرین»، لێش نـەبۆ حـاڵی
من هەر ئەو «خەسرەو»، ساحێب وەفای تۆم
من هەر ئـەو «فـەرهاد»، گیر جـەفای تـۆم

تـــوولَەنەمامەن، ســـەولَەن، عـــەرعەرن
شۆخەن، شـیرینەن، شـەهدەن، شـەکـەرەن
زلَـــفەن، کـــەمەنەن، کـــۆتەن، زەنـــجیرەن
ئـــەبرۆن، کـــەمانەن، بـــژانگـــەن، تـــیرەن
چەرخـەن، شـاهێنەن، بـازەن، نـەخچیرەن
جـــەلاَی جـــوانـــەن، زاخـــاو پـــیرەن
عـــوودەن، عـەمبەرەن، عـەترەن، عـەبیرەن
عـــاجەن، بـــهاجەن، تـــاجەن، ســـەریرەن
حـــوکمەن، حـــاکـمەن، مـیرەن، ئـەمیرەن
حـــاڵەن، ئـەحواڵـەن، حـەکـیمەن، ژیـرەن
بـــاشەن، نـــەقاشەن، دانـــان، دلیـــرەن
شـێخەن، مـورشیدەن، دەسگـیرەن، پیرەن
بـــجوز تـــۆ نـــیەن، کـــەسێ حـــەریفم
نـەز چـێش کـەرووم، چـێشەن تـەکـلیفم
ئـــازار فـــێمەن[1]، کـــێ کـــەرۆ ژیـــرم
نـام وێـم چـون قـەیس بـەردەن لە بـیرم
فـێمەن یـانیهای، فـێ هـــەر نـامشەن
«ئـــەحمەد» گـــیرۆدەی، قـــەید دامشـــەن
ڕێـــێ ڕەســـتگاریم، نـــمەبۆ لە دەرد
شین[2] وتی: شێتم، کەردی ئەی هام فەرد



١- فێ: خووداری، نەخۆشی سەرع.	٢- شیوەن، گریان.

## نازاران یەك تیر

نـــازاران یـــەك تـیر، نـازاران یـەك تـیر
لە قـــەوس ئـــەبرۆی نـازاران یـەك تـیر
شاناو دا وە جەرگ مـن وە بـێ تـەقسیر
هـەر بـە سـۆن زامش نـمەشۆ جـە ویـر
گیان و دڵ بە زلـف سـیاش وە زەنـجیر
کەرد و گرت و بەرد هەر دوو بە ئـەسیر
دانەی مەحەبەت وە مـەیل وەشـان بـۆم
وە ناخون سینەی خوەم بۆی کرد وە شۆم
دەس نـــیشانم کـــەرد پـــەی یـادگاری
وە جۆی چەمەی چەم کەردم ئـاویاری
شـایەد جـە بـەهرەش بـەرووم گـرەوێ
وە داس ئـــــــەبرۆ کـــــەرووم درەوێ



## چە دەردێم کێشان

هەر وێم مەزانووم چــە دەردێــم کـێشان
دڵ وە چـــە دەردێ بـــێ‌دەرمان ئـێشان
لەزەتش نـــــیەن هـــــامدەردێ نـــەبۆ
پـــەی تـەسکین دەرد هـامفەردێ نـەبۆ
دڵ ئـــارەزۆش بـــۆ دڵسـوزش نـــەبۆ
بســــۆزۆ بـــە ســـۆز بســـۆزش نـــەبۆ
حەیفەن ئەر «لەیل» بۆ دێـوانـەش نـەبۆ
شـــەمێ بســـۆزۆ و پـــەروانـــەش نـەبۆ
ئەو شەمە لە شـەوق کـەی شـەیدا مـەبۆ
شـەهید ڕای عـەشق کـەی پـەیدا مـەبۆ
ئـەر شـەم نـەسووزۆ پـەروانـە لە پـاش
بێ پەروا ناکا گـیان تـەسلیم جـە ڕاش



## خەیاڵت ئازیز

خەیاڵت ئازیز، خەیاڵت ئازیز
هەر ئان هام لە یاد، خەیاڵت ئازیز
پەشێوم چون زڵف، تاڵ‌تاڵت ئازیز
ها وەختە بوومە، عەبداڵت ئازیز
پەروانەم پەی شەوق، جەماڵت ئازیز
مەدهۆشم جە هۆش، کەماڵت ئازیز
قەسەم وە شۆخی، شێوەکەت ئازیز
بە شیرینی خاڵ، لێوەکەت ئازیز
بە دانەی دەندان، مرواریت ئازیز
وەکوڵم گۆنای، گوڵناریت ئازیز
بەو چای زەنەخدان، چون چینیت ئازیز
شەکەر نمەدۆ، شیرینیت ئازیز
زڵفان خەیاتەی، خام‌تاوەن ئازیز
شۆریای شەونم، گوڵاوەن ئازیز
شەهید ئەبرۆی کەمانم ئازیز
پێکیای سەرنێش، پەیکانم ئازیز
دڵ‌سفتەی سووزان، دوو چاوم ئازیز
دوو چاوت کەردەن، کەواوم ئازیز
تو «تەرسا» من چون، «سەنعام» ئازیز
وەڵێ بۆ مەبەر، ئیمانم ئازیز

ئـــیمانم ئـــەرپێت، زەرووڕەن ئـــازیز
«اســـتغفرالله»، مـــەر دوورەن ئـــازیز

ئـــەر قـــولاو بـــدەی، لە چـــاوم ئـــازیز
خـــوا نـــەکـــا هـــەرگیز، لیـــڵ نـــاوم ئـــازیز

نـــەیم، نـــەمامم، عـــەرعەرم ئـــازیز
شـــۆخم، شـــیرینم، شـــەکـــەرم ئـــازیز

تـــاوسم، تـــەیهووم، تـــەوارم ئـــازیز
شـــاباز شـــەش دانگ، شکـــارم ئـــازیز

بـــەردی ڕەنگ لە ڕووی ڕەمـــەقم ئـــازیز
شـــەمع شـــەوق زەوق، شـــەفەقم ئـــازیز

هـــەر شـــەو بـــێدارم، لە تـــاسەت ئـــازیز
بـــێ خـــاوم کـــەردەن، وەســـواسەت ئـــازیز

گـــەردەنت مـــینای، بـــێ گـــەردەن ئـــازیز
گـــرەو لە مـــینای، مـــەی بـــەردەن ئـــازیز

ســـینەت زجـــاجەی، زەڵاڵـــەن ئـــازیز
تـــەڵای پـــڕ جـــەڵای، دوو قـــاڵەن ئـــازیز

شـــەماڵ ســـەرسامەن، لە ســـامت ئـــازیز
وێش بـــدۆ لە تـــووڵ، نـــەمامت ئـــازیز

«ئـــەحمەد» شـــەهید، شـــەست تـــۆن ئـــازیز
وە مـــەی نـــەچەشتە، مەست تـــۆن ئـــازیز

★ ★ ★

## جەغەم خەیاڵت!

جــە غــەم خــەیاڵت، جـەغەم خـەیاڵت!
مــاچی پــەشێوەن، جــە غـەم خـەیاڵت!
غەم خـەمان خـەم دان، بـاڵای شـمشالت!
غــەم دان وە تــاڵان، عــەقڵ و کــەماڵت!
غەم پاتْ پابەند کەرد، غەم بـەستەن بـاڵت!
غــەم بــێ غــەم بیەن، وە چـرای مـاڵت!
تانەو سەرزەنش، بـێ سـوودەن پـەی غـەم
کــەیغەم بــەتیرو، تــانە مــەبۆکــەم
مــەگـەر نــازاریێ، بـۆ بــە دەمسـازت
بـــە ڕێـــزەی ڕازان، بکــێشۆ نــازت
یــا سـەوزە بـە سۆز، بۆ بە هـامدەمت
بســۆزۆت بــە سۆز، بەر کـەرۆ غـەمت
یـا لە سـای چـەمەن، چـەشمەو سـەراوێ
گــۆش دەی وە نــاڵەی، بــوڵبوڵان تـاوێ
وە حـــەسرەت گــوڵان، چــۆن مــەلاونۆ
لە ســەنگ سـەخت‌تەر بـۆ غـەم مەتاونۆ
یــا بشــۆ وە ســەر، قـولەی کـۆساریێ
تــازەکــەر حــەیات، وە بــای بــەهاریێ
نــەسیم بـۆی سـەوزە، بـدۆت ئـەودەماخ
غەم هیچ بـەرمەشۆ، سـاکـن مـەبۆت ئـاخ

بێ غـەم بـەر لەغـەم، بـوویار ڕۆژو شـەو
غەم کەر وە «شیرین»، وێت بەر وە «خەسرەو»
یا چـون پـەروانـان، بـێ پـەرواو بـێ غـەم
بسـووزو بسـاز، چـەنی غـەم کـەم کـەم
ئـەگـەر «ئـەفلاتوون»، وە «لوقـمانەوە»
«ئـەرەستوو» و «سـوقرات»، وە دەرمـانەوە
هـەر چـوار جـەم بـان، بـنیشن وە هـەم
مـەتاوان کـەران، دەوای دەرد غـەم
غـەم مـەبۆ وە بـاز، مـەکـەرۆ پـەرواز
شـایەد وە گـۆشەی، چـەم بـدوێت وە نـاز
ئەگـەر مـەتاوی، هـەر شـام هـەر سـەحەر
تـماشای بـەرزی، بـاڵای دڵـبەر کـەر
عـاقڵان دەور دنـیا بکـەیت جـەم
بـە غـەیر لە بـۆی زڵـف نـیەن دەوای غـەم



# غەمبارم ئیمشەو

غــەمبارم ئـیمشەو، غـەمبارم ئـیمشەو
هــانا هــامسەران، غـەمبارم ئـیمشەو
جــە ئـێش زامــان، ئـەوگارم ئـیمشەو
تــا سـەحەر جــە دەرد بێدارم ئیمشەو
چون «خــزر» نـە گێج، زوڵـماتم ئیمشەو
مــەر خــودا بـدا، نـەجاتم ئـیمشەو
بــیاوم وە ئــاو، حــەیاتم ئـیمشەو
بــنۆشووم وە یــاد، مـەماتم ئـیمشەو
ئــەلوەدای نـەفەس، ئـاخرەن ئـیمشەو
قــابز پــەی قــەبزم، حــازرەن ئـیمشەو
وە مــەرگت ئـەگـەر، نـەوینووت ئـیمشەو
چون گوڵ نەنیەرووم، بـۆ نـەبۆت ئیمشەو
هـەرچـەند نـە سـەودای، نـازارم ئـیمشەو
فــێشتەرەن قــوەی، ئــازارم ئـیمشەو
بــا خــار غـەمان، خـەریکم ئـیمشەو
وە حــاڵ مــەردەن، نـزیکم ئـیمشەو
گــرفتار دەرد، نــاخارم ئـیمشەو
بــار غــەم بـیەن، وە بــارم ئـیمشەو
بــرپیان هــاز لە پــاو زرانـیم ئـیمشەو
مــەنالووم جــە دەردگــرانـیم ئـیمشەو

جە غەم حەرامەن، خاو نەچاو ئیمشەو
ئاهم مەکەرۆ، سەنگ وە ئاو ئیمشەو

مەدهۆشم وە بۆی، عەنبەرریز ئیمشەو
مەستم وە لەقای شەکەر بیز ئیمشەو

چون گدای شاران، بێ پوولم ئیمشەو
چون شاهان لە تەخت، مەعزوولم ئیمشەو

چون فەرهاد کوڵەنگ، نە فەرقم ئیمشەو
سەر تا پا وە هوون، دڵ غەرقم ئیمشەو

شێویاگەن جامەی، ڕەونەقم ئیمشەو
چون پەز قەساو، شەق شەقم ئیمشەو

وەشەن ئەر لە مەی لێوانی ئیمشەو
تا سەحەر کەرۆم، مێوانی ئیمشەو

بەڵ بۆ وە ئاو حەیاتم ئیمشەو
ڕۆشن بۆ جە نوور زوڵماتم ئیمشەو

مەفتوون چون «ئەسحاب،ئوخدوودم»[1] ئیمشەو
گیر بڵیسەی نار، پڕدوودم ئیمشەو

«ئەحمەد» تا وە ڕۆی، ڕەستاخیز ئیمشەو
زام دارەو زامین، بۆ ئازیز ئیمشەو



١- ئیشارە بە داستانی «اصحاب اخدود» لەسوورەی «بروج» لە قورئانی کەریم. «ئەسحابی ئوخدود» ئەشکەنجەگەران و کافرانێ بێ ڕەحم و دلڕەق بوون کە لە «یەمەن» دا چاڵێکی قووڵ و درێژیان کەندبوو وە لە نێو چالەکەدا ئاگرێکی زۆریان داگرساند و لە ئیماندارانی مەسیحی گەرەکیانبوو دەست لە ئیمانەکەیان هەڵگرن کاتێ لە گەڵ موقاوەمەت و ڕاوێستانی ئەو خوداپەرەستانە بەرانبەر ئەبوون، ئەوانیان ئەخستە ناوی ئەو چالە پڕ لە ئاگرەو خۆیشیان لە لای چالە ئاگرەکە ڕائەوێستان سووزیانو برژان ئەوانیان سەیر ئەکرد.

## قومری مات جە ڕات

قومری مات جە ڕات، کەبووتەر سەرسام
تەیهوو تەرز تەور، کەبك خوەش‌خەرام

بە عیشوەو لەنجە، گریشمەو لارە
پارە مەکەیت جەرگ، شێر وە ئیشارە

لەیلام بە لێلای موشکین گیسووت
پۆشای پەی نەزەر، بەد بە ماە رووت

نمەیۆ وە وەسف، گیسووت بە شمار
کلافەن لە تەرح، تای خەیاتەی شار

شمشاد سەجدەبەر، بەرزی بالاتەن
سەرش سەر بولەند، گەرد پالاتەن

سەرو سەبز بەرز، سەر لە سایەتەن
سەرسام سادار، بولەند پایەتەن

دانەی گرامی دەریای ئەلەستیم
گەنجوور کۆی گەنج، سەرمایەی هەستیم

مەمواچووم چێوێ، دانای ساحێب هۆش
هۆشت بۆ نەبۆ، جە لات فەرامۆش

بولبول نەکەردەن، گەشت گولزارت
مەنالۆ تا ڕۆ، شەو لە ئازارت

گول‌غونچەی باغچەی، باغت نەڕەستەن
قولف باغچەی گول، تۆ هیمان بەستەن

سەرمایەی هەستی وێت، نەدەی لەدەس
دانەی مەعنەویت، نەدەی وە ناکەس
شیشەی شادی و شەوق، وێت نەدەی لە سەنگ
نگەداری کەر، بە نامووس لە نەنگ
ناخوەشم وەلێ، دڵخوەشیم ئێدەن
تۆ وەشبای وەشیت، پەی من ئومێدەن



## دیدەم زەروور بی

دیدەم زەروور بی، دیدەم زەروور بی
دیدەم پەی دیدەن، دیدەت زەروور بی
جەو ساوە دیدەم، لە دیدەت دوور بی
زەینش نابینان، بیناش بێ نوور بی
ئیسە ها دیدەم، دیدەت دیمەوە
مەردە بیم چەمان، زندە بیمەوە
شۆخم شیرینم، شای شەکەرتەرزم
بە ڕووی لوتفەوە، گۆش دەر وە عەرزم
ئەوەن ئارەزووی، دیسن تۆ داروووم
وەختە لە دووریت، گیان بسپارووم
«الحمدلله»، قیبلەم نەمەردم
دیدە پەی دیدەن، دیدەت ئاوەردم



## چە زانان حاڵم؟

چوونەن ڕۆڵەگیان!، چوونەن ڕۆڵە گیان!
چە زانـان حـاڵم چـوونەن ڕۆڵـە گـیان!
چەشمانم چەشمەی خوونەن ڕۆڵەگیان!
ڕۆحـــم ئـاوارەی تـوونەن ڕۆڵـە گـیان!
تا بین هـیچ بـاکـم، نـەوی ڕۆڵـە گـیان!
بـێ ئـێوە جگـەر چـاکـم ڕۆڵـە گـیان!
خامۆش بی چـرای، مـاڵم ڕۆڵـە گـیان!
بـێ ئـێوە شکـیان، بـاڵم ڕۆڵـە گـیان!
چون دار گڕ بەستەی، نەفتم ڕۆڵە گـیان!
سـووزیا ڕیشـەم‌و، کـەفتم ڕۆڵـە گـیان!
بـەهارم وە تـار کـریان، ڕۆڵـە گـیان!
گوڵباغچەم وە خار، کریان ڕۆڵە گـیان!
هیچم پێ نـاکـات، گـریان ڕۆڵـە گـیان!
هـا وەخـتە بـوومە، بـریان ڕۆڵـە گـیان!
بەند بەند ئەعزام، گشت جیان ڕۆڵە گیان!
ڕۆژم وێـنەی شـەو سـیان ڕۆڵـە گـیان!
شـــەوان تـــا وە ڕۆ، الفـــراقـــمەن
چـــون تـاق‌تاق‌کەرە، هـەر تـاق‌تاقمەن
جـــەو ســاوە ڕۆڵـــە، لە ئـــێوە دوورم
زەیـــنم نـابینان، بـــینا بـــێ نـــوورم

جاریۆ هەواڵیۆ، بدەن وە شەماڵ
بە خوەش هەواڵی، باوەرۆم وە حاڵ
وە ئیلا مەبووم وە کۆتەی زوغال
گەردم مەشانۆ، زلان یا شەماڵ
وەختەن جە ئاهر، دووریتان یەکدەس
بسۆزووم ئەوەن، تا بووم وە قەقنەس
بکیانن نامەی، بۆ بنیەم وە بۆش
ئامانەن ڕۆڵە، نەکەن فەرامۆش
چون بوڵبوڵ بەڵکی وە بۆی عەتر گوڵ
غەمو خەفەتم بەر بشۆ لە دڵ

★ ★ ★

## ئەی‌دڵ تا وەکەی؟

ئەی دڵ تا وەکەی،های لە تەلاتوم؟
لە بەحر خەیاڵ، خام وێت کەردەن گوم؟
بۆ بێدار بەرە، لە خاو غەفڵەت
سەریەر ئاوەرە، لە پەردەی خەجڵەت
وەسەن پابەندی، وە هەواو هەوەس
تەسلیمی وە دەس، وەسوەسەی عەبەس
وێت فریب مەدەی، وە خەیاڵبازی
نیەنی وە تەنگ، ڕای چارەسازی
پەرکەندە و پەشێو، خام و بێ‌چارەی
دوچار تۆڕ دام، نەفس عەممارەی
ئی خەرمان وێت، کەرد وەکای بێ‌دان
گیری لە بیری، بێ ئاوو بێ نان
وێت بە دەست وێت، وستی وە زللەت
وە بار ئاوەردی، ئی عەیب و عللەت



## شەماڵ وەگیرەن

شـــەماڵ وە گـیرەن، شـەماڵ وە گـیرەن
شەماڵ یەك ئیمجار، ئامات وە گـیرەن
ئـێدەن مـەواچـوٚن قـیبلەم زویـرەن
دڵ زەدەی سـەرنێش، پـەیکان تـیرەن
شـادیش لیٚ بـێزار، غـەمش لە ویـرەن
شادیش لە تـوٚڕ دام، غـەمش ئـەسیرەن
هـەنی وە سـوحبەت، نـەداروٚ مـەیلیٚ
قـەڵاخی کـەردەن، داخـینەن خـەیلیٚ
مەواچـوٚن: زلـفان، سـیای چـین‌چینش
بـیٚ‌نازە لە پـای، تـای عـەرەقچینش
دوارە بیٚ‌کەیفەن، شـوٚخی شـێوەکـەش
هەر خوەم وە قوربان، خاڵ لـێوەکـەش
شـەماڵ یـەك ئیمجار، حـاڵم پـەشێوە
پـەی پـەشێوی ئـەو، خـاڵ ژێـر لـێوە
ئـامان سـەد ئـامان، بـەڵ بـیاوی پـێش
مـەبادا وە نـێش، نـاخون کـەروٚ ڕێش
تـاقمەی تـاقیەش، هـەوا دان لە فـەوق
ڕەخشانەن چون مانگ، چواردەی پڕ شەوق
فـەقیانەش فـارغ، وە شـەماڵەوە
پێچ وەردەن چـون مـار، وە دوو بـاڵەوە

چەتفەی چەتر چەم، چەمیدەن وە هەم
ستوون بالاش، خەمیدەن لە غەم[١]



## گوڵان مونتەزیر

کولم گۆنا سوور، وەك هەنار ساوا
گەردەن زەرد لە تەرح، زەردی خوەراوا
ساداری سۆسەن، سیمای شێوەتەن
شەقایق لە شەوق، شێوەت لێوەتەن
گوڵان مونتەزیر بەرئامانتەن
چون بەهار دەسیان بە دامانتەن
ناڵەی بولبوڵ پەی قەدەم ڕەنجەتەن
شمشاد حەسرەتمەند، دەس و پەنجەتەن
ڕاس تەر لە سەرو، چەمەن بالاتەن
چەمەن مونتەزیر، پاوو پالاتەن
گوڵان کەی لە تەرز کالای والاتەن
بەنەفشە کەی چون، خاڵ ئالاتەن



١- بە داخەوە ئەم شێعرە بە تەواوی لە دەس نووسەکەی‌دا بە هۆی فەوتیانی بەشێکی تەواو نەبووە.

## ئازیز خەیاڵم

ئـــازیز خـــەیاڵم، ئــازیز خــەیاڵم
پــەشێوەن پــەرێت هـەر ئـان خـەیاڵم
وە مەرگت سەوزە، شای سـۆسەنخاڵم
تــا مــەحشەر بــە دڵ پـەرێت ئـەناڵم
چــێش مــەبۆ دیـدەم دەردت لە مـاڵم
بــاز هــەم بکــەری فکــرێ وە حـاڵم
لە خــەرمان مــانگ جـەماڵت شـەوێ
دڵ خوەشم ئەگـەر پـێم بـدەی جـەوێ
لە مــەیگوون لەب شـەکەرڕێزەکـەت
بــــەمەیلوکەرەم حــــاتەمبێزەکــەت
بــە ڕیــزەی مــووبەت بــێنیازم کـەر
وە شــەوبۆی زڵـفت سـەرئەفرازم کـەر
بۆ بە حەڵقەی «حەی» دەسبەن کەن دەسم
ئەر دەس خـەتا کـەرد بـا بکـەن قـەسم
«ئەحـمەد» ڕازیەن بـەو گـەزەی «حـەیە»
بەو شەرت بیاونۆ دەست بەو دوو «بەیە»



## شیرین و فەرهاد[١]

## ڕۆیشتنی «شیرین» بۆ سەر لەشی «فەرهاد»

«ئەحمەد» چون «خانای»، خلس خەیاڵ خامە
ئینشا کەرد بەی تەور، ئی نامی نامە
شەنەفتش «شیرین»، بالاّ زەڕستوون
ستوون کەرد قامەت، لە پشت گوڵگوون
بە شین و شیوەن، بە دادو بێداد
داد مەکەرد مەوات،: «فەرهاد» ناشاد
کام دڵ جە سەنگ بی، زەدەی خەدەنگ بۆ
چون «فەرهاد» سەرش، سپەردەی سەنگ بۆ
دوچار بەڵای، کۆس ناحەق بۆ
فەرقش چون «فەرهاد»، وە تێشە شەق بۆ
وات: وە کەنیزان بێ پەردەی شەرمێ
با شین «فەرهاد» گێریم وە گەرمێ

شین ئەو شەو:

ئەو شەو «شیرین» شین، ڕەستاخێز مەکەرد
نفرین وە بەخت تەخت، شای «پەروێز» مەکەرد
چون سپیدەدەم، غونچەی سوبح خێزا
شیرین چون «شیرین»، تاڵی شەو بێزا

---

١- رخنە لە چیرۆکی «شیرین» و «فەرهادی» خانای قوبادی لە لایەن «میرزا ئەحمەدی داواشی» واتە بە بیرو هەستی هۆنەر ئەم چەن شێعرە بۆ تەواو بوونی ئەوچیرۆکە پێویستە.

چـەنی کـەنیزان، دوڕ دانـەی مـەکـنوون
تـەشریفشان بـەرد، وە پـای «بێستوون»
دیش فەرهاد چـون شێر زامـی خـەتەرناك
لە پـای «بـێستوون»، کـەفتەن وە هـیلاك
تـا دیش زیـڕنا، لە پشت گـوڵگوون
واروو وێنەی گوڵ، وێش کەرد سـەرنگوون
وە تـاك ڕواڵا، چـون غـەزاڵـەی تـاك
وە چـالاك نـیا سـەر، فـەرهاد وە چـاك
وە زایـڵەی بـەرز، فـەرهادش لاوان
وا لاوان تـا سـەنگ، «بـێستوون» تـاوان
«شیرین» پەی مـەڵهەم، شـەفای ئێش ئـەو
دەم نـیا وە دەم زامو، ڕێش ئـەو
واتش: فـدات بـام «فـەرهاد» نـاشاد
شـیرین مـەردە بـای، سـەرت دا وە باد
«شیرین» چون شـیرین، شـیرینتەر لە قـەن
ئـاوەردش وە هـۆش، فـەرهاد کـۆکـەن
فەرهاد وات: ئـۆخەی، «شـیرین» نەمەردم
گیان شـیرین فـدای، گـیان شـیرین کـەردم
«شیرین» وات: «فەرهاد»، پەی چە واکەردی
«فەرهاد» وات: «شیرین»، واتن: تۆ مـەردی
مـن کـە شـنەفتم، نـام مـەرگ تـۆ
مـەرگم واجب بـی، ڕاست بـۆ یـا درۆ
ئـینە «شـیرینەن»، جـە ڕای دڵـداری
ئـامان پـەی «فـەرهاد»، مـەکـەرۆ زاری

ئـانه «فـەرهادەن»، گـیرۆدەی عـەشقەن

پـەی ئـەهل عـاشق، ئینه سـەرمەشقەن

هەرکەس چون فەرهاد، عەشقش پیشه بۆ

فـەرقش مـەبۆ شـەق، مـەودای تێشه بـۆ

عـاشق کـەسێوەن، نـەنیشۆ وە شـاد

تـا لە ڕای مـەتڵەب، سـەر نـەدۆ وە بـاد[1]



١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەیگوت کە چیرۆکی «شیرین» و «فەرهاد» کە «خانای قوبادی» بە شێعر گوتوویە لە بری شوێن داکەم وکووڕی هەیەو ناتەواوە وە ئەمەوێ تەواوی بکەم و ڕەوکەم وکووڕیە دەر بکەم ئەم شێعرەی بەو بۆنەوە گوتووە بەلام ئەجەل مووڵەتی پێ نەداو هەر لە ئەو ساڵەدا (١٣٥٩ ی هە تـاوی) کۆچی دوایی کرد.

## دیدەم کەردەوە

دیـــدەم کــەردەوە، دیـــدەم کــەردەوە
دیـــدەم دڵ هـــەوای دیـــدەم کـەردەوە
دووبـــارە جـــە نــۆ کـەفت وە دەردەوە
زەهــــــــر زام زووخ دوریت وەردەوە
گـــرپەی بــڵێسەی شـــەرەرخـێزەکـەم
ئـــاه و هــەناسەی دۆزەخ بـێزەکــەم
دڵـــەی دێـــوانــەم دوارە دێـویاوە
کــۆسش کـەفتەوەو شـادیش شـێویاوە
ســەیلات ئــەسرین تــۆفان بێزەکـەم
لە چەمان چـەم، حـەسرەت ڕێـزەکـەم
ســـەد ئســـتوار فکــرش وە هـــەمدا
فام دا بە سەر سـەنگ سـەخت ستەمدا
کـــــولیاوە زامـــان زەدی زامـــەتم
داخـــــین داخ‌دار، تـــا قـــیامەتم



## شیرین بێزەکەم

شیرین بێزەکەم، شیرین بێزەکەم
فەرهەنگی مەئاب شیرین بێزەکەم
شاباز شاهێن شەڕئەنگێزەکەم
پەی قەتڵ ناحەق، لە ستێزەکەم
شیرین چون شیرین شای پەروێزەکەم
وەنەوشەو شەوبۆی عەنبەر ڕێزەکەم
وە ڕێزەی ڕازان شەکەرڕێزەکەم
سەرو سەهی تەرز سەحەرخێزەکەم
گۆش دەر وە عەرزم هەی ئازیزەکەم
وە حەڵقەی زلف کەر حەڵقاویزەکەم
بکەر لە بالآت سەراوێزەکەم
وە موژەت بکەر بزمار ڕێزەکەم
هەم نیشان دەری ڕەستاخێزەکەم
کەلآفی سۆسەن مشکین ڕێزەکەم
وە حەڵقەی کلاف دوو سیای حەیدا
بم پێچە وە توولْ بالآی چون نەیدا
ئیجازە بدەر وە حەیانەدا
بڕژێنن خوێنم وە بەیانەدا
فەرامۆش نەبۆ دەسمە دامانت
ڕەنگین کەر وە هوون جاگەی زامانت

وا خوەشە «ئـەحمەد» بـۆ بـە قـوربانت
تـەسلیم بـۆ لە بـەین هـەر دوو بـەیانت



## قیبلەم وەلامان

قـــیبلەم وە لامـــان، قـــیبلەم وەلامـــان
پەی چی ناوەردی تەشریف وە لامـان؟
گـــەردێ بـــە خـاتر شـەریفت یـاوان؟
لێــمان تــۆریاگی بیێ گـوناو تـاوان؟
فـدات بـام سـادەی شـای نـەونەمامان
قـــەدەم ڕەنـــجەکـــەر نـاسۆرەن زامـان
یـــا تـاڵی لەو زڵـف خـەیاتەی خـامان
بـــدەر وە شــەماڵ دەســم وە دامـــان
فــەرامــۆش نــەبۆ ئـامان سـەد ئـامان
یـــا وێت یـــا شـەماڵ بکـیان وە لامـان
وە ئـــــیلا زلان خـــێزیان وە جـــەخت
سەراو «قەڵاش»[1] کەردەن وە پـاتەخت
لە گـەرمی سـەبوون شـەرارەی شـەرەر
پـــای دەلیـــل بـــڕیان لە ڕای ڕاگـوزەر

---

١- سەراوی «میراوا»ی «جوانڕۆ».

زلان وە ئـــاهر بـــێ دوودو پــڕگڕ
ها کەرد وە قەقنەس سارای دەشت حوڕ[1]

پــوستبەنی کــەردەن وە «داڵــەهۆ»وە
بــەیداخش کــوان و کــۆی «بـەمۆ»وە[2]

چـــەنی «ســاراوەن»[3] هــاڵە ســتێزە
بـــێزنا فـــەزای ســـەیران «ڕێـــزە»[4]

وا هوجووم بەردەن روو وە «خانەشور»[5]
خەیاڵش ئێدەن کەرۆش وە کۆی «توور»

«قالێچە» و «ئەشکێ» تا وە «بـانی نـار»
ئـاگـر وارانـەن «تـاریکە» یـەك جـار[6]

«ئەزگڵە»و[7] «قەیتول»[8] تا وە «بانەدار»[9]
«گاڕێ»[10] گڕ سەندەن مەسووزیۆ بێ نار

«حەسەن گایار»و[11] «یادگار» و «بالوول»[12]
تــەم غــەم پۆشان پەشێوەن مـەلوول

ئـــیسە ئـــەو ئـازیز لەو خــارسانە
لە ســـەختی زلان دڵ هـــەراســانە

---

١- مەبەست دەشتیورە کە لە ناوچەی «باوەجانی» «جوانرۆ»یە، «میرزا ئەحمەد» هەندێ جار دەشتی حوڕی هێناوە وەئەیگوت لە مێژوودا ماوای مەردومانی سەربەرزو نەبەزو ئازادە بووە کە زۆرو زلمی زۆرکارانیان قەبوول نەکردووە.
٢- «بەمۆ» و «داڵەهۆ» ناوی دوو کێوی بەرزن لە سنووری «ئێران»و« «عیراق»دا.
٣- هەمووی ئەم شوێن و مەحاڵانە هی «باوەجانی» «جوانرۆ»یە.
٤- پێشین.
٥- پێشین.
٦- پێشین.
٧- شارێکە لە نزیکی کێوی «بەمۆ»وە.
٨- گوندێکە لە سنووری «ئیران» و «عێراق» سەر بە شاری «ئەزگلە».
٩- چوار لادێن سەر بە شاری «ئەزگلە».
١٠- کێوێکە بەرانبەری «بەمۆ».
١١- زیارەتگەیەکە لە نزیکی «جوانرۆ».
١٢- زیارەتگای «ئەهل حەق» لە ناوچەی «ڕێژاو».

مـەگـەر خـوداوەن بـینای بـوڵەن مـاڵ
وە ئـیرادەی ویش نـازڵ کـات شـەماڵ
وە فـەڕ نـەسیم سـاراو دەرودەشت
دواره «دەشتی حوڕ» کەرۆ وە بـەهەشت
بـپێچۆ وە تـوول بـەژن بـاڵاکـەش
بـماڵۆ وە چـەم گـەرد پـاڵاکـەش
سەرشار بۆ وە سەیر کـاڵای واڵای ئـەو
مـات بـۆ لە بـەرزی بـەژن بـاڵای ئـەو
ڕەنگین کەرۆ ڕەنگ ڕەنگینش چون گوڵ
وا بـۆ بـە نـاڵە بـاوەرۆ بـوڵبوڵ
وا بـێ بـماڵۆ گـەرد ڕووی خـاڵش
بشـانۆ زڵـفان مشکـین تـاڵش
گـەردێ نـەگـێرۆ گـۆنای بـێ گـەردش
هەر بـێ گـەردتەر بـۆ گـەردەن زەردش
زەردی گـۆی زەنـەخ لیـموکاڵەکـەی
نـەقش «مـانی»یـەن چـمان خـاڵەکـەی
«ئـەحمەد» لاڵـەکـەر بـەڵ بـۆ شـەماڵێ
تـا ئـازیز لە دەس زلان نـەناڵێ
شەو شنۆی نەسیم شەوبۆی «دەشتیوڕ»
بـەر دان وە گـیانم ئـاگـر گـڕای گـڕ

★ ★ ★



ئەم وێـــنە لە کاتی دیداری «میرزا ئەحمەدی داواشی» لە پێشانگای تراکتوورسازی «ئالمان لە «تاران» لە لایەن موهەندیسی ئالمانی‌وە وەرگیراوە.
موهەندیس ئەڵـێ: بە «میرزا ئەحمەد» بڵـێن چە ئیرادێ لە زاهیری ئەم تراکتوورەدا دەبینێ. میرزائەحمەدیش دوو رخنە لە تەراحی تراکتوورە کەیان بە یان‌دەکا کە بۆ ئەوان زۆر بە کەڵك و بایخ دەبێ. پاش چەن ساڵ وێـنە کەی لە گەڵ نامەیە لە ئالمانەوە بۆ دەنێرێتەوە وە ئەڵێ وێنە کەتمان لە کارخانەی خۆماندا داناوە وە بە ناوی ئوستای خۆمان یادت لێ دە کەین.

## شنۆی سەحەرخێز

شنۆی سەحەرخێز، شنۆی سەحەرخێز
شنۆی سەرکاوان، شنۆی سەحەرخێز
ڕەنگ ڕەزی گوڵان، سورخ و سەوزو دێز
ڕەنگو بۆی بەهار، بەرگ زمسان بێز
شەندەی بەڕەزای، بەرز سەراوێز
سەڕاف دانەی، خاڵ خوردەی ڕێز
شانای تای توغرای، زلف ئازیزان
ڕەشتەی وەڵگ وەن، فەسڵ پایزان
شکافەندەی سەخت، کلیلەی کاوان
توغیان چەشمەی، کۆنەی سەراوان
نەسیم شنۆی، وەش بۆی بەهاری
سروەی سەفابەخش، دڵو دڵداری



## عەرزم کەرد مەجنوون!

عەرزم کەرد «مەجنوون»، دێوانەی دیدەت
باوەفاو بەینەت، مەینەت کەشیدەت
سڵامش وە لای، «لەیلا» کیاستەن
دیسن دیدارش، وە ئاوات واستەن
دیم دەم چون غونچەی، نەشکوفتەی سەحەر
باز کەرد بە ناز کەرد، سەحرا موعەتەر
واتش: هیچ جە «قەیس»، وێم نیەن ڕازی
سیاسەت چەنیم، مەکەرۆ بازی
وەلحاسڵ ئەو شۆخ، شای شیرین شێوە
بەتر لە زڵفش، حاڵش پەشێوە
هەنی وە مووبەت، نەدارو مەیلێ
قەڵاخی کەردەن، داخینەن خەیلێ



## گیان وەلەب یاوا

گیان بە لەب یاوان، پەی تۆ دیدەمەس
چێش ماچی بەرشۆ، یا گێڵۆ وە پەس
ئەر بۆ دامانت، بگێرووم وە دەس
شەرتەن تا مەحشەر، نەیکەم مەرەخەس
سا تویچ بۆ بە زات، فەرد فەریادڕەس
ئازاد کەر مورغی، ڕۆحم لە قەفەس
سەماوەری دڵ، تاکەی بجۆشۆ
چەم تا کەی پەی تۆ، پەردەی تەم پۆشۆ
ئەسرینم نە چەم، پەی تۆ خرۆشان
دڵ پەی تۆ بادەی، مەینەتش نۆشان
ساکن کەر کوڵەی، دڵەی پڕ جۆشم
ڕەوشەن کەر دیدەی، ماتەمی پۆشم
سۆبەکەی دڵم، پڕ تاوی نارەن
سووزیای سووزان، مدام بێدارەن
فایدەش چێشەن، کۆسش کەفتە بۆ
دڵ پەی ئەو بێدار، دڵ ئەو خەفتە بۆ
دڵدارو دڵبەر، مەبۆ یەکدڵ بۆ
نە ئەم بێ خەبەر، ئەو دل غافڵ بۆ
نەك یەکێ بێ غەم، ئەو زام خەتەر بۆ
ئەر ئەم بسووزیۆ، ئەو بێ خەبەر بۆ

★ ★ ★

## ڕێزەی ئەڵماسە[1]

هــەوا تــەمئەنگێز، نــە شــوور شــینش
زەمین بی وە گـڵ، خــوون و ئــەسرینش
ڕێـــزەی ئــەڵماسە، مــەرێزا لە ســەر
مەویا وە سورمەی، ژێـر دیـدەی دڵـبەر
تـوخم بـەنەفشەش، لەی فـەسڵ دەیدا
شەندو بی وە کشت، لە سەحرای وەیدا
بی وە فەروەردین، فەوری دەی گوزەشت
وە گوڵشەنێ کەردش، چون ئوردیبەهەشت
مــوشك‌ئەفشان زڵــف، دێــز ئــازیزان
بۆی نافەی ئاهووی، مـوشکین مـەبێزان
نــەك وەك تـوڕەی لوول، لەولاوی لاوان
یەك یـەك وە مـەلوول، خـانش مـەلاوان
شوعای شەفەق‌خێز سینەی سیم دۆزان
ئـــاهر لە بـــایر «ســـنجابی» خـــێزان
گۆنا گوڵگوونان، گـوڵگوون هـوون بـی
نـەققاشی تـەراش، نـێش نـاخوون بـی
باڵ چەم چـون مـەوج، هـەور بـەهاران
ئەسرین چون قەترەی، شەبنەم مـەواران

---

١- ئەم شێعرە وەسفی چەمەری‌یەك بووە لە ناوچەی «سنجاوی» كرماشان.

خەم مەویا قامەت، وە ڕووی کۆتەڵدا[1]
سینگ مەدا وە سەر، زێن مەخمەڵدا

پۆل پەلکە شۆڕ، زلّفان سۆسەنی
شیرین چون شیرین، شۆخ ئەرمەنی

پەی کەردن دەستەی، پەلکەی زلّف دێز
دەور مەدان لە دەور، چەمەری پەرویز

هەر یەك وە ڕازێ، «خوسرەو» مەلاوان
دڵ ئەر جە سەنگ بی، چون مۆم مەتاوان

قومری تەلعەتان، جۆشان خرۆشان
دێبای هەور غەم، ماتەمی پۆشان

یەك یەك لە قودرەت، دانای ساحێب سڕ
جە تۆی تاریکی، مەدرۆشان چون دوڕ

نازك نازاران، نزاکەت فرۆش
گیسووکەمەندان، موشکین مار لە دۆش

وە شانەی پەنجە، خەیاتەی خامان
مەڕێزان چون گوڵ، دەس دەس بە دامان

مەیدانگای شیوەن چەمەری‌و زاری
گرتە بی بە وێش ڕەنگ بەهاری

بەنەفشە، شەوبۆ، گول جە غونچەی هوون
سیمای ڕۆمەتان ڕۆمەت مەکەرد ڕوون

خەمیا بی قامەت نەوتووڵ نەمامان
مەڕێزان قەترەی ئەسرین بە دامان

---

١-کۆتەڵ: ئەسپێ کە لە تازیەدا دەیگێڕن و جل‌و بەرگی مردوەکە لە سەری دائەنێن.

## مەحبووب گوڵێ‌وەن

مــەحبووب گــوڵێ وەن، وە ئـارەزۆوە
وەشـــەن وە تـــاسق، کـەریش وە بـۆوە
تــماشای شـۆخان، شـەکـەربار ڕەنـد
وەش‌تەرەن لە نۆش، شیرەی شەهد قەند
مــدام چــون بــوڵبوڵ، بــە دڵ بـناڵی
هەر ئـان خـاك پـاش، وە چـەم بـماڵی
هەمیشە وە بۆی، مەیل ئـەو مـەس بـای
تا مەحشەر وە تای، زڵفش پابەس بـای
سەوزەم تۆ چون گوڵ، «ئەحمەد» بوڵبوڵەن
تـــاکـــەی بـــناڵو، داخت لە دڵــەن
زەنـــجیر مـــەیلت، بـــووگە پـــابەستم
تا مـەردەن وە بـۆی، مـەیل تـۆ مـەستم



# بێمەیلی وەسەن

ئەر دیدەت وە ناز، بدیەی وە «پەڕاو»[1]
«پەڕاو» پەڕ تا پەڕ، مەکەری وە ئاو
وە تێغ ئەبرۆت، دوو نیمەم کەرە
وە ڕێزەی ڕازان، سەد قیمەم کەرە
بۆ مەزەو لەزت، زەردە خەندەکەت
پەی نەشەی مەستی، تازە بەندەکەت
وە بەهای گیان، وە پێم بفرۆشی
خوەشە خومت وە دەس، خومت پێم بنۆشی
بێمەیلی ئیتر، وەسەن بەسەن بەس
«ئەحمەد» کەم وە نار، وێت کەروە قەقنەس



١- ناوی کێوێکی بەرزە لە کرماشان.

## دوور کەفتەی وەتەن

دوور کــەفتەی وەتــەن، کــوردسانەکــەم
تــــەسەلای دڵــــەی، هــەراســانەکــەم
کــوردستانێ وا، پـەی مـن بـەهەشت بـی
زمســـانش جــە لام، ئــوردیبەهەشت بـی
ئــــیسته وە بــــێ تــۆ، نــار حــیرمانەن
پــەشێویش وە بــار، غــەم وە خــەرمانەن
«ئــــاویەر» مــاتەم، «ئـامانیە»[1] مــاتەن
«عــەزامــیە» عــاجز، چــەمەڕای ڕاتــەن
«ســەر تـەخت» و «بـانتاو»، وەو کـول سەفاوە
بــــێ سەفان بــێ تــۆ، هــان وە جــەفاوە
«زەفــــەریە» زاهــــر، زار و دڵ تــەنگەن
بــــولبوڵش پــەشێو گــوڵش بــێ ڕەنگەن
سەرچەشمەی «خزرش»، خێزا و خەزان کەرد
زەردەگیش پەی شار، «سنە» ئەرزان کـەرد
«نــــزامــــیە» نــیە، ســەفای جــارانش
مــەحرورمەن جـە دیـن، دیـدەی یـارانش
«خــەسراوا» نـیەن، چـون جـاران نـازش
شـــــێویان بســـات، ســۆز و گــودازش

---

١- تەواوی شوێن و مەحاڵەکان هەرکام ناوی بەشێ لە شاری سنەیە.

«موبارەكئاباد»، مات و ماتەمەن
سەر تا پاش خەڵات، وە كاڵای غەمەن
«ئامانیە» مەدۆ، ئەمانەت وە باد
شایەد وە گەردی، پاڵات كەرۆش شاد
«تەكیە» و «چەمەنزار»، چەن موعەتتەر بی
بە دین دیدەی، تۆ مونەوەر بی
ئیستە وە بێ تۆ، خەزانش خێزان
وەڵگ چناران، چەمەنش ڕێزان
«وێڵە وێڵە گەل»، وەیلان وەیلەن
شادی لێش بڕیان، لە غەمان كەیلەن
«باغە نەمامە»، مەشهوور عامە
نە باغی ماگە و، نە ئەو نەمامە
«گریاشان» یەكسان، خوار و پەرێشان
پەی جاگەی خاڵیت، هەر ئاخ مەكێشان
جەو ساوە ئازیز، تەشریفت بەردەن
«كوردستان» یەكسان، پڕئێش و دەردەن
ئەو تارمەو تەلار، ئەیوان عالیت
پەنجەرەی بەستەو، ئوتاق خالیت
دەنگ مەدا چەنی، دەنگ ناكەسان
قاپی مەعریفەت، جە وێشان بەسان
تا دیم دێویام، نساڵانم كەفتم
لەو ساوە تا حاڵ، سووزان نەفتم
چۆقم دا چەمیام، لە غەم خەم وەردم
تا تماشای جای، خاڵی تۆ كەردم

نــــمەشۆ وە یـــاد، تـــا بـــە ڕۆی مـــەرگم
خـــەیاڵت نشـــتەن، لە ڕیشـــەی جـــەرگم
دوو دیـــدەم پـــەردەی، تـەم غـەم پـۆشان
ئەسرینم چون سەیل، «سیروان» خـرۆشان
«فـــەرەجە» و «قشـڵاخ»، سـارای «گـرێزە»
بـــــێتۆ نســـەماگـــە، ســـەفاشان ڕێـــزە
کـەی مـەشۆ وە یـاد، سـەفاو سـەیر «قـار»
نـــفرین بـــۆ لە چـــەرخ، چـــەپی ڕۆزگـار
ئەو بەرزی و سەوزی و سەرچەشمە و کانی
ئەو قوله و قەلعەی، «خان ئەحمەد خـانی»
ئـــاگـر مـەیۆ لێش، چـون خـەرمان خـەم
چـون کـۆی «دەمـاوەن»، دایـم هـا لە تـەم
ئـــــومێدەوارم، بـــــێتەم و هـــــەم بـــۆ
بـــە دیـــن دیـــدەت، فـــارغ لە غـــەم بـــۆ
لە غـــــوربەت دڵت، نســـەبۆ هـــەراســـان
تـــەشریف بـــاوەری، بـاز بـە «کـوردسان»
ڕەفـــــــیقانت گشت، مـــــــونتەزیرتن
مـــــونتەزیر پســـەی دیـــن، بـــێنەزیرتن
تـــویچ بـــێ بـــە دیـــدەن، دۆس و بـرادەر
مـــــەیلێ تـــازەکـــەر، بـــدیە «ئـــاویدەر»
گـــــوڵان ڕەنگ ڕەنگ، ئـــاویزان کـــەردەن
ئـــــارەزووی بـــاڵای، ئـــازیزان کـــەردەن
«ئـــەحمەد» مـــونتەزر، چـــەمەڕای ڕاتـەن
دوور بـــۆ یـــا نـــزیک، گـیان بـە فـیداتـەن

## شەماڵ وە جایە

هۆنەر ئەم شەماڵەی لە گوندی «کانی خەیران» بۆ ناوچە جوانە کانی «باوەجانی» هەناردووە.

شەماڵ وە جایە، شەماڵ وە جایە
شەماڵ مەکیانووت، بشۆ وە جایە
چون ئەوجا نیەن، لە هیچ جا جایە
نیەنش بەغەیر، سومبڵ گیایە
یاریم دەر شەماڵ، وە یاد جاران
بۆ بشۆ وە سەر، چیەی «چل یاران»[1]
عوزر ناوەری، نەواچی شەوە
تا مەشی وە سەر، قولەی «سەرکەوە»[2]
نەوعێ بسویاری، وە «گەڕاوە»دا
هەراسان نەکەیت، کەس لە خاوەدا
شەماڵ بۆ عەرزم، بکەرە قبووڵ
بشۆ وە تەواف، بارگەی «شێخ ڕەسووڵ»[3]
خاك بارگاش، وە چەم بماڵە
لاڵە و پاڵە کەر، وە دڵ بناڵە

١-کێوێ بەرزە لە نزیك گوندی «کانی خێران» ماوای ژیانی هۆنەر سەر بە شاری «ڕوانسەر».
٢- ڕشتە کێوێ لە نزیکی «کانی کەوە»ی «ڕوانسەر» هەتا «گەڕاو» درێژی هەیە.
٣- مەرقەدی وا لە «دەوڵەت ئاوا» سەر بە شاری «ڕوانسەر» و لە شێخانی «سۆڵەیە».

هەمەت خواهی کەر، باڵ دەر دووبارە

تا مەشی وەکۆی، پشت «شوانکارە»[١]

ڕاستەکوورە ڕا و، سەخت و سەر وەکۆن

کەی شایستەی شەست، پەڕ و باڵ تۆن

مەشی وە جایە، سەحرای خوەتەن تەرز

سەبز و خوڕەم و دڵنشین و بەرز

خاکش عەتیقەی ئەشیای قەدیمەن

هەر گۆشەش بدیەی، هەر زەڕ و سیمەن

لە پای دامەنەش، سەراوێ دارۆ

شەماڵ مەویاری، مەوینیش ئارۆ

باغەن باغاتەن، گوڵزارەن گوڵەن

زوان قاسرەن، وەسفش موشکوڵەن

وە تەنیا بشۆ، وە «کانی کەڵەك»[٢]

بدیە وە «کەڵەك»، چێش کەردەن فەڵەك

پلوور و تەخت و تاجش بوێنە

یا فەرز یا سوننەت، نوێژێ بخوێنە

وەکانی «گەشکی»[٣]، خاترت جەم کەر

تماشای هەوار، «سەردار ئەکرەم»[٤] کەر

باشگای باشکۆی، «سەردار ئەکرەم» بی

سەرداران پەی شەور، لە دەورش جەم بی

---

١- شوانکارەی دەوڵەت ئاوایە، سەر بە شاری «ڕوانسەر».

٢- چەشمەیە جوان لە ناوچەی وەلەد بیگی «ڕوانسەر».

٣-کانی و ئاوێ لە ناوچەی وەلەد بیگی «روانسەر».

٤- یەکێ لە سەردارانی مەشهووری وەلەد بیگی.

سەرداریٚ نەوی، چون «سەردار ئەکرەم»
خاس تر لە حاتەم، کان کۆی کەرەم
شەماڵ جەخت کەرە، وە بیم و ئومید
ئامان وە دزە بەرشۆ، لە «شەش بید[1]»
هەنی نەکەری، لا وە دماوە
سڵامەت بویەر وە «سڵام گاوە[2]»
ئەو وەخت وێت بدەر، وە بەند «بازان»[3]
مینگەی هەوارگەی، نازەنین نازان
بدیە وە «کێکەن»، چەند کانی دارۆ
چەند جای دیواخان، خەوانی دارۆ
سرشتەی قودرەت، لەقای باریەن
هەر چەشمەش نەوعیٚ، ئاوش جاریەن
جای شانازی ناز، نازەنینانەن
جای جیلوە و جەلای، ماجەمینانەن
مدارات نەبۆ، ئەر ڕۆ بۆ ئەر شەو
تا مەشی وە سەر، کۆی «کانی خەسرەو»[4]
بۆ کەرە خاکش، چەند موعەتەرەن
ئاوش ئامێتەی، زوڵف دڵبەرەن
سیمای مەنزەری، بەرزش عالیەن
جای بەزم «خەسرەوخان» والیەن

---

١- ئاوایەکی ناوچەی وەڵەد بێگی، «ڕوانسەر».
٢- کەژی «بازان» نزیکی جوانرۆیە.
٣- ناوی چەشمەیە جوان لە «بازان».
٤- ناوی کێوێکە لە ناوچەی «ئیمامی».

«کوێڵە»[١] و «ماکوان»، وە «ئاتەشگاوە»[٢]

بــــدیە و بگــــێڵە و بــــۆرێ دمـــــاوە

بــدیە وە «کــەنە»[٣]، مــاچی بــەهەشتەن

کاو و کەش و کۆش، نوور پیا وەشتەن

نــیەن چــون «کــەنە»، جــایە مــوشکوڵەن

سەرتاسەر سەحراش، یەکپارچە گوڵەن

هــەوارگــە و مــینگە و مــەنزڵ مــەنزڵەن

هەر مەنزڵ موختەس، یەک دەستە گوڵەن

شــەماڵ بــۆ عــەرزم، بگــێرە وە گــۆش

ئامان «ڕشکەپێ»[٤]، نەکەی فەرامۆش

تــــماشاییەن، چــــەشمە و ســـــەراوش

لە دونــــیا نــــیەن، ئــاوێ چــون ئــاوش

«میکان» و «مینگە»[٥]، ڕەوانەن هەر ساڵ

مــەحاڵێ نــیەن، وەشتــەر لەو مــەحاڵ

هــۆشت بــۆ شــەماڵ، ئــامان ســەد ئــامان

ڕەوانت ڕەوان، نــــــەبۆ لە «ڕوان»[٦]

کــۆیە مــەوێنی، ڕووبــەڕووت شــەماڵ

سەرد و سەخت‌ترن، لە قولەی «ساراڵ»

تــــاوێ وێت بــــدەر، وە کــۆ کــاوەدا

بــەو جــای بــا ســەفای، پــڕ لە ئــاوەدا

---

١- دووکێوی بەرز لە ناوچە ئیمامی و ئێناخی.

٢-کێوێکە بەرانبەری شاری «پاوە» کە قەدیم ئاتەشگای زەردەشتیان بووە.

٣- ناوی چەشمەیە لە ماکوان هەوارگەی ئیمامی و ئێناخی.

٤- چەشمە و هەواری زەردۆیی لە نزیکی ئاتەشگاە.

٥- ناوی دوو ڕووبار لەنزیکی باینگان.

٦- ناوی لادێی زەردۆییە.

مەشامت وە بۆی، شەوبۆی کەیل کەرە
جەو دوما هەوای، کۆی «دوجەیل»[١] کەرە
سەحرا و کەش و کۆو، دەرە و دۆڵ و یاڵ
تەی کەرە وە تاو، تا وە «هەرەگاڵ»[٢]
ئاسۆ وە ئاسۆ، دەن و دەر و دۆڵ
«چالآو»[٣] و «ناوێڵ»، مەشی و «شەشۆل»[٤]
بەهەشت نەدارۆ، سەفای زینەتش
دونیا نمەدۆ، نسیمەی قیمەتش
جای بەزم و ڕەزم و مەرام مەیل بی
چون «دوجەیل» ماوای، مەجنوون و لەیل بی
وە یاد قەدیم، سەفای سەرڕاخان
زاخاو دڵ دەر، وە بۆی ئێڵاخان
با عەرز بەندەی، وێت لە گۆشت بۆ
بێ خۆف نەویاری، شەماڵ هۆشت بۆ
با وە سەراحەت، بواچووم وە پێت
شەماڵ نەترسی، «زلان»[٥] ها لە ڕێت
بەو سەحرای شیرین، بۆ عەنبەرینش
یەکپارچە گوڵەن نیەن قەرینش
چەمەن چیمەنەن، چەمەنەن باخەن
کەمەرەن کاوەن، شاخەن ئێڵاخەن

---

١-کێوێ جوانە لە ناوچە نێناخی. ٢-کێوی «بێ وەن»ە لەنزیکی «جوانرۆ».
٣- هاوینە هەواری تایفەی مەنوچەری و «میرناولی» و «لۆرابەگی» و «نۆخانی» جوانرۆیە.
٤-کێوی بەرز لە نزیکی «نۆخان» و «نەوەل» جوانرۆ.
٥- لادێ یەکە نزیکی «چەمەنزار» جوانرۆ.

حەوزەن حەیاتەن، چەمەن کانی یەن

ئاوش ماچی ئاو، زندەگانی یەن

هەڵەتەن سەختەن، کەمەرەن کاوەن

سەیرانگای سەیرەن، شکارگای ڕاوەن

شەماڵ سادەی سا، تۆ بی و یا «عەلی»[1]

ئەر سەرێ نەدەی، لە خێل «سەیالی»[2]

بکەر تماشای چەشمە و سەراوش

تماشاش وەشەن، شکارگای ڕاوش

حەرامەن شەماڵ، لێت ئەرکەری خاو

تا سەرێ نەدەی، وە سارای «ناراو»

سەرشار بەر وە سەیر، سەفای سەراوش

نمەیۆ هەزار، «کەوسەر» وە خاوش

ئاوش ماچی ئاو، زندەگانی یەن

جای میر و ئەمیر، «باوەجانی»[3] یەن

شەخسێ هەن شەماڵ، بەرز و دیاری

شەماڵ بێ سڵام، وە لێش نەویاری

بسەند «بەنی گەز»، بەرزی «وەزەنە»

سەیر کەرە تا سەر، «سەراو گەزەنە»

ڕەپێل گەی ڕاگەی، تەڵمیت[4] بارانەن

هەر ساڵ هەوارگەی، شەدەلارانەن

---

١- حەزرەتی عەلی.

٢- لادێیەکە لە بەینی چەمنزار و میرئاوای باوە جانی.

٣- مەحاڵێکی بەربەڵاوە وکوێستانی لە خۆرنشینی جوانرۆ تاسنووری «عیراق» ناوی شارەکەیان «سەلاسە».

٤- ئەو بارگە و بنەیەکە کۆچەرپەکان ئەیبەن بۆکوێستان.

بـــــارئەناز بـــــار، نــــازفرۆشانەن
شـــەو مـــەنزڵگای شـەو، مـار لە دۆشـانەن
جـــای وەعـــدەو وەعـــید، مـەرام مـەیلەن
چون «دوجەیل» ماوای، «مەجنون» و «لەیلەن»
سەیر کەر وەو سارای، خوەتەن[1] تەرزەوە
وەو بـــەند بـــاهووی، ســـەوز و بـــەرزەوە
هـەر گـۆشەش بـدیەی، مـاچی بـەهەشتەن
هەر حـووری نـووری، وێش پـیا وەشـتەن
هـــەر شـــاخێ بـــاغێ، هـەر بـاغێ گـوڵێ
هـــــەر چـــڵێ گـوڵێ، گـــوڵێ بــوڵبوڵێ
لە هـــــەزار لاوە، چـــــەم و کـــــانییەن
جـــێی وەشـــی و شـــادی و کـامرانـییەن
شـــەماڵ بــە شـــادی، ڕاهـی بـەر وە شـاد
شادی کەر تـا سـەر، تـەپەی «مـیرئاباد»[2]
شێت نەوی شـەماڵ، چـون مـن عـاقڵ بـە
لەو جـــای بـاسەفا، چـــەن ڕۆژ مـاتڵ بـە
لەو جای باسەفای، سەحرای خوەتەن تەرز
شەماڵ سەیر کەرە، وە سـەد خـۆف و لەرز
کاو و کەش و کۆش، یەک پارچـە نـوورەن
وەش‌تر لە بەهەشت، پـرپەری و حـوورەن
چێش واچوو شەماڵ، چەنیت واچوون چێش
شەماڵ بەهەشتەن، بـۆی حـوور مـەیۆ لێش

---

١- ناوی قەدیمی بەشێ لە تورکستانی خۆرەڵات یا تورکستانی چین کە ئاسکی موشکی مەشهورر بووە.
٢- میراوای «باوەجانی».

شــەماڵ مــەوێنی، یــەك تـاكـە حووریێ
ســەر تـا پـا بێ گـەرد، گـەردەن بـلووریێ
مــــوكریمەن مــــەیۆ، وە ئـــــیستقباڵت
شــێت نــەوی شــەماڵ، بشــێویێ حـاڵت
دانــــا و مـــێهرەبان، مــێهمان نــەوازەن
شـــــیرین ســـفەتەن، شــەكــەرین ڕازەن
چــون شــنۆی نــەسیم، وێت لە بــەیاندا
بـــــویارە وە بـــان، ســەراو «شــیاندا»[١]
لەو ئاوە چون شەهد، شەكـەر بكـەر نـۆش
ڕەنــج ڕای ڕاگــەت، بكــەر فــەرامـۆش
ڕای «حەفت كەش»[٢] دوورە، «شێفیلە»[٣] تووشە
چون شەهاب شـەو، بـویەر لە «لووشـە»[٤]
كـــۆیە مـــەوێنی، چــون «دەمـــاوەنەن»
ئەو كـووە شـەماڵ كـۆی «سـاراوەنـەن»[٥]
جاگیر بەر لە سـەر، قـولەش چـون «نـادر»
بكـــەرە تـــەواف، «شــێخ عـەبدوڵقادر»[٦]
ئــەگــەر مــەیلت بــۆ، «ڕێـزە»[٧] نـزیكە
ئــاویێ مـەوەری، مــەشی وە «زیكــە»[٨]
«ڕێــزە» لەو ڕێــزە، بــەر مــەیۆ سـەردەن
هەر ڕێـزەی «ڕێـزە»، شـفای سـەد دەردەن

---

١- سەراوی میرئاوا.
٢- كەژی كاكەڕەشی.
٣- مەشهوور بە باخی میری.
٤- نزیكی میرئاوایە.
٥- كێوی سەرینی «ڕێزە».
٦- نەزەر كەردەی حەزرەتی «غەوس».
٧- چەشمەیە شەفا بەخشە لە باوەجانی.
٨- شوێنێ لە نزیكی ڕێزە.

شەماڵ بزانە، باتن و زایەر
لە ڕاتەن هەڵەت، سەخت «سیاتایەر»[١]

مدارات نەبۆ، بە وەخت و بێوەخت
وە جەخت بویەرە، لەو دەربەند سەخت

چون شاهێن وە شوێن، سەید کوڕکوڕدا
باڵێ بشانە وە «دەشتیوڕ»[٢] دا

تەشریف بەر وە سەر، کانی «قوڵقوڵە»[٣]
چون دڵەی عاشق، مەدام پڕ کوڵە

سەردەن سفیدەن، سافەن زەلاڵەن
گەواران وەشەن، شایستەی حاڵەن

نەسیمش هەوای، بەهەشت مەبێزۆ
جە فەزای هەواش، عەنبەر مەڕێزۆ

شەماڵ بۆ چون من، وە ناڵانەوە
پاڵە کەر، پاڵ دەر، وە «پاڵانەوە»[٤]

مەشامت وە بۆی، چنوور و شەوبۆ
با پڕ بۆ وە بۆی، فەزای «داڵەهۆ»[٥]

وە یاد مەجنوون، دڵ جەغەمان کەیل
مەیلێ تازە کەر، مەیلە و دەشت لەیل[٦]

شەماڵ بۆ وە عەشق، یادگار یاران
بە شەوق شەفەق، زەردی ئێواران

---

١- ملەیە سەخت لە نزیکی تازاوای باوەجانی.
٢- دەشتی وڕ یادەشتی حوڕ والە «باوەجانی» کە بە شاری «سەلاس» مەشهوورە.
٣- چەشمەیەجوان لە قوڵقوڵەی باوەجانی.
٤- ناوی لادێیەکی «قەڵخانی».
٥- کێوێکی بەرزو دیاری لەچەمی زریسك تا حەفت کەش لە بەینی «قەڵخانی» و «باوەجانی».
٦- نزیکی «داڵە هۆیە».

خـــاترت وه خـــار، غـــەم مـــەبا مـــەلوول
عەرزم عەرزە کەر، وه بارگەی «بـالوول»[١]
عەرزم هەر ئـێدەن، ئـەر ڕۆ بـۆ ئـەر شـەو
ئـــــازیز نـــزیکە، مـــەسپارووش وه ئـــەو
لە دیـدەی بـەدان، مـەحفووز بـۆ دیـدەش
خـــەم نـــەبۆ قـــامەت، سـەوڵ کـەشیدەش
گـــــەردێ نـــەگـــیرۆ ئـــایەنەی ڕەنگش
گەردین بـۆ شـێوەی، شـیشەی قـەشەنگش
شـــــەماڵ وه نـــــەرمێ، بـــــاڵێ بشـــــانە
دۆعـــــای «گـــنج‌العـــرش» بـــە وێـتا وانـە
بـــــەری لە ئـــــافات، دوور بـــا لە بـــەڵا
بـــێ بـــەڵا بشـــۆ،وه ســـەراو «قـــەڵا»[٢]
تـــەواو «دەشـــتی‌وڕ»، تـــا ســـەراو «قـــەڵا»
بـــێ فـــەرقەن خـــاکش، بـــا خـــاکە تـەڵا
درخـــتش گشت عـــوود، خـــاکش عـــەنبەرن
مـــوشك ئـــەفشـان زوڵـــف، دێـــز دڵـــبەرەن
قـــادر وه قـــودرەت، عـــەمدەن ســـرشتەن
نـــوور تـــەجەلای، وێش پـــێ‌یا وەشـــتەن
مەخسووس «سێ‌تەپان»[٣]، بەرگوزیدە کـەرد
لە گشت عـــەزیزتر، نـــوور دیـــدە کـــەرد
شـــەماڵ ســـــادەی ســـا، دەســـم وه دامـــان
تەشریف بەر وه سەیر، سەفای «سێ‌تەپان»

١- زیارەت‌گای قەڵخانیە لە «داڵەهۆ»دا. ٢- سەراوی «میرئاوا.»
٣- دێیەکە لە نزیکی «تازاوا»ی باوەجانی.

ڕاسەن «دەشتیوڕ»، گشتی شیرینەن
لە گشت شیرینتر «دێکەی ئەمینەن»[١]
بدیە بوێنە، چ باخێ دارۆ
چ جیلوە و جەلا و پەرداخێ دارۆ
چ بەنەفشەجاڕ، سونبڵێ دارۆ
بەرجەستەترین گشت گوڵێ دارۆ
مەشامت وە بۆی، عەترش پڕ کەرە
ئەوسا تماشای، «دەشتیوڕ» کەرە
مەدام چون بەهەشت، نوور لێش مەوارۆ
هەزاران هەزار، پەری و حوور دارۆ
ئاوش بەر مەیۆ، لە بەتن حەجەر
«الطهور العین»[٢] جۆی شیر و شەکەر
شەماڵ ئەو کانی، پلووریێ دارۆ
هەر زەڕەش ئەرزش، کورووریێ دارۆ
ئەو سیمای سیمین، جەمین چون جامە
ئەو شیرین شەوکەت، شیرین کەلامە
ئەو قسەد و قامەت، قسەیامەت خێزە
ئەو جەماڵ مانگ، چواردە بێزە
هەر سۆح تێتە سەر، «کانی پلوورە»[٣]
ئەو گەردەن بێ گەرد، گەردەن بلوورە

---

١- ئیستە شاری «سەلاس» نزیکی بوەتەوە.
٢- ئاشیرە بە «ماءً طهور» چەشمەی ئاوی پاك و بێ گەرد.
٣- چەشمەیە لە دەشتی وڕی باوە جانی.

پەی سەفای سوورەت، زوڵف و خاڵ وێش
پەی جەلای جەمین، کۆی جەماڵ وێش

چین مەدۆ وە چین، ئەگریجەی[1] چەنگش
کەرۆ وە پەرچین، دیدەی قەشەنگش

وە پەنجەی لەنجە، ئاو مەکەرۆ شەق
مەشانۆش لە ڕووی، گۆنای زەڕوەرەق[2]

ئەگەر دیت و هات، چەم وە جەلاوە
چون مای «سەڵمانە»، وە «سەر قەڵاوە»

مەخفی نگا کەر، وە کەمینگاوە
نەوا بوێنۆت، وە نیمنگاوە

موژەش بنیشۆ لە ڕیشەی جەرگت
چون من بناڵی، تا وە ڕۆی مەرگت

ڕووم نەوی شەماڵ، چەنش واچوون چێش
دڵ بیەن وە نێش، موژەی دیدەی ڕێش

یەك دەمێ وە دەم، بێ ئێشش کەرە
وە مەڵهەم مەیل، سارێشش کەرە

جارێ کەری سەیر، باڵای نەمامش
مەوی تا سەد ساڵ، تۆیچ وە غوڵامش

مەست نەوی وە دین، دوو دیدەی مەسش
بێخۆف بای لە تێغ، ئەبرۆی پەیوەسش

ئەر بدۆ وە «قاف»[3]، بێ ڕای بێئینساف
شەق مەبۆ شەماڵ، ئی قاف تا ئەو قاف

---

١- زوڵف.
٢- مەبەست لە ڕووی جوان و سپی نگارە.
٣- مەبەست قولەی بەرز و سەختی «قافە» کە لە چیروکدا ئەڵێن جێی هیلانەی سیمورغ بووە.

تەماشای باڵای، ئەمامش کەری
گوڵ ئەخوەی شەماڵ، سڵامش کەری
مەپێچۆت وە زڵف، بۆ عەبیرەوە
پەی وێش مەکەرۆت، وە زەنجیرەوە
با تەنیا «ئەحمەد» گیر دامش بۆ
تامەحشەر شەماڵ، هەر غوڵامش بۆ



## شەماڵ ئامانەن[1]

شەماڵ ئامانەن، شەماڵ ئامانەن
شەماڵ سادەی سا، ئیمجار ئامانەن
ئێش بێ سامان، کاری زامانەن
بە وێنەی عەرەو، دەسمە دامانەن
ساکنی زامان، دەرد داغانەن
فەزای شکۆفەی، سەیر باغانەن
وادەی کۆچ ئێڵ، بەرز دەماخانەن
هەواشان وە مەیل، پای ئێڵاخانەن

١- ئەم شێعرانە کە «میرزائەحمەد» بە ناوی شەماڵ گوتوویە جگە لە جوانی تایبەتی‌یان لە ڕوانگەی «جغرافیایی» دانرخ و بایەخی زۆریان هەیە بەم جۆرە کە زۆربەی ناوو ئیسمە جوان و قەدیمەکان ڕابردوو وە مەحاڵەکان وڵاتەکەمان دوارە زیندوو دەکەنەوەو بۆ هەتاهەتایە لە بیر ناچن و لە مێژووی ئەم گەلەدا سەبت دەبن.

کەش و کۆ جە شەوق، گوڵ چراخـانەن
چنوور تۆق بەستەی، هەرد[1] زاخـانەن
وەفـراوان جـاری، پـای مـەغارانـەن
سۆسەن و شـەوبۆ، شـەیدای بـارانـەن
نـەرگسان کـەیل، پـای چـنارانـەن
شـەفاف شـنۆی، وەڵگ دارانـەن
وادەی شـمارەی، ڕەش دەوارانـەن
عـیشوە و ئـیشارەی، شـەدەلارانـەن
سـەیران سـەفای، گـوڵ عـوزارانـەن
وەخت دیـد و بـاز، دۆس و یـارانـەن
سەرکەش شێعر خوان، شەکەر بـارانـەن
ئـیرساڵ مـەرسوڵ، دەردەدارانـەن
سـەڕافـی دانـەی، مـایوو خـاڵانەن
وەخت گـەشت و گـێڵ، کـوردەماڵانەن
مەحروومی «مەجنوون»، دیدار «لەیلەن»
«لەیلێ» خاتر کەیل، سەحرای «دوجەیلەن»
شەهیدی «فەرهاد»، شازادەی «چـینە»ن
زایـەڵەی «شـاپوور»، شـین «شـیرینەن»
ئـیسە مـن وەی زام، نـەسرەفتیمەوە
شـەماڵ وەی نـامەی، بـۆ نـەفتیمەوە
بـدەین غـەمخانەی، دڵ وە تـاڵاندا
گێجێ بـخوەین وە نـاو، کـوردەماڵاندا

---

١- شاخی سەخت و پربەرد، زەمین.

مـــینگە[1]وە مـینگە، هـەوار وە هـەوار
ئـێڵ ئـەحشامات، کـۆمار وە کـۆمار[2]

چـــەشمە وە چـەشمە، کـانی وە کـانی
تــەفریگای زومــرەی خــان خــەوانـی

بەن، بـەن، کـۆ وەکـۆ، بـاهوو وە بـاهوو
شـەماڵ ئـەمانەت، مـن مـەدەم وە تـوو

بگــــێڵە هـــــەتا، مـــەشی وە جسایە
بــــەرز دڵـــنشین، پــڕ جــە سـەفایە

فەزای فەرەح بەخش، چـەشمئەنازێوەن
مـەنزڵگای شـیرین، شـەکـەر ڕازێـوەن

شـــــەوان مـــــەمدەرۆ، وە شـــەماڵەوە
ســــەحەر مـــەقابڵ، وە «گـــاچاڵەوە»

نیشانەش ئێدەن[3]، ساتێ بکەر گـەشت
ساراش بۆ مەدۆ، چون ڕەوزەی بەهەشت

شــەماڵ بــۆ تـو دز، مـن پـاشکەمانت
ئـــیمجار وەگـــیرەن، دەسـمە دامـانت

مـــــن وێـــم نـــمەدەم، وە ئـــاماجشان
تــــۆ ســـەر بکـــێشە، وە کـــۆماجشان

پـــاسەم شـــنەفتەن، وە قـــەوڵ گـــفتار
مـاچان سێ مـاڵن، هـان لە یـەك دەوار

١- شوین.
٢- گەڕەك ـ چەن ماڵ لە نزیکی یەکدا کەپرو چەرداخو دە واریان هەڵ دابێ.
٣- ئەمەیە.

ئـــامانت بـــووگم، وە دەخـــیلەوە
وێت بـووزە بـە وار، وە «سـەر تـیلەوە»
ئـەمانەت فـەرزە، مـن مـەدەم وە تـوو
ســـتوون ئـەوەڵ، تـا سـتوون دوو
بـــدارش وە چـــەم، وە پـــێوازە وە
نـــیشانەش ئـــێدەن، وە شـــێوازەوە
ئـەگـەر مـەپەرسی نـیشانەش کـامەن
شـێوەی شـیرینیش، مـەشهوور عـامەن
«لەیلێ» سـفەتەن، سـەوزە ڕۆخسـارەن
«شیرین» شەوکەتەن، شـەکـەر گـفتارەن
عـــەرعەر ئـــەنامەن، بـــاڵانەمامەن
جەمین چون جامەن، زڵف دەسە دامەن
کوێچە چەنگێ وەن، شۆخ شەنگێ وەن
چەم سێوەنگێ وەن، ئەتڵس ڕەنگێ وەن
خاڵ قەشەنگێ‌وەن، مەیل وە جـەنگێ‌وەن
دڵ جە سەنگێ‌وەن، یـەك فـەرەنگێ‌وەن
زڵف زەنـجیرێ‌وەن، بـژانگ تـیرێ‌وەن
بـــۆ عـــەبیرێ‌وەن، کـــوردەمیری‌وەن
مار نـە دۆشـی‌وەن، دڵ وە جـۆشێ‌وەن
شـــەکـەر نـۆشێ‌وەن، ژار فـرۆشێ‌وەن
نـــەونەهاڵێ‌وەن، ســـۆسەن خـــاڵێ‌وەن
قـەد شـمشاڵی‌وەن، شـەو غـەزاڵـێ‌وەن
موشکین مووێ‌وەن، ئـافتاب ڕووێ‌وەن
عـەمبەر بـووێ‌وەن، مـار گـیسووێ‌وەن

تەڕلان بازێوەن کەوك نازێوەن

تاوس تەرحێوەن تووتی ڕازێوەن

ڕاز وە نازێوەن، تیرئەندازێوەن

وە خود نازێوەن، یەك تەنازێوەن

شیرین شەرمەندەی، بێستوونێوەن

چەم وە ئەسرەوەو، چنگ وە هوونێوەن

گەردن زەردێوەن، دڵ پڕدەردێوەن

خاڵ بێ گەردێوەن، بێ هامفەردێوەن

شەماڵ تۆ حەکیم، حاڵ یارانی

مەڵهەم زەدەی زام، دەردەدارانی

شەوان شەندەی زڵف، شەدەلارانی

مەحرەم وە سینەی، گوڵعوزارانی

ڕەونەق بەخش شەوق، جەمین جامانی

جەلاڵ جلوەی، نەونەمامانی

لاقەید لە تانەی، بێگانە و خوێشی

ئەشێ ئەم جەورە، بۆ من بکێشی

بۆ! مەکەر مدار، تۆ پەروەردگار

تا سپیدەی سوح، نەوگە ئاشکار

غەم و پەژارە، ئەرواحم سەندەن

شەماڵ سادەی سا، شەوگار نمەندەن

مەبادا کێشووم، ژ پەردەی نەفەس

ئاهێ ئاهرین، بە وێنەی قەقنەس

«شاوەکۆ» جەو ئاە، ئاتەش مەسانۆ

سا پڕشنگ وە هەر، کۆیە مەشانۆ

ئـەو هـەم مـەسووچنۆ، ئـاه ئـاتەشیم
هەی خاکم وە سەر، چێشەن دڵخوەشیم
سارای «ماهیدەشت[١]»، مەکەرۆ خاپوور
پارچەی «بەنیگەز»[٢]، مەبۆ وەکۆی «توور»
لاڵ بـام مـەبادا، وە شـێوەی دڵـبەر
شـەرارەی ئـاهم، بـیاونۆ زەرەز
یا هەرگـەرمی دووی، ئـاهم بـدۆ لێش
ئەو هەم مەسووچیۆ، چون گڕسندەی وێش
هـەنی جـە دنـیا، بـەرمەشۆ دی کـەس
عەرش و ئاسمان، مەسووچۆ یەکدەس
«ئەحمەد»! تۆ وە توون، دونیا وە تەوەس
دونیای بێ‌دڵبەر، حەق نـەیدا وە کـەس



١- دەشتێکی زۆر گەورەو بەربڵاوە هەرلە «کرماشان» تا «ڕوانسەر».
٢- ڕشتەکێوێ جوان لە «بازان» نزیکی «جوانڕۆ».

## شەماڵ غەمانم

شـــــەماڵ غـــــەمانم، شـــــەماڵ غـــەمانم
بـــــۆ بـــــدەر وە بـــاد، عـــومدەی غـــەمانم
وە مـــــــەرگت قـــەسەم، ئـــاگـــر وە گـــیانم
قـــرچـــە دان وە جـــەرگ، مـــۆخ و ســوقانم
ســـــەنگ کـــــەرۆ وە ئـــاو، شـــۆر گـــریانم
مـــەیاۆ[1] وە عـــەرش، قـــرچـــەی بـــریانم
شەماڵ بۆ بە عەشق، «مـەجنوون» و «لەیـلێ»
فـــــریادڕەسیم کـــەر، دڵ کـــەیلەن خـــەیلێ
ســـەراپـــام وە نـــار، گـــرپەستەی نـــەفتەن
چـون ئـازیز وە ئـێش، زامـم نـەسرەفتەن[2]
چـــارم نـــاچارەن، ڕای ڕاســـیم چـــەفتەن
دوور بۆ جە ئازیز، سـەخت کـۆسم کـەفتەن
قامەتم چون چـۆی، چـەوگان چـەم وەردەن
چون ئەبرۆی ئـازیز، وە هـەم خـەم وەردەن
ڕەنگ زەردەن جە داخ، ڕەنگ زەردی ئـازیز
خـــــەزانش کـــــەردەن، بـــێوادەی پـــاییز
فـــدات بـام شـەماڵ، جـە غـەمان کـەیلم[3]
چـەمەڕای هـەواڵ، مـوژدەی «دوجـەیلم»[4]

١- نەگەیە.
٢- سارێش نەبووە.
٣- پڕ.
٤- شوێنەکەی مەجنوون.

عــــوزر نــــاوەری، ڕا دوورەن خـــەیلێ
وە یـــاد جـــاران، تـــازە کـــەر مـــەیلێ
چـــون ســـیمورغ وە قـــاف، بشـــانە بـــاڵێ
هــــەواڵ پـــرسی کـــەر، بـــاوەر هـــەواڵـــێ
وە شــــــــەرتێ شــــــەماڵ، وە دەوان دەو
نـــە وە ڕۆ ئـــارام، نـــە شـــەو کـــەری خـەو
بکـــێشە شـەماڵ، بـاڵ چـون شـەهاب شـەو
بشۆ وە تـەواف، «مـیر حـەمزەی[1] عـەرەو»
وە شـــەرتێ پـــاك بسۆ، ســـوبح سـەحەرش
وەشـــەن تـــماشای، مـــەنزەرەی خـــوەرش
«زاخە» و بادمسان»[2]، کـوی «نـقارە کـۆ»[3]
تـــــا «چـــــەنگیزقەڵا»[4] مـــــدارات نـــەبۆ
لە «قـــــزڵ قـــەڵا»، وە جـــەخت مـــەویاری
مــــــەوێنی بــــــرجـــــێ، بـــەرز و دیـــاری
قـــولەش هـــەر ئـــەوەن، بـولەند و ســـافەن
مـــــەواچـــی یـــەکـــێ، لە قـــولەی قـــافەن
کـــۆی «قـــەبا سـورخـەن»، بـدیە بـە یـەقین
دیـــارە خـــوەر هـــەڵات، تـا وە خـوەرنشین
لە «قـــەرەچیمەن»، مـــەسکەن کـــەر تـــاوێ
شـــەکـــەتی بـــەر کـــەر، وە بـــەورە ئـــاوێ

---

١- مەرقەدی یەکێ لە ئەسحاب لە بەشی خۆرهەڵاتی شاری «جوانرۆ».
٢- دووکێون لە نزیکی سووریدەری «جوانرۆ».      ٣-کۆیێك لە نزیکی «هەلانی» جوانرۆ.
٤- قەڵای چەنگیز خان لە سەرینی شاری «جوانرۆیە».

«قەرە چەم» دەشتێ، خوەش هەوا و بەرزەن
ئاوش لە هاوین، مەواچی تەرزەن
چاگە مەویەری، «حەسار سفیدەن»
چەمەن چیمەنەن، چنارەن بیدەن
«کەیفە» و «زێران»، «مەنمی» و «گوڵباغی»
بێشەی پڕ لە شێر، لە شاهان یاغی
وە دقەت بدیە، وەو مەحاڵەوە
«هەوەتوو» دیارە، وە «ساراڵەوە»
باڵێ بشانە، مەگێر بەهانە
«سەقز» و «بووکان»، «سەردەشت» و «بانە»
بەن بەن، کۆ وەکۆ، لەیلاخ وە لەیلاخ
سەیر کەر تا وە سەر، سەرقولەی «باشماخ»
«باشماخ» یاگەی، شیرین تەرزانەن
چەمەن چناران، باڵا بەرزانەن
سەوزە و باڵابەرز، قۆچ مێشچاوەن
ئاهووی خوەتەن خۆی، گوڵکۆی پەڕاوەن
چەترچین شیرین، قاز و قوڵەنگ مل
شەدە شەوبەند شۆڕ، کەمەر شاڵ شل
شەماڵ فرسەتە، لەم «ڕەمەزانە»
شیرینی شەکەر، لەو سەر هەرزانە
شەماڵ ئەر وە سەمع، شەریفت یاوان
وە یاو یاو[1] بشۆ، تا وە «مەریوان»

---

١- ئەسپایی، هێواش.

بــــــویەرە وە بـــــــان «زرێــــبارەوە»
بــــدیە وە زیــــنەت، زیــــبای شــــارەوە
تــــــماشاییەن، ســــــەبا و ئــــێواران
دەس دەس نـــــازاران، مـــەویان مـــەیاران
خــاکش شــۆر ئــەنگێز، شــاعێر پــەروەرەن
کـــــۆی مــــەعریفەتەن، کــان گــەوهەرەن
کــــۆیە مــــەوێنی، لە کـــۆان تــاکــەن
قولەش چون قـولەی، «قــاف» ســەهمناکـەن
ئــەو کــۆ «کـۆسالان»، بـەنەن شـا وە کـۆن
شــــەماڵ شــایستەی، پــەڕ و بــاڵ تــۆن
وێت ئاسا دەیسا، تـەیران کـەر چـون تـەیر
جاگیر بەر لە تەخت، چون شا بکـەر سـەیر
بــــاغەن بـــولاغەن، ســـەولاوان دەشـــتەن
سەیرانـەن سـەیرەن، سـەفای گـوڵگـەشتەن
شــەماڵ خــاترت، لە غــەمان شــاد کــەر
چون من تـماشای، «مـەحموود ئاباد» کـەر
بـــــدیە بـــــوێنە، چ بـــاخێ دارۆ
چ قــــەسرو ویـــلا، چ کـــاخێ دارۆ
حــەوش و حــەیات و گـوڵباغچە و گـوڵش
بـۆی بــەهەشت مــەدۆ، مــاوا و مـەنزڵش
چون خوەتەن خاکش، یەکسـەر موشکینەن
بـاغش مــاچی بـاغ، ڕۆحئـەفزای چـینەن
شـــەماڵ وە یـــەقین، قـــاپی مـــورادەن
مـــەکـــان مــــەقام، قـــوتب ئـیرشادەن

لە هەر حەفت ئقلیم، مەعرووفەن نامش
بەرزەن لە ئەوتاد، پایە و مەقامش
«اَسْماءُ الله» و عەزیمەن نامش
شەماڵ چون من بەر، تۆیچ وە غوڵامش
«ئەحمەد» ڕیزەخوار سفرە و خوانشەن
«فانی فی الله» و، سەنا خوانشەن
ئیجازە بگرە، لەو پیر کامڵ
تەشریف بەر وە سەر، قولەی «سوور کەوڵ»
ئاوێ بوەرە، لەو ئاو کانی‌یە
ئاوش ماچی ئاو، زندەگانی‌یە
شەو بخەف سەحەر، زوو ئاخێزکەرە
تماشای بەرزی «کۆی ئارێز» کەرە
شەماڵ چون شاهێن، هەر ئەو بەیانە
وێت بدەر لە برج، بەرزی «میانە»
بدیە بوێنە، چ کۆساریٚ وەن
چ شاخ شیرین، پڕ شکاریٚ وەن
غارەن مەغارەن، شاخەن شەتاوەن
قولەش موتابق، قولەی «پەڕاوەن»
سەختەن هەڵەتەن، کەمەرەن کاوەن
سەییادەن سەیدەن، شکارگای ڕاوەن
لێژۆ بەر چون ئاو، سەرەنەر[1] کەرە
وە جەخت بویەرە، لەو دۆڵ و دەرە

---

١- دەرچۆ.

فـــەرامـــۆش نـــەبۆ، دەســـم وە دامـــان
نـــــەهار لە «تـــێژتێژ» شـــام لە «ئـــارەنان»
شـــەماڵ ســـەرو نۆی، چـــەمەن «مەعمەد»
تـــــــماشاییەن، لەو جـــــا نـــــەوی ڕەد
بـــــدیە بگــــێڵە، شـــەماڵ شـــۆن وە شـــۆن
وە تـــــەنیا بشـــــۆ، وە «کـــــەمێزە کـــۆن»
وە پــــــەژارەوە، شــــــەو نـــەدەی وە ســـەر
مـــــــدارات نــــــەبۆ، تــــا وە «ئــــاویەر»
گشت کشتەن گـولەن، مـەزرەعەی سـەوزش
ماچی «کەوسەرمن»، سەرچـەشمەی حـەوزش
ئـــــاوێ بـــــوەرە مـــــەیلێ تــــازەکــــەر
حـــــەمد و ســـەنای حـــەق، بـــێ ئەنازە کـــەر
وە پـــــێچ و قـــــــەمچ و وە خـــــــەم و دەورە
دەورێ دەر لە دەور، «ئـــــــاویەر» گـــــــەورە
وە ئـــــیستیغناوە، بگــــــێڵە تــــــاو تــــــاو
وە یــــەواش یــــەواش، تــا وە «ســـەر ئـاسیاو»
لە «مـــــــــاماتگە»، بـــــــــوەرە ئـــــــاوێ
ئــــــاوێ وا شــــــەماڵ، دی پــــــەیدا نــــاوێ
ســـــــەر و ســـــوورەتت بــــە ڕووی ســـەفاوە
ســــــەفا دەر وەئــــــاو، «کـــانی شـــەفا» وە
چون شای نەو جلووس، زیبای زەڕین ڕەخت
وە «ســـەر تـــە خـــتەوە»، بـنیشە وە تـەخت
لەنگ نـــەوی شـــەماڵ، وەختم وە تـەنگەن
دوور بـــا پـــای ئـــازیز، لە ســـەیران لەنگـەن

ڕەعـــــدئاسا دەیســـا، وە نـــالانەوە
نـــاڵە کـــەر وە کـــۆی، «عـــەوالانـــەوە»
بـــوڵەند کـــۆیەوەن، بـــا وەقـــر و شـــەرەف
بـــدیە دیـــارە، لە هـــەر چـــوار تـــەرەف
«سەرچی»و «نشوور»، چەنی «تـا» و «دۆڵاو»
«چـاڵی» و «چـــەمەرگا»، مـەوێنی وە چـاو
ئـــەو جـــا مـــەعبەدگای، پـــیر کـــامڵەن[1]
شـــــەماڵ مـــــورادت، لەو جـــا حـــاسڵەن
حـــەکـــیمەن پـــەی دەرد، زامـــان کـــاری
وە بـــــــێ زیارەت، وە لێش نـــــەویاری
تـــــەوافـــــێ کـــــەرە، وە تـــــەمەناوە
خـــــواحـــــافیزی کـــــەر، بشـــــۆ وە ڕاوە
ســـەرسەری ســـەر دەر، وە «بـاعس‌پەڕنە»
بشـــــۆ وە «گـــــورگان»، بـــوێنە «زەڕنـــە»
«زەڕنـــــە»[2] زەڕیـــنەن، زەڕ لێش مـــەوارۆ
چـــون یـــەك وەجـــەب خـــاك، بێ‌ئاو نـــەدارۆ
«لۆن» و «شـــــایەنی»، هـــــەر دوو دیـــــارە
پـــەروازکـــەر چـــون پـــەیك، لە پـــەی ئـــاوارە
«پاگە»[3] و «کەماڵە»[4] و بخۆمای «شمۆەر»[5]
تـەنگ«نوورمسوور»[6]،«تـەلاش»[7]و «سـەنجەر»[8]

---

١- مەبەست «شێخ موحەممەدی» زاد نەخۆرە کەمەرقەدی وا لە «دۆڵاو».
٢-کێویکی بەرزە لە نزیك لادێکانی «لۆن کۆن»، «کەلاتێ»، «تـەختی زەنگـی»، «پشتە»، سـەر بـەشاری کامیاران.
٣-کێوێکە لە نزیك دێی «بەلەزێن» ڕوانسەر.
٤-کێویکە لەدێی «کەلاوە»ی «ڕوانسەر».
٥- ناوی کێون لە لادێی «خەراجیان» سەر بەناوچەی «ڕوانسەر» لە مەحاڵی باشۆکی.
٦ و ٧ و ٨- پیشین.

بشـــۆ وە «زیـــنان»[١]، جـــاگـەی شکـارەن
قـــولەی «ڕوانســـەر»، لێت ئـــاشکارەن
«ڕوانســـەر» دەشـــتێ، پـــڕ سـەفا و کشـتەن
مـــاچی پـــەی بـــەهەشت، خـــودا سـرشتەن
تـــــازە مـــــەسجدێ ســـــازیان ئـــارۆ
وێـنەی تـاق عـــەرش نـــور لێش مـەوارۆ
«ڕوانســـــەر» ڕۆشـــن، جــە نـــور فــەڕش
خــــێزیا خــــــەیر و، بــــێزیان شـــەڕش
واجـــــــبەن شــــــەماڵ، بشـــــۆ بســـوێنە
فــــەرزێ ســــــونەتێ، تـــێیا بـــخوێنە
تـــــماشای ســـــــەراو «ڕوانســـــەر» کـــەرە
ئاوش وێـنـەی ئـاو، چـەشمەی «کـەوسەرە»
تــــاف مـــەدۆ چـــون تـــاف، وەفـــراوان کـۆ
سەفاش هـەن چـەنی، کـۆکـۆی «وشکـەرۆ»
خـــاکش مـــاچی خـاك، خـوەتەن زەمـینەن
پـــــــــاتەخت زیـــــبای، والی نشـــــینەن
مـەخسووسەن بـدیە، وە«تـەختی‌زەنگی»[٢]
نـیەن نـاپەیدان، تــەخت وەی قــەشەنگی
تـەشریف بـەر وە سـەر، قـولەی «ڕوانسـەر»
خـــاس وە ئـــارەزۆ، ســـەیر و ســـەفا کـــەر

---

١- ناوی کێوێکە لەگوندی «خەراجیان» سەربە شاری «ڕوانسەر».
٢- بەردێکی گردوتەراشیاو و ساف کە ئەڵێن هی دەورەی «ماد» و بەسەنگی مەزبەح مشهوورەو لە لێوی سەراوی ڕوانسەر دانراوە.

شـــــەماڵ دیـــارە، بـــدیە وە زەروور
بەند «سەلەکان»[۱]، «خانیلە»[۲] و «دێسوور»[۳]

بـــەڕاس مـــوستەقیم بـــدارە وە چـــەم
وە خـــاتر جـــەمی، بشـــۆ وە «تـــەم تـــەم»[۴]

فـــیدات بـــام شـــەماڵ، وە ســـدق ســـافێ
لە جـــای مـــن لەوجـــا، بکـــەر تـــەوافـــێ

شەماڵ شێت نەویت، چـون مـن عـاقڵ بـەر
زیـــارەت زات، پـــیر[۵] کـــامڵ کـــەر

جـــای ســـدق و ســـەفا، عـــیلم و یـــەقینەن
مـــەزهەر شـــەرەف، ئـــیمان و دیـــنەن

کـــان کـــەرەمەن، کـــۆی مـــەرحـــەمەتەن
دارای کـــەرامـــات، فـــەڕ و ڕەحـــمەتەن

شـــەماڵ بـــۆ لە جـــای، کـــەمتەر غـــوڵامش
نـــەك جـــارێ ســـەد جـــار، بکـــەر سڵامش

«ئەحمەد»! ئی دنیا خودعەش سەد ڕەنگـەن
هـــەریەك وە نـــەوعێ، پـــاش لە ڕا لەنگـەن



۱- لەگوندەکانی «ڕوانسەر»ن.
۲- پیشین.
۳- پیشین.
۴- پیشین.
۵- «شیخ مەحموود» لە «تەم تەم» دێی سەر بە ناوچەی «ڕوانسەر».

## شەماڵ زەروورەن

شـــەماڵ زەروورەن، شـــەماڵ زەروورەن
شـــــەماڵ وە جـــایە، لوات زەروورەن
ئـــێدەن ئـــەر خـــاتر، مـــنت مـەنزوورەن
مـــەکـــیانووت بشـــۆ، نـــەواچـــی دوورەن
عـــــوزر نــــاوەری، فـــــرمانم پــــێتەن
هـــای شـەماڵ! ئـازیز، دیـدەش لە ڕێـتەن
چـــون یـــە چـەندێوەن، شـەماڵ مـەنمانی
تـــورەی تـــوغرای زلـــف، ئـەو نـمەشانی
بـــێ خـــەوەرەنی، شـــەماڵ جـــە حـــاڵش
مـــەر تـەرکت کـەردەن، ئـامۆشۆی مـاڵش
ئــــیسە بســـۆ تـــۆمار، حـــاڵش بـــوانـــە
مـــــەلاحزەش کــــەر، ســــابۆ بــــمانە
جە ســەختی زمســان، ئـەو بـێ دەمـاخەن
جە خەڵوەت خانەی، وێش دیل‌دوساخەن[1]
نیان پەی جـەستەی، خـەستەی پـەشێوش
ئــەنگوشت حـــەسرەت، وە خــاڵ لێـوش
نــــیەن نـــاز ئـــاخێز، ســـوبح و بـــەیانیش
کـــــۆتای کـــــردگە، ئـــامۆشۆی کـــانیش

---

١- زیندانی، بەندکراو.

زڵـفان وێـنەی مـار، جـەنگی مـەدۆ پـێچ
ڕۆژ بێ فەزای دەشت، شەو وە سزای کـێچ
شـەماڵ هـەی زلان! لێت زۆر کـەردە بـۆ
دەی چون من ئـازیز، لێت تـۆر کـەردە بـۆ
سـەختی زمسـتان، لێت مـەدۆ تـانە
ئەر نـەکـێشی سـەر، وەو خـەڵوەت خـانە
نە بـەخشی فـەرەح، وە جـەستەی خـارش
نەشکاوی چون گوڵ، قـورس ڕوخسـارش
شـی نـەکـەی زڵـفان، مشکـین تـاڵش
کـەیل نـەکـەی لە دەور، دیـدەی غـەزاڵش
نـەشێونی گـوڵەنگ، سـەرقەتارەکـەش
نـەزرنی چـون زەنگ، گـۆشەوارەکـەش
نـەماڵی نـەرمێ، وە بـاڵاشەوە
وەشـەرمێ ئـەو گـەرد، وە پـاڵاشەوە
سـەیر ئـەو بـاڵا، پـەی یـاران سـەفان
ئـەو گـەردە پـەی دەرد، بیماران شـەفان
فـرسەتەن شـەماڵ، بـۆ پـەرواز کـەرە
چـون قـاپی بـەهەشت، یـەقەش وازکـەرە
بشکـاوە دوگـمەو سـوخمە و سـنجاخش
سـەرشار بـەر وە سـەیر، تـماشای بـاخش
بـادا شـوکرت بـۆ، لەی فـەسڵ دەیـدا
مـەویاری بـێ غـەم، لە بـاغچەی بـەیدا
لە سـەحن ئـەو بـاغ، سـازیان حـەوزێ
جـە نـوقرەی خـام و فـیرۆزەی سـەوزێ

ئەو باغ بەهەشتەن، ئەو حەوز «کەوسەرەن»
چەشمەش لە شەربەت، شیر و شەکەرەن
حۆری کەی شۆخی، شێوەی ئەودارۆ؟
ڕەشتەی ئەنوەرەن، نوور لێش مەوارۆ
«توویا»[1] کەی وێنەی، باڵای ئەو بەرزەن
«کەوسەر» کەی تەرحی، حەوزی لەو تەرزەن
گۆیا لەوح وێنەی، سینەی ئەو سافەن
قەڵەم چون موژەی، ئەو مووشکافەن
ساق عەرش ماچان، حەق شەریف کەردەن
کەی چون سای گەردەن، ئازیز بێ گەردەن
پێشانیش کورسی، بێ شبهەو و شکۆن
عەدڵ و میزانش، کەی دیدە و ئەبرۆن
قادر وە قودرەت، لەقای وێش ڕەشتەن
هەر تایە جە مووش، قەسرێ بەهەشتەن
شەماڵ مەویەری، جە سەر ڕاشەوە
مەخێزۆ گەردێ، وە پاڵاشەوە
حەکیمەن ئامان، پەی دەوای دەردێ
ئەگەر باوەری، لەو گەردە گەردێ
شانی چون نەسیم، وە ڕووی داخەوە
چون خاك «مەکە»، وە «لەیلاخەوە»
دی قاپی قەفەس، نەفەس واز مەبۆ
ئازیز لە سەرما، سەرەفراز مەبۆ

---

١- ناوی دارێکە لەبەهەشتدا.

ڕەنگ زەردی «ئـەحمەد»، دووری نگـارەن

ئـەرچـی دەرد دڵ، ئـەو بـێ شـمارەن



## شەماڵ و «ئاویەر»[1]

دڵ هـەراسـانەن، دڵ هـەراسـانەن

شـەماڵ سـا دەی سـا، دڵ هـەراسـانەن

مـەرامـم مـەیلش، وە «کـوردسانەن»

ئەگـەر مـەیلت بـۆ، چـە لات ئـاسانەن

ئـارەزۆش وە دیـن، دیـدە مـەسانەن

هـەر شـەماڵ قـاسد، نـامەڕەسانەن

تـەسدیعت کـێشان، فـراوان خـەیلێ

یاونات نامەی، «مەجنوون» وە «لەیـلێ»

ئـیسە بـۆ وە ئـەشق، ئـەو دوو دڵـدارە

مەجزووب و مەحرووم، ئەو دوو بێچارە

وە شێوەی شیرین، وە ئـەشق «فـەرهاد»

«خوسرەو» وە ئەفسوون، ڕەنجیدا وە باد

وە ئاگر عـەشق، «نـوورە»وا یـەکـدەس

سووزیا بۆ «تاووس»، تا بی وە قەقنەس

---

١-کێوێکی جوان لەشاری «سنە» کە جێی سەیرانە.

وە شـێخ «سـەنعان»، وە دین تـەرسا
وا دیـن «تـەرسا»، پـەرسا و نـەتەرسا
منیچ چـون ئـەوان، وە تـۆ مـوحتاجم
وێت ئـاسا شـەماڵ، بکـەر عـیلاجم
هـەوای «ئـاویەر»، بـەرزی دەماخی
کـەفتگەسە یـادم، گـوڵباخی، بـاخی
جاگیر بەر لە سەر، قولەش چون جاران
تـازە کـەرە مـەیل، وە یـاد یـاران
نە جای من بـدیە، وەو سـەر بـەرزەوە
بەو سەحرای شیرین، خـوەتەن تـەرزەوە
بـدیە و بـوێنە، وە بـێدرەنگێ
مـەوێنی تـالار، کـیسرایـی ڕەنگێ
ئـوتاق شـەوخاو، ئـەو شـەکـەرباره
هـەر ئـان لە بـەهار، هـا لەو تـەلاره
عـادەتش ئـێدەن، ئـەو بـاڵا بـەرزە
ئەو شیرین شـۆخ، نـەیشەکـەر تـەرزە
ئەو سیمای سیمین، جەمین چون جامە
ئەو شیرین شـەوکەت، شـەکـەرکەلامە
ئـەوقەد ئـەوقامەت، قـیامەت خـێزە
ئـەوجەماڵ مـانگ، چـوارده بـێزە
تـا بـێتە خـەوا، خـۆی ئـەدا لە تـەل[1]
گۆشە ئەکێشێ، وەك مانگ لە سەر کەل

---

١- خۆی ئەڕازێنەتەوە.

چەرخ چەم، چون باز، لە هەر سەحەردا
چـــەرخ ئـــەدا وە نـــاز، وە «ئـاویەر» دا
شەماڵ ئـەو چـەرخ و چـاوە ئـەدا لێت
خوەت و «ئـاویەر»، ئـاگـر بـچێ تـێت
ئـــەو ئـــەوێ وە کـل سـوبحانی زایـەر
تـــۆئەوی وە گـــەرد سـفتەی سـەریایەر
هەر کارێ ئەکەی، شەماڵ بەڵ شەو وێ
تا سەوزەم وە ناز، سەرمەست خەو وێ
وێتئاسا، ئـەوسا، ئـاخێز کـەر نـەرمێ
یـــەخەی کـــەتانی، لادەر وە شـــەرمێ
پەشێو کـەر زوڵـفان، سـیای ڕێـحانیش
دەقـــی کـە لایـدە، لە ڕووی پـێشانیش
نـــەسیمت نـــەرمێ، بـــدەر لە گـــۆنای
سەدجار نمك جارێ، ماچ کەی دەس و پای
نەسیمت وە بـۆی، شـەوبۆی «ئـاویەر»
دۆ وە دەمـــــاخی، تـا بـێتە خـــەوەر
بـــێدەنگ بـــێژ، دڵـــبەر، دڵ کـەواویـە
لە تـاسەی چـــاوی، چـــاو بێخاویە
نـــــاسۆرەن[1] زامـــم، دەردم کـــاریـیە
خـــوێناو لە چـاوگەی، چـاوم جـاریـیە
ئـــــەر دڵت وە تـــیر، دڵـــبەر کـــاریـیە
«ئـــــەحمەد» نـــــەناڵی یـــادگاریـیە

---

١- هەربە سۆن.

## وەسفی «ئاویەر»ی «کوردوستان» بۆیەکێ لە دۆسان[1]

«کاکە ئەحمەد» گیان!، برای ئیمانی
من هام لە «کورسان»، با خاس بزانی
«کوردوسان» زیبای فەڕی نەماگە
هام فەردان یەك یەك، پیری لێی داگە
من و «مەحموودی» و «شێخ‌الاسلامی»
«وەفا»ی باوەفا، بەو خوەش‌کەلامی
نیشتین وە ماشین هەر چوار نەفەر
جێت خاڵی «ئەحمەد»، چووینە «ئاویەر»
«ئاویەر» چادر، غەم لە سەر لابەرد
تەم و غەم و هەم، وە جارێ با بەرد
خاستەر لە عەرووس، تازە ڕەسیدە
سورمەی دەلاڵەت، کێشا وە دیدە
وە بای بەهاری، کزەی ساز و سۆز
بە سەفا و سەبای، ڕیشەی جگەر دۆز
چون باش عەیاران، بە دڵ‌ڕوبایی
حازر بی بە دڵ، پەی پەزێرایی
لاڵە و هەلاڵەش، شکۆفا مەس مەس
هەریەك یەك دەستەی، گوڵ گرتن وە دەس

١- «میرزا ئەحمەد» ئەم شێعرە لە شاری سنەوە بۆ یەکێ لە دۆسانی دوور لە وەتەن نووساوە بە ناوی «ئەحمەد» کە سەفا و یادی «ئاویەر»ی بۆدەخاتەوە بیر.

وە یـــاد دووری، دۆس و ئـــازیزان
«ئاویەر» دەس کەرد، وە عـەنبەر ڕێـزان
چــەتر چــناران، چــەمەنِش واز کـەرد
ئەساسەی بسات، شادیمان سـاز کـەرد
ڕازنـــا گـــوڵان، بـــە دڵ وازمـــان
ئـامادە کـەرد گـرد، پـەی پـێشوازمـان
ئەوەڵ گوڵ «نەورۆز»، زیبا وست وە بەر
ڕەنگین بی چون ڕەنگ خاڵ ڕووی دڵبەر
دێـبای ئـەڵوانش پـۆشاو کـەرد وە بـەر
ئابی، ئـەزرەقی، ئـەحمەری و ئـەخزەر
«بـــەڕەزا» بـەو زوڵـف، تـوڕەی تـاتاوە
وەش وەش مـەشنیا، وەی لاو وەو لاوە
«خار» چون ئەگریجەی، کۆڕپە کناچان
تازەو تەڕ لە بـان، گـۆنای گـوڵ پـاچان
«بەنەفشە»ش لە تۆی، چەمەن وەردەن چیم
دێـــمای دێـــمشەن، وە شـنۆی نـەسیم
تـــەماشاش وەشـــەن، چـەنی «ئـاویەر»
مەدرەوشۆ چون خـاڵ، ژێـر لێـو دڵـبەر
«نەرگس» چون دیدەی نـزاکـەت داران
بە ناز نـاز مـەدیا چـون دیـدەی یـاران
نـــەسیم کـــاوان، عـــەتر وەرکـــەمەر
مـــوعەتەر کـــەردەن، قـولەی «ئـاویەر»
لاڵـــە و هـــەڵاڵە، وە نـاز ئـاخێز کـەرد
لەبـالەب لەبـان، لە مـەی لەبـڕێز کـەرد

ڕەونـــەق دان زەمـەق، لە سـەر دیـاران
مەدیا وە حەسرەت، هـەوارگـەی یـاران
ســۆسەن شکـۆفا، پـەی سـەیر کـاوان
چـەم و خـەمش بـی، چـەنی وەفـراوان
ڕێـــواس چـــون بـــاڵای بـەرز ئـازیزان
ئـــاخێز کـەرد بـە نـاز، خـێزا لە ڕێـزان
چنوور چەپەی گـوڵ، وێش دا بـە سـەردا
کـــێشا پـەردەی عـەتر، وە «ئـاویەر»دا
ئــەرچــی «ئـاویەر»، وێش مـوعەتەرەن
عـەترش لە عـەتر، گـوڵان وەش‌تـەرەن
گــوڵباغی لە بـــاغ، شکــۆفا بـــە شـاد
بـە نـاز بـوڵبوڵان، لە غـەم کـەرد ئـازاد
«ئـاویەر» ڕێـزا و خـێزا و ئـاخێز کـەرد
سەحراو دەر و دەشت، لە گوڵ لەبڕێز کەرد
وێش بـی بـە سـاقی، گـوڵ چـون پیاڵە
شەونم چـون قـەترەی، مـەی لە هـەڵاڵە
کشت تۆم و گوڵ، مەزرعە و شۆم[1] بی
یاد «مـەولەوی» و «مـەولانای» ڕۆم بـی
«مـــەولانا» وەو ســۆز، ساز و نـەیەوە
«خـــەیام» وە خــــەیاڵ، جـامو مـەیەوە
«نـــزامـــی» وە نـــەزم، ســاز و بـەزمەوە
«فیردەوسی» وە شـۆر، شـێعر ڕەزمـەوە

١- زەوی کێڵدراو، جووت لێ کراو.

«خاقانی» وە فەرد، دڵ پەزیرەوە
شاهان گشت جەم بین، وە وەزیرەوە
«حافز» لە مەنبەر، سوخەنڕانش بی
هەزار چون «خواجو» غەزەڵخوانش بی
«سەعدی» وە لەحن، سوخەنسەرایی
بەزم کەرد وە بەزم فەرپەخش شایی
«جامی» وە جلوەی، پڕ سەفا و سەیرش
«عەتتار» وە عەتر، «منطق الطیر»ش
«مانی»[1] جەو دەمدا، نەقاشی مەکەرد
هەزاران هەزار، فەڕاشی مەکەرد
«سوقرات» لە نەقش، دڵ بازی مەکەرد
دڵێ نە هەزار، دڵ ڕازی مەکەرد
«ئەفلاتوون» دەستوور بە ڕاستی مەدا
«ئەرەستوو» دەوای، دروستی مەدا
«لوقمان» ئیفتخار، پەردەداریش بی
مەشغوول دانە و دوڕنگاریش بی
«شەمس» وە بادەی، پڕ کەماڵ وێش
نەشە کەرد هەر یەك، وە خەیاڵ وێش
«مەولەوی» لە بەحر، عیرفان کوردی
دەس نیشان مەکەرد، گوڵان بە وردی
جوبەی عارفی و عیرفانی پۆشان
جام جام لە بادەی، مەعریفەت نۆشان

---

١- ناوی نەققاشی ناسراوکە لە زەمانی شاپووری یەکەم ژیاوە.

نەشە بین وە مەی، نازك خەیاڵی
واتن: جای «مەردۆخ» خاڵییەن خاڵی
تەختێ لە تەختەی، مەعریفەت ئەوشەو
بە دانش سازان، وە یادبوود ئەو
بە دانەی عرفان عارفانەوار
بە کەماڵ تەزئین کەردن چون بەهار
ئیرادە کەردن بوێنۆن نوورش
نورین بان وە نوور فەزای حزورش
تەلاوەت کەردن فرەی بێ غایەت
پەی ڕۆح «مەردۆخ»[1] هەر یەك چەند ئایەت
زهوور کەرد نورێ لە سەمت مەغریب
«کوردستان» یەکسان پۆشا وە تەرتیب
شەهرو خیابان کووچەو دەرودەشت
مەغازەو بازار گشت کەرد وە بەهەشت
شکۆفا بە شاد شکۆفەی باخان
پارچەی «ئاویەر» بی وە چراخان
ڕۆح پڕ فتووح مەردۆخ بی چون «تەیر»
تەیران کەردو بەزم یاران کەردش سەیر
فەڕ بەخشا وە بەزم نەوزهوورشان
بەرز بی لە بەرزان وەجدو شوورشان
مەست بین وە بادەی پڕ کەماڵ ئەو
شاد بین وە شێوەی شەم جەماڵ ئەو

---

١- مامۆستای ئاینیو عالمی پایە بەرزی کورد کە لە شاری «سنەدا» ژیاوە، «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم هۆندراوەی بە یادی ئەو بۆ یەکێ لە دۆسانی بە ناوی کاك «ئەحمەد» نوسیووە.

چون شەمع نیشت لە جەمع یاران بە شادی
وەنــدشان ســروود مــوبارەك بــادی
سـەڵەوات مـەدا مـەلەك چـەنی حـوور
مــەواتـن: سـەدەق نـورەن عـلیٰ نـوور
«ئاویەر» جە زەوق چون کۆی نوور لە دوور
مەگریا مەوات: ها بیم وە «کۆی تـوور»
«ئـەحمەد» تـا بـادەی ئـەجەڵ نـەنۆشۆ
چــــەم لە «ئـــاویەر» مــەبۆ نــەپۆشۆ



«میرزا ئەحمەد داواشی»
کوردستان ١٣٤٥ی هە تاوی

## بۆ کوردوستان[1]

ئــــوستاد دانــــای ســاحێب تــەدارەك
بــەهارت بــە خــەیر عــەیدت مـوبارەك
بەهار چون حوسنت، کەی خوش ڕەنگ و بۆن؟
چەمەن کەی چون تۆ، دارای سەوڵ نۆن؟
سەرشار و شاداب، شاد و بێغەم بای
مودام چون بەهار، سەبز و خورەم بای
بــــەهار حـــوسنت خـــەزانش نــەبۆ
«الله»! اڕەنگ زەردی ئـــەرزانش نـــەبۆ
ســـەرو قــامەتت لە خــەم خــەم نــەبۆ
شادی و شوور شەوق زەوقت کەم نەبۆ
نەبۆ گوڵ غونچەی، ڕەنگ و ڕووت بێ ڕەنگ
نــەوێنووت هــەرگیز، ئازیز وە دڵ تەنگ
بــەڵام ئــەی ئــاغەی، دانــای موعتەبەر
قــەسەمت مــەدەم وە خــودای ئـەکبەر
فەرامۆش نەبۆ، هـەر شام هـەر سەحەر
وە یــاد بــــەندەت، بــدیە «ئــاویەر»
گــوڵاڵان ڕەنگ ڕەنگ، ئــاویزان کەردەن
ئـــارەزووی بــاڵای، ئــازیزان کەردەن
ســەبزەن ســفیدن، قــرمزەن چــون گــوڵ
مــــاوەرۆ وە دەنگ، بـــولبولەکەی دڵ

---

١- ئەم هۆنراوە نامەیەکە بۆیەکێ لەدۆستانی نووسیوە کە لە شاری سنەدا ژیاوە.

هـا وەخـتەن ڕۆحـم، وە بـولبولش بـۆ
سـەرقولەش پـەی سـەیر، وە مـەنزڵش بـۆ
بـدیۆ بـوێنۆش، وە دەشت و دەردا
شـایەد ئـازیزش، بـە ڕاگـوزەردا
فـەزای «ئـاویەر»، سـەیر سـەفای دەشت
نـیشان مـەدەرۆ، گـۆشەی جـە بـەهەشت
سـەرشار بـڕوانـی، بـە ڕووی شارەوە
بـەو شـار زیـبای، پـڕنگارەوە
وێـرانـەکـەی دڵ، بـە ڕووی سـەفاوە
ئـاوا کـەی بـە ئـاو، «کـانیشەفا»وە
سـەرچشـمەی «خـزر»ش، یـادگاری‌یەن
تـەماشای شـەفای، دەردکـاری‌یەن
«مـاماتگە»ش تـاك، تـەرزش شـیرینەن
چون سەحرای خوەتەن، بۆش عـەنبەرینەن
«سەرتەخت» وێنەی تەخت مەعرووفی جەمشید
نـەقاشی کـریان وە هـەزار ئـومید
«زەفـەریە» زاکـر، ئسـتغاسەشەن
«عـەزامیە» پـەی دین، دڵبەر تـاسەشەن
چـەمەڕان ئـازیز، تـەدارەك کـەرۆ
«مـوبارەك ئـاباد»، مـوبارەك کـەرۆ
«ئـامانیە» گـوڵان، پـەی ئـامان ئـەو
ئـامادە کـەردەن، پـەی دامـان ئـەو
نـە ڕووی دامـانش، بە وێـنەی ئـەسرین
بـڕێزۆ گـوڵان، دەس‌دەس‌و چـین چـین

سەیر «سەر ئاسیاو»، سایەو سەهەندش
هەر کەس مەوێنۆش، مەبۆ پابەندش
«مەسناو»و «مەعرووف» تا وە «خانەپاڵ»
مەحزوونی دارۆ پەرێ ئەهل حاڵ
«تەکیە» و «چەمەن» جای، بێ‌نەزیرشەن
فەرش کەردەن چەمەن، مونتەزیرشەن
«خەسرئاوا» ئاوا ئاوای نازشەن
«وێڵە وێڵە» گەل بە دڵ وازشەن
«باخەنەمامە»، مەشهوور عامە
کەی نەمامش هەن، چون ئەو نەمامە
شێوەی شیرینش، بەوتەور نیشان دا
ئەر نیشان دەرۆ، وە «گریاشان» دا
«هەر زەڕی» جەنوور، وێش ئەفشان کەرۆ
سەنگش گشت بە لەعل، «بەدەخشان» کەرۆ
شێوەی شیرینش، بەو تەور بەیان دا
بەیان دا بە ڕووی، «دەرەبەیان»دا
گاهێ نگاهێ، بە «شێخان» کەرۆ
«قەڵاچوارلان»، چراخان کەرۆ
«جەورئاوا» مەگەر، جاگەی جەبیارەن؟
یا قەدیم مەاوای گرۆی زۆرکارەن
بە دین دیدەش، ئەر ڕەوشەن کەرۆ
بەلوتف و کەرەم، وەگوڵشەن کەرۆ
بەڵام ئەی ئاغەی، دانای گرامی
نایافت نایاب، نادرەی نامی

«لوقــــمان» لایـــق، «ســـەحبان» ســـانی
کـــان مــــەعریفەت، کـــەنز مـــەعانی
ســـەنای «ئـــاویەر»، کـــەی مـــەبۆ تـــەمام
هەی خوەم وە سەرگەرد، خاك و خوەڵش بام
درختش گشت عـوود، خـاکش عـەنبەرەن
ســـەنگش مـــوتابق، لەعـــل و گـــەوهەرەن
ئـــاو ســـەرچـــەشمەش بـەر مـەیۆ وە بـەر
وەش تەرەن لە ئاو سەرچـەشمەی کـەوسەر
ســـــەراوش یـــەکـــێ، نـــیەن هـــەزارەن
هـــەر یـــەکـــێ شـــەفای، هـــەزار ئـازارەن
کـاووکەش و کـوٚش نـوور پـیا وەشـتەن
گـــوڵانش یـەك یـەك نـۆ سـوەیل ڕەشـتەن
چـــــەمەن بـــــەنەفشە، بـــاغش پـــڕگوڵەن
دایـــم پـــــڕ لە ئـــاه، نـــاڵەی بـــولبوڵەن
سەحراش هەر ئـەوەن، پـڕزەرع و کشـتەن
چـــمان پـەی بـەهەشت، خـودا سـرشتەن
ئـــاو ســەرچـەشمەش، بـەر مـەیۆ وە بـەر
وەش تەرەن لە ئاو، سەرچەشمەی کـەوسەر
«ئـــاویەر» هـەر دوو، وا گـەرتەن جـلووس
یەکێ چون داماد، یـەکـێ نـەو عـەرووس
ئەو بـادەی هـەستیو، سـەرمەستی نـۆشان
ئـــێد دێـــبای حـەریر، تـازەی تەڕ پـۆشان
مـــەجلس ئارای بـەزم، خـوسووسی شانەن
هـــــەرئان مـــەواچـــی، عـــەرووسی شانەن

سەوت سەدای کەوك، سەرشاخەی شاخان
چریکەی چێهچەیٚ، بولبولٚ لە باخان

بەرزەن نالەشان، جەشەوق شادی
مەوانان تەسنیف، موبارەك بادی

نە هەر سەراویٚ، سۆزەی سازیٚ وەن
دەنگ نازارو، عیشوە و نازیٚ وەن

شارو خەیابان، کووچە و دەشت و دەر
موعەتتەر بیەن، جە بۆی «ئاویەر»

نە شکۆی «ئاویەر»، سەفای سەراوان
شنۆی سەرکاوان، شاخەی شەتاوان

نەرگس و سۆسەن، وەنەوشەی پەل دێز
شەوبۆو هەلاڵەی، ئەسر حەسرەت ڕێز

شکۆفەی شاخەی، خونچەی نەمامان
مەڕێزۆ وە بۆی، نەسیم وە دامان

فەرش کەردەن دامان، بە دێبای ڕەنگین
خاسترلە دێبای ڕۆم و هندو چین

ڕەنگینتر لە ڕووی، ڕەنگ و ڕوی دڵبەر
بۆ وەشتەر لە بۆی، بۆی گیسووی دڵبەر

تۆی دەرەش[1] چون لۆی، یەخەی ئازیزان
بازەن وەکوێری، دیدەی پایزان

سیما تەڕ لە تەرز، تازە نەوڕەسان
گولانش مەدۆ، شێوەی چاومەسان

---

١- دۆڵ، شیو.

شەوبۆش بەشادی، سەر کێشان وە بەر
خەم بەستەن چون چین، تای چەتر دڵبەر
چنوورش بەردەن، چەم وە کەمەردا
عەتر ئەفشانیشەن، وە دەشت و دەردا
نەشکوفتەی خونچەی، سۆسەن دان جلووس
شیرین چون بوتەی، مەمکەی نەوعەرووس
یا «خوا»! «ئاویەر»، بوڵەندپایە بۆ
سەربەرزو سەبزو ساحێب سایە بۆ
چەتر چناران، چەمەنش واز بۆ
چەنی نازاران، با عیشوەو ناز بۆ
سەر تا پاش وە نوور، «خودا» ڕەشتە بۆ
وەشت نوور وە بان، قولەش وەشتە بۆ
دوورنمای دیدەی، «کوردستان» گشتەن
تەفریگای زومرەی، حووری سرشتەن
نیەن نمەبۆ بەوتەور کۆهسارێ
لە پادامەنەش واقع بۆ شارێ
مەنزەری زیبای، زینەتبەخش ئەو
سەرمایەی نیشاط، پڕ لە نەخش ئەو
مەکێشۆ شۆخان، وە بێ تەحاشا
وە پادامەنەی، وێش پەی تەماشا
ئیسە ئەو شیرین شەکەرین ڕازە
ئەو باز شەش‌دانگ بوڵەند پەروازە
ئەو هومای گوڵشەن تاووس باغە
ئەو یاخی سڵخۆی بوڵەند دەماغە

ئـەو زڵـف عـەنبەرین مشکـین کـلافە
ئەو سیمورغ خـوان حـەفت قـوڵەی قـافە
خـەیاڵیو خـاوێر خـاوبەردەی نـازەن
پـەنجەرەی مـەنزوور ئارەزووش وازەن
بـۆ شـنۆی شـەوبای شـەوبۆی «ئـاویەر»
هەر شـەو پـەنجەرەش وازەن تـا سـەحەر
بـــە خــەیاڵ ئــێد تــا ئـوردیبەهەشت
بـەیۆ بـوەرۆ تـەشریف وە گـوڵگـەشت
عـادەتـان ئـێدەن هـەر نـەو بـەهاران
دڵـــبەران وە چـــۆڵ فـرقەی دڵـداران
ســـەروقامەتان سـەوزەو دیـدە مـەس
بگـــێران ئـەسپاب شــادیشان بـە دەس
هۆردەران چون گول خەیمە نە رووی دەشت
سەحرای «کوردستان» کەران وە بەهەشت
بێ خـەم نـە خـەڵوەتخانەی شـۆ وە بەر
غــەم بـدۆ وە بــاد، لە پــای «ئــاویەر»
یــاخوا ئــازیزم مـودام هـەر وەش بـۆ
تـا دڵ هــەر پـەرێش پـڕ لە ئـاتەش بۆ
هــەرساڵ وە خـــوەشی، لە پـای «ئـاویەر»
وە ســـڵامەتی، ســاڵ بـوات وە سـەر
«ئــەحمەد» تــا نـەبۆ لە گیان هـەراسان
شـەرتە گـیان بـدۆ نـە ڕای «کـوردسان»

★ ★ ★

## ڕوانسەر[1] و گەرمەخانی

کاکە بزانی، کاکە بزانی
حاڵو ئەحواڵم ئەگەر بزانی
نە شەو خاومەن نە ڕۆ زنگانی
قیبلەی دڵ بیەن، وە گەرمەخانی
وەشمن چون «ئەرمەن»، ماوای «شیرینەن»
پەی کوردەواری وێنەی نگینەن
درەختش گشت عوود، خاکش عەنبەرەن
سەنگش موتابق دوڕو «گەوهەرەن»
ئاو سەرچەشمەش، بەرمەیۆ وە بەر
وەشتەرمن لە ئاو سەرچەشمەی «کەوسەر»
سەراوش یەکێ، نیەن هەزارەن
هەر چوار فەسڵش، ماچی بەهارەن
کاو و کەش و کۆش، نوور پیاوەشتەن
گوڵانش یەك یەك، نۆ سوەیل ڕەشتەن
چەمەنەن، باغەن، بەنفشەن، گوڵەن
دایم پڕ لە ئاه، ناڵەی بولبولەن
سەحراش هەر ئەوەن، پر زەرع و کشتەن
چمان پەی بەهەشت، خودا سرشتەن

١- «میرزا ئەحمەد» ئەم شێعرەی لە وەسفی «ڕوانسەر» زادگای خۆیا داناوە ڕوانسەر دووبەشە کە بەشێکی بە ناوی «گەرمەخانی» مەشهوورە.

ئیسه وه «پاوه»ی، جـافان مـهشهوورەن
وەشتەر لە «پاوە»، پـرپەری و حـوورەن

پـارێزگا و پـایتەخت، بـێشەی شـێرانـه
مـاوای شـەور جـەنگ[1]، دڵ دلێـرانـه

«ڕوانسەر» یەکسـەر، لە خـەیر لەبـرێزە
خـەیر بـاران بـووگە، ڕێـزه وه ڕێـزه

پـاسەم شـنەفتەن، لە سـاحێبهۆشان
بـێشك شـارێوەن، چـون سیاپۆشان

هەر کـەسێ لە ئـاو چـەشمەش بنۆشۆ
لابـدەن مـەشیۆ، سـیا بـپۆشۆ

ئەی کاکە! ساتۆیچ، ئەر ساحێب هۆشی
مەشی چون «ئـەحمەد»، سیا مەپۆشی



١- مەبەست جەنگ لەگەل ڕەزاشایە کە لە شێعری جەنگی «هەڵاڵەزەرد»دا باسی لێ کراوە.

## داستانی عەنتەرو مەیموون

شـــنەفتم لە یـــەك، دیـــوانـــیٚ ســـەلیم
داســـتانیٚ شـــیرین، عـەجیب و قـەدیم
ئـەڵبەت لە عـەسر، حـەجەر و شـەجەر
فەرق نەوی لە بەین، حـەیوان و بـەشەر
ئـەگـــەر زمستان، ئـەگـەر بـەهار بـی
وەك هەم ماواشـان، لە بـێشەو غـار بـی
لەو حـــەواڵـــی هـــند، بـێشەیە خـەتەر
جاگیر بـی لەو جـا، هـەموو گـیانلەبەر
لە شـێرو لە بـەور، لە گـورگ و عـەنتەر
مـەعرووف وە بـێشەی، جـن‌وجانەوەر
فەقەت زندەگی، ئـادەمی سـەخت بـی
ســـایەو پـــەناشان، بـەرگ درەخت بـی
هەرئان مەیلشان، بـە داواو جـەنگ بـی
حەریەی ئادەمی، چوماغ و سـەنگ بـی
مـەعلووم بـی بـا هـەم، زدونـەقیز بـین
هەمیشە بـا هـەم، جـەنگ و سـتیز بـین
هەر یەك وە نەوعیٚ، زندەگـی مـەکـەرد
بەعزیٚ بۆ بەعزیٚ، بـەندەگـی مـەکـەرد
هەرگۆشە موختەس، یەك جانەوەر بـی
هامسایەی بەشەر، فـەقەت عـەنتەر بـی

ئـەگـەر چـە بـا هـەم، تـفاقشان نـەوی
بازهەم وە هـەر حـاڵ، نـفاقشان نـەوی
عەنتەر پەی بەشەر، بەندەگـی مـەکـەرد
هەریەك وە نەوعێ، زندەگـی مـەکـەرد
مـەردیان مـەشیا، هـەر ڕۆ پـەی شکـار
ژنـان مـاوەردن، وە کـۆڵ مـیوەی‌دار
ئـەڵبەت بـۆ شکـار، یـەند بـی فـامشان
جە ڕاگـەی شکـار، چـاە بـی دامشـان
لە چـەندین لاوە، مـەکـەندن گـاگـۆڕ
وا شکـارشان، مـاوەردن وە تـۆڕ
ئـەسڵ داسـتان، ئـینە نـەقڵش‌بی
مـادە مـەیموونێ، وەزع حـەمڵش‌بی
هـەرتا فـارغ بـی لە غـەم و خـەتەر
لە دەورش جـەم بـین، ئـەقوام عـەنتەر
خـودا دوو ئـەولاد، وە ئـەو دادە بـی
ئەڵبەت یـەکێ نـەڕ، یـەکێ مـادە بـی
فارغ بی مەیموون، ئەوشەو وە هەر حاڵ
جـەژن زایـمان، فـەوری بـی بـەتاڵ
عـەنتەر و مـەیموون، بـێ قـۆڵە و بـۆڵە
بـێ خـەیاڵ خـەفتن، لە دەور ڕۆڵـە
قـەزا نـازڵ بـی، گـورگ گـورسنە
دوو بـەچکەی عـەنتەر، دی وە بـرهنە
فەوری قەپانی، هـەر دوو وە حـوڵقووم
بردی خواردیانی، لە جـای نـامەعلووم

عەنتەرو مەیموون، هەر دوو وە سەرشار
سەحەر بەر لە خوەر، لە خەو بین بێدار
عەنتەر و مەیموون، بەستن تۆشەشان
کەفتنە جستووجۆی، جگەرگۆشەشان
عەنتەر و مەیموون، لە غەمان کەیل بین
هەردوو لە داخا، وەیلان وەیل بین
هەردە وە هەردە، کۆو کاو کەمەر
ڕاشان کەفت وە یەك، مەخفیگای بەشەر
لەو جا دوو نەوزاد، وە تاکو تەنیا
تازە وە تازە، هاتوونە دنیا
پاك و پاکیزە، دوو دانەی دوڕ بی
یەکێکیان کەنیشك، یەکێکیان کوڕ بی
هەڵیانگرد هەردوو، بردیان وە مەنزڵ
مراد حاسڵ بی، وە ئارەزۆی دڵ
عەنتەرو مەیموون، وە خاتر جەمی
خوەیان دا لە دەور، بەچکەی ئادەمی
بە شادی و سروور، بێ بۆڵە و قۆڵە
گردیانە بەغەڵ ڕۆڵە لەو چۆڵە
پەی زیبا و زینەت، نەوزادان کۆشان
سەر تا پا وە گوڵ، باڵاشان پۆشان
هەر ڕۆ تا وە شەو، هەرشەو تا بەیان
مەوازیبان بوون، وەك ڕۆڵەی خوەیان
وە کوڵ ئەیانورد، بۆ ئەملا و ئەولا
تا واگەورە بوون، کەفتنە سەرپا

ئـــەقوام عـــەنتەر، لە ئـــەترافـــیان
دەس وە دەس هـــاتن، بـــۆ تـــەوافـــیان
لە گـــیا و لە گـــوڵ، لە بـــەرگ درەخت
بۆیان ئەهاورد، لە وەخت و بێ وەخت
ئـــەیانوت ئـــێوە، تـــۆتان گـــۆڕاوە
ئـــیتر وە بـــەچکەی، مـــەیموون نـــەماوە
ئـــێمەیچ حـــازرین، بـــەندەگـــی بکـــەین
لە دەور ئـــــێوە، زنـــــدەگـــی بکـــەین
شـــایەد بگـــۆڕێ، ئـــێمەیچ ئـــەسڵمان
بـــوێت وە بـــەشەر، نـــەوە و نـــەسڵمان
براو خوەیشك خـــاس، شکـــۆفا گـــوڵیان
تـــا ئـــاگـــر عـــەشق، بـــەر بـــوو وە دڵـــیان
مـــیوەی بـــاغ عـــەشق، حـــەقیقی وەردن
بـــە دڵ ئـــارەزوی، عـــەروسی کـــەردن
وەخـــتێ هـــەڵ گـــرپا، ئـــاگـــر هـــەوەسیان
بـــە شـــادی کـــردیان، دەس وە دەســـیان
پـــــارە بـــی پـــەردەی، ئـــابڕوویيشان
ئـــەنجام دان عـــەمەڵ، زنـــاشوویيشان
وە خەیاڵ خوەیان، نەسڵ مەیموون بین
چون مەیموون وە ناو، بێشە مەسکوون بین
بـــە ڕەســـم عـــادەت، زاوو زوو کـــەردن
زکـــێ دوو مـــناڵ، هـــەرساڵ مـــاوەردن
چـــون بـــەشەر مـــەویا، وزع حـــەملشان
تـــا بـــی وە بـــاعیس، تـــەولید نـــەسڵشان

له بـێشه ئـادەم، له عـەنتەر بێش بـین
ئەر چه وه خەیال، ئەقوام و خوێش بین
وەلیٚ هـەر کـامیان، فـرسەت مـاوەردن
ئـەزیەت بـەچکەی، یـەکتر مـەکـەردن
له تـەنگی جـێگه و مـەسکەن و مـاوا
عـــەنتەرو بـــەشەر، کـــردیانه داوا
له دوای چـــەن ســـاڵیٚ، زدونـەقیزی
عاقبەت مـونجەڕ، بـی وه خـوونڕیزی
له مرخەی مەیموون، له پرخەی عەنتەر
له قـاڵ و گـاڵەی، قـاوو قـووی بـەشەر
مەیموون وه گاز و عـەنتەر وه چـەنگاڵ
گـــەوره وه گـــەوره مـــناڵ وه مـــناڵ
عـەنتەر وه سـەنگ و بـەشەر وه کـوتەك
تا مودەی چەن ساڵ، کەفتنه گـیان یـەك
عـاقبەت عـەنتەر، بـێزار له جـەنگ بـی
له دەست بەشەر، خولقیان وه تەنگ بـی
وه چووب و چـماخ، وه تـەور و تـێشه
بـەشەر عـەنتەری، دەرکـرد له بـێشه
عەنتەر و مەیموون، گشت فـەراری بـین
هـەر یـەك وه لایـە، مـتەواری بـین

★ ★ ★

## شیم[1] وە «توانکەش»[2]

شیم وە «توانکەش»، شیم وە «توانکەش»
یەك ڕۆ ڕاگەم کەفت، شیم وە توانکەش
دیم کە نازارێ، شۆخ دیدە ڕەش
زوڵف دەستەی شموبۆ، ئاما وە سەرخوەش
قومری ڕەفتارێ، لەنجە و لارە خوەش
نگاشەن چون باز، شکاری سەرکەش
گوڵەنگان لە سەقف، سەروێن کەردەن پەخش
کەردەن وە سەیوان، پێشانیش پەی نەخش
میل سوهەنای، نوقرەکۆی کلچەش
کەردەن بە داخڵ، ئەبیەزی و حەبەش
هەنگامەی بسات، بەزم سوورێ[3] بی
سوور نەوزوهوور، بێ قوسوورێ بی
ڕاستە مەواچووم، وە دەم سوورێ بی
ئەما یەك بەهەشت، پڕ جە حوورێ بی
ئازیز جات خاڵی، ئەو ئازادی یە
ئەو بەزم و تەرەب، شەوق و شادی یە
لە تەقەی دەهۆڵ، لە چریکەی ساز
دەنگ زیل بەم، سەدای هەی شاواز

---

١- چووم.
٢-گوندێکە لە نزیکی شاری کامیاران.
٣- زەماوەن.

لفکەی دەسماڵان، گرپەی پووشین بی
زڕەی سەر ئاوێز، چرپەی پووتین بی
مەداشان وە هەم، لەرزانە و گوڵەنگ
زوڵف و زنج و خاڵ، فەرزانە وە جەنگ
نازاران مەخەند، وە ڕووی نازەوە
عاشقان مەکەند، لەب وە گازەوە
گا مەبیان پەیوەست، گا گا ئەوڕیان
چون قەتارەی زەنگ، وە هەم ئەزڕیان
هەر کەس با کەسێ، بەین بەستش بی
جەو دەم بێ‌پەروا، دەس وە دەستش بی
خاڵان لە شەفاف، شەمیم ئەفزای زوڵف
یەخە و سینە و مەم، نارەزا وە قوڵف
هەی لە نزاکەت، لاو شەدەلاران
وەی لە ئیشارەی، دیدە خوماران
حەریفان وەو زام، زەدەی عەشقەوە
دەست گیرۆدەی دام، پا وە مەشقەوە
ڕەقیبان مەدان، گیان وە داخەوە
گوڵ‌ڕوخان مەدیان، وەو پەرداخەوە[1]
سەروێن وەو تورەی خوەش ڕەونەقەوە
جەمین وەو گرەی گوڵ‌تەبەقەوە
چرکەی بەند زەنجیر ورشەی لاگیرە
برقەی ئەشرەفی و خشەی نیم‌لیرە

---

١- شێوە.

خشپەی پای شەوبەند، زرنگەی لاسەرە
زرەی مۆرەوگۆ، خرنگەی کەمەرە
گاز قولاوان، پایەی گێل گێلە
نێش ئەقرەوان، سایەی پاپوێلە
شەوق پێشانی، بریقەی کڵاوزەڕ
قریقەی نازاران، تریقەی لوولووی تەڕ
دیدە غەزاڵان، نەوبەر نەمامان
قامەت شمشاڵان، عەرعەر ئەنامان
وێشان چون ماهێ، کەردەبین درووس
هەر یەك وەك شاهێ، گەرتەبین جلووس
هەر یەك وە یەك ڕەنگ، مەدرۆشان لە دوور
چون حوور بەزمشان پڕ مەکەرد جە نوور
بازووبەند جە لاڵ، حەمایەڵ جە دوڕ
ورشەی مایوخاڵ، جەرگ جایەڵ بوڕ
موشك مێخەكوەن، بۆی عەبیر ساف
لەرەی مەحبووبان، شنۆی حەریرباف
نازك نەوهاڵان، چاومەست و کەژەڵ
موستەغریق لە ناو ئەتڵەس و مەغمەڵ
ئەوشەو جە بەیزای، قەمەرپەرداخان
بێزیا فەزای، یەکسەر چراخان
ڕەقیبان ماتڵ، وە نزارەوە
حەریفان عاقڵ، وە ئیشارەوە
لەنجەی سەرپەنجەی، نازەنین نازان
نساز نسازاران، جەمین پەردازان

شـۆخان وە گـریشمەی بـەزم عـیشقبازی
مــەشاقتر لە نــەزم، مــەشق ســەربازی
نەك وەك مەعرەكـەی[١] شـەماڵ و زلان[٢]
جــەنگەڕا لە ســەر، خــاڵ كــەڵملان
تـا شـەماڵ وە خـاڵ، «فـانۆز» مـەغسەڵدا
زلان گـومی ئـەكـرد لە تـۆز و خـوەڵدا
تــا شــەماڵ مـەكـەرد گـەرد خـاڵش پـاك
پــڕ مــەكــەرد زلان جــەماڵش وە خــاك
شــەماڵ گـیسوان مــەپیچا پــەی وێش
زلان گــردشان مــەگـێجا پــەی وێش
جــە غــەرەز مــەكــەند ڕووبـەڕووشەدا
پــل و پــووش مــەشەند وە گـیسووشەدا
شــەماڵ وە حــەسرەت تــەواســاشەوە
زلان وە فـــرسەت مـــەبۆساشەوە
ئــاخر ئـەم سـەروو پــەڵك سـەراوی
باعیس جـەدەڵ «ئـەڵك»[٣] و «مـاراوی»[٤]
پــێچ وە گــیسوان شــۆرئەنگێزدا
چــون شــیرین جــە قـار تـۆر پـەروێزدا
خــێزا و دڵ وە قــین پــڕ خشـم و ئـاڵۆز
لە تـاوشت گـەرد خـەوش و خـاك و تـۆز
بە توندی چـون بـاز چـەرخ نـەخچیردۆز
بە شـەوق تـاری شـەب تـابندە چـون ڕۆژ

١- جەنگ.
٢- ناوی دوو دانە بایە.
٣- ناوی دوگوندە سەربەشاری «كامیاران».
٤- پیشین.

بـەو جـوقەی سـەروێن پـای دەسـماڵەوە
بـەو نـەقش و نگـار خـەت و خـاڵەوە
بـەو کـڵافەی زلـف، کـرژ کـاڵەوە
تـاڵ تـاڵ وە شـنۆی، بـای شـەماڵەوە
چـون خـوەر ئـاوا بـی، شـی وە ماڵەوە
مـەردم مـەن وەی خـەم، وەی خـەیاڵەوە
مـەردمان مـەندن، خـاتر پـەرێشان
مەکـەردن زاری، هـەرکەس پـەی وێشـان
بـازی نـاڕازی، بـی وە سـەرسەری
سـاز مـەژەند مـەقام، بـەزم چـەمەری
هەرکس دو چەم داشت کەردە بی وە هەشت
پەی سەیر «فانووس»، کەی بەیۆ وە دەشت
ئـەما قـیبلەکـەم مـات ئـاڵۆز بـی
فانووزی ڕوخـار، هـەروێش «فـانۆز» بـی
پـەرگنە و پـەشێو خـەیلێ دڵگـیر بـی
مـەلول مـاتەم چـمان ئـەسیر بـی
دو پـەنجەش پـەیوەند دوو زرانـیش بـی
یـەعنێ نـیشانەی دڵ گـرانـیش بـی
نگای وە حەسرەت، دوور وە دوورش بـی
دڵ وەی ئـارەزووی، بـەزم سـوورش بـی
خوون خشم قەست، وە چـەم ڕژیـاگ بـی
زلف و زنـج و خـاڵ، گشت پـلمژیاگ بـی
چون کەوك لە چەنگاڵ، شاباز بەدحاڵ بـی
غـەمین و غـەمبار، ئـاشفتە حـاڵ بـی

هەر سوح تا وە زۆر خەیلێ غەمناك بی
وەلی بەعدە زۆر یەك جار بێباك بی
وەختێ خێزیا، ڕەوێڵەی ڕەم بی
بێپەروا، لاقەید، بێ خۆفو غەم بی
دیم کە بەر ئاما دوڕ جە سەدەف بی
و عەزم بازی دەستار نەکەف بی
تەك دا وە تەکیەی، هامسەران وێش
بی وە ڕەوێڵەی، قەتارەی ڕەمکێش
گا وە عیشوەی ناز، گا وە سەرپەنجە
گا وە لارەی نەرم، گاگا وە لەنجە
گا چەتر تاوس، نە سەر مەپۆشا
گاه عەرەق خوەی، چون مەی مەنۆشا
چون کەوك وە خالان، وێش مەدا تەرتیب
گا پا لە بازی، گا چەم لە ڕەقیب
گا پێچ چون ئەفعی، مەدا وە گیسووش
گا جەقین مەوست، چەند چین وە ئەبرووش
هەر کەسێ مەدیاش، لەو مەجاڵەدا[1]
لەو شادی و نیشات، لەو جەلاڵەدا
چون «ئەحمەد» مەشوست، دەس لە گیان شیرین
تەرسایی مەسەند، «سەنعانی» لێش دین

---

١-کات.

## بیرەوەری یەك ڕۆژ سێزدە بە دەرلە تاقۆسانی «کرماشان»[١]

ئــازیز خــاڵی بــی، ئــازیز خــاڵی بــی
ئارۆ جـه بـۆستان، جـاگـەت خـاڵی بـی
چون قەقنەس جەسەم کۆی زوخاڵی بـی
«بـاللە» جـای خـاڵیت، پـەرێم تـاڵی بـی
تــــیپ غــــەزالان کــــەڵڕەمان کــوو
جەم بین گشت پەی من بێفایدەو بێتوو
«تاقۆسان» جه فـەیز، فـەزای «کـرماشان»
ڕوخشان بی جه شەوق، شێوەی مەهوەشان
عــــاشقان وه عــــیشق، نــــەمامانەوه
مــــــەعشوقانشان، گشت فــــامانەوه
حەریف مەکەردش، حەزەر جـه ڕەقـیب
ڕەقــیب ڕەغــبەتش، نـمەوی، تـەرغیب
عــارف و عــرفان، نــیشتەبین وه هــەم
وه کـــــنارەوه، ئــێد مــەدیان وه چــەم
هەر شەوق گــوڵ بــی، زەوق بـولبوڵ بـی
عاشق شۆر عەشق، مەعشووق جه دڵ بی
سەدای سووزەی سەوت، نەغمەی ئاواز بی
تەقەی تریقەی دەوڵ، چریکەی ســاز بـی

---

١- هۆنەر ئەم هۆنراوەی لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵیداگوتووە.

لۆی یەخەی کەتان سەرخەتان واز بی
بازار عیشوە و کریشمە و ناز بی
چرپە و ترپەی کەوش، پای بازی باز بی
دڵدار بە دڵبەر، وێش سەرئەفراز بی
بیا بیا بی، بدەو بدەو بی
عەرووسی «شیرین» شادی «خوسرەو» بی
پاشەو پاشەو بی، بشین بشین بی
«خوسرەو» نە مەجلس، مەست «شیرین» بی
شەقەی پەنجەو دەس، خوەش مەزاقی بی
بسرێزای بڕێز، بادەو ساقی بی
شتوور[1] «شیرین»، شین «فەرهاد» بی
مەرگ «خەسرەو» بی، «شێرۆ» ناشاد بی
جادار و بێ‌جا، جایز وە قڕبی
ڕەواج بازاڕ، فوکول و فڕ بی
خەز و پاردسوو، ژلیت و ژاکەت
پۆشا بین شۆخان، پەری نزاکەت
سەر پەتی سێنگ تاق، باڵ لوخت و عوریان
جەرگ جوانان مەکەرد وە بریان
دەس‌بەند و تەسمە و بلووز و دامەن
زرە و زامەنەی، حەڵقەی کەمەربەن
ئیفادە وە بار، غەمزە وە خەرمەن
زلان مەشەندش، شەماڵ مەکەرد شەن

---

١-گریانی بێ حەد.

ئـیزهار مـووبەت، مـودبرماسان[١] بـی
بـــیا و بـــفرما و بـــدە و بســـان بـــی
بـەدرەقەی تـەفریح، سـیزدەی سـاڵ نـۆ
وەش بین گشت پەی من، بێفایەو بـێ‌تۆ
سەدای ساز و زەرب، تەموورەی تار بـی
بـنۆشای بـنۆش، بـادەی گـوڵنار بـی
عاشقان سەرخوەش، مەعشووقان سەرمەس
دەم لە نســاو دەم، دەس لە نســاو دەس
نگا و خەندە و ناز، نـەزم و ئـەخلاق بـی
بـــازاڕ شـــادی و بـــەزم و مـــەزاق بـــی
عاشقان وە عەشق مەعشووق موشتاق بی
ســەیر ســەراو بـی، تـماشای تـاق بـی
مــەودای نـیم نگـای، نـاز وە بـێ دریـغ
مەنیشت لە ڕیشەی، جەرگ و دڵ چون تێغ
قــەبزەی قـەدارەی شــەمشیر ئـەبروو
شەق مەکەرد ئەگەر، مـەشەندش وەکـوو
ژەهرئالووی خەدەنگ، موژەی دیدە مەس
موشرف وە مەوت بی، مەپێکان هەرکەس
حــەربەی نــزاکــەت، گـریشمەو لارە
هەرکەسێ مـەگـەرد، مـەکـەرد دووپـارە
وە نیم ئیشارەی، نەیزەی سەر ئەنگوشت
مەویەرد جە سینە، بەرمەشیا جە پـوشت

١ - شۆخان.

موحبەت وە مەرام، ناز بێ‌قیمەت بی
زیب ئارای زیبای، زەوق و زینەت بی
«گەبر» و «یەهوود» و «تەرسا» و «ئەرمەنی»
بەستە بین وە هەم، خەیمەی چەمەنی
حەریفان بێ‌غەم، ڕەقیب داغ لە دڵ
بەر ئامان وە هەم، وێنەی خار و گوڵ
یاخی سڵخۆی[1] ڕەم، ڕەوێڵەی ڕەندان
بێباك تاك جە تۆی، چاك چەمەنان
ترفەی تۆف تاف، تریفەی ئاو بی
شنۆی شاوەی كۆ، كەمەر و كاو بی
چفەی ڕاز ناز، سەرگووشی گووش بی
هۆشداران جە شەوق، شۆخان بێ‌هووش بی
چەمەن ئەتڵەس‌پۆش، سەحرا موعەتتەر
زەمین لالەگوون، جە شێوەی دڵبەر
چەن سەید ناغافڵ، گیرۆدەی دام بی
چەن سەییاد سەرسام، چەن وەحشی ڕام بی
دڵبەر ماورد زام، دڵداران وە سۆ
وەش بین گشت پەی من، بێ‌فایە و بێ تۆ
ئاخ و وای و ئۆف، مەرگ و خودا داد
فدایەت جانم، قوربانەم زیاد
نەیا ئولاغێ، دورشكە بەرەو
ئاغایان كنار، خانم پیادەڕەو

---

١- مەبەست ئاهوە كە هەمووكات سڵ دەكا.

گڕەی دووچەرخە و فڕەی مووتر بی
ئوتر بە فەرمان، ئەمر شووفر بی
بە مادە تاریخ، ئەو ڕۆ بەهەشت بی
هەزار و سێسەد پەنجا و هەشت[1] بی
دووشەممە و تەفریح، سیزدەی ساڵ نۆ
مەرگش واجب بی، «ئەحمەد» وە بێ تۆ



## شکار وە بەهار

ئاغەی عەزیزم، تفەنگچی تەڕدەس
شکارچی چون تۆ، لە دنیا هیچکەس
نەویەن نەمەبۆ، تا بە ڕۆی مەردەن
گۆی میر شکاریت، لە دنیا بەردەن
دەرو دیوارت، وە پۆست شکار
گوڵکاریت کەردەن، بە نەقش و نگار
پەڕ تا پەڕ وە پەڕ، پەڕندە پەڕکار
نەققاشی کەردی، خاس‌تەر لە بەهار
«سعدوقاص» ئاسای، بۆ تیر ئەندازی
نابغەو نایاب، بۆ ساعەت سازی

---

١- ١٣٥٨ی مانگی.

دارا ئســـــتعداد، وەقـــــرو تـــــاعەتی
ئــوستای مـــوختەرع، كــولی ســاعەتی
لە ڕاســتی ئـــاغە، ئــوستای حــەقیقیم
شێویاگــە ســاعەت، خــاس وە دەقــیقیم
وەك ئەسبی سەركەش، وە سەد مەیتەڕۆ
هــەر چــە ئــەیكێشم، هــەر هــا لە بــەڕۆ
ئامان ســەد ئــامان، زنــهار ســەد زنــهار
وە عادەت نــەكــەیت، شكــار وە بــەهار
دانـــــایان واتـــەن، لە ڕووی ڕۆزگـــار
گـــــوونای كـــەبیرەن، بـــەهارو شكـــار



## شەماڵ ماڵەكەی

شـــەماڵ مـــاڵەكـەی، شـــەماڵ مـــاڵەكـەی
شـــەماڵ بـــۆ بكـێش ســـەر وە مـــاڵەكـەی
هـــەواڵ پـــرسی كـەر، بـــزان حـــاڵەكـەی
هـــــێمان بـــاقیەن زەڕەی خــــاڵەكـــەی
بشــــانە زلـــفان مشكـــین تـــاڵەكـــەی
بـــۆ بـــنیەر وە بـــۆی لیـــمۆ كـــاڵەكـەی
خاس بدیە وەو خــاڵ حــوسن و جــامەوە
پــیرۆزەن وە ڕووی نــوقرەی خـــامەوە

هەی هەی حەی تاران پاسەوانشەن
دینداران وە دین هەراسانشەن
چون خەیاڵ بویەر وە بەیانەدا
مەوێنی نەقشش وە عەیانەدا
ئەو نەقشە نەقشەی لەوزی حەوزێوەن
چون سەرسەوز ڕەنگش سابت سەوزێوەن
لەوزی نەقشێوەن حەوزو حەیاتەن
ئەسکەندەر پەرێش جۆیای زوڵماتەن
نایافت نایاب ڕووی سەرساتەن
ماەو خوەر لە شەوق جەماڵش ماتەن
شەکەر شەرمەندەی شەهد شیرینش
یاس یەئس حاسڵ کەرد لە عەبیرینش
نەکەرۆ وە بۆی عەتر وێش وە مەست
ڕشتەی ئختیار نەوا شۆ لە دەست
ناغافڵ شەیدای شەوق شێوەش بای
تویچ هەروا چون من شێتو لێوەش بای
«ئەحمەد» ئەو «سەنعان» حەفتاد ساڵەشەن
پەی دیسن «تەرسا» ئساەو ناڵەشەن



## تاقەتم تاق بی

تـاقەتم تـاق بـی، تـاقەتم تـاق بـی
لە دووریت دیـدەم تـاقەتم تـاق بـی
دڵ نـە گـێج مـەوج دەریـای فـراق بـی
دیدە بـە دیـدەن دیـدەت مـوشتاق بـی
«اَلْـحَمْدُلِلّٰهِ» بـازهەم نـەمەردم
دیـدە پـەی دیـدەن دیـدەت ئـاوەردم
تـەسکین دڵـەی هـەراسـانەکـەم
غونچەی گوڵ باغچەی کـوردسانەکـەم
ئـەدیب دانـای دوڕ شـناسەکـەم
سـۆمای بـینایی دیـدە ڕاسـەکـەم
گوڵ بۆی گوڵئەندام گوڵ عـوزارەکـەم
نـازکتەر لە گـوڵ هـەی نـازارەکـەم
ئـوستاد دانـای پـایەبەرزەکـەم
دڵگران نەویت من چەت عـەرزئەکـەم
ئـەر چـەگـیر دام ڕۆزگـارەنی
دوور لە نـازاران بـێ نـازارەنـی
دڵت وە بـادەی مـەینەت لەبـڕیزەن
بـەهار بـێ ئـازیز پـەرێت پـاییزەن
ئـامانەن خـەیاڵ نـەدۆ ئـازارت
سەرشار بەر وە سـەیر گـوڵو گـوڵزارت

هەرئان وە سەیران گولْباغچەی پڕگولْ
بەر مەشۆ غەمان ساکن مەبۆ دلْ
باغچەی پڕ نەمام نەوڕەسیدەت هەس
عەزیزتەر لە گیان نوور دیدەت هەس
چەند لەعل و گەوهەر دانەو دوڕت هەس
باغ پڕ سەمەر میوەی کوڕت هەس



## فەلەك تۆ خانە خراوم کەردی

فەلْەك تۆ خانە خراوم کەردی
جگەر پارەوو کەواوم کەردی
یەك نۆنەهالێ وە دەس ئاوەردم
وە ئاو دیدە پەروەردەش کەردم
تەنیا توولێ بی بێ بەرگ و ڕیشە
من بەردم نیام لە سەحن بیشە
وە ئاو دیدە وە خوون جگەر
پەروەردەش کەردم تا هاتە سەمەر
ناغافلْ فەلْەك لە بەدشانسی وێم
لە چەپگەردی تۆ لە ناڕاسی وێم
دەس بەردم گەردم لە شاخش چلْێ
وتم: دی تاکەی با بچنم گولێ

بــە وێـم نـەزانـام ئـی نـەردە شـەندی
شاخەو چڵو گـوڵ لە دەسـتم سـەندی
ئـیسە مـن جـەکـار خــەزان وە سـەفیل
«دست مــا کــوتاە خــرما بـر نـخیل»



## «ئەحمەد» تیر ناز سەوزەش بەرد وە گڵ

لەب چون گوڵ خەندان، نێش ناز چون خار
شیرین چون شەکەر، تاڵ چـون زەهـرەمار
هــەر لەحــزە دەردێ هــەر تـاوێ ئـێشێ
هــەرئان وە نــێشی ڕیشــەی دل کـێشی
نســەمام هـــەستیم لە ڕیشـــە ئـاوەرد
وە بـای فــەنا دای گـەردم بـەرد وەهـەرد
«ئەحمەد» بەرد وە گـڵ عـومدەی ئـارەزوو
شـــاهێن کـــۆ بـــیو سـەیاد ئـاهوو
کـــۆ بـــەرشی لە دەس، ئـاهوو لە دامـــم
ئــــیسە تــا مـەحشەر نـاسۆرەن زامـم
ئـاغە مــن و تــۆ هـەر دوو هـام فـەردیم
هــەر دوو گــرفتار ئـێش یــەك دەردیـم
هەر دوو هاین وە کێش گـیسوو کـەمەندان
ئـامێتەین وە عــەشق سـەرمەشق ڕەنـدان

دایـــم هـــامنشین مـار نـه دۆشـانیم
هـــام پـــیاڵەی بـەزم نـاز فـرۆشانیم
هـیچکام نـەمەندەن پـێمان ئـەحواڵێ
ئاخ من پەی سەوزە داخ تۆ پەی کاڵێ
وە شـۆخی شـێوەی کـاڵ تـۆ قـەسەم
وە گـــرفتاری حـــاڵ تـــۆ قـــەسەم
وە ئـەندۆهناکـی عـەرزەی وێم قەسەم
وە خـاڵ ژێـرلێو سەوزەی وێم قەسەم
هـــەتا نـــەپێچۆن وە ســـفید بـەرگم
بـــەرز نـەبۆ لە عـام ئـاوازەی مـەرگم
ســـەرد نـــەبۆ گـەرمی بـازار فـەردم
شین نەکەن شۆخان جە نالای دەردم
تا سەوزەم ڕوخـار وێش وە سەرناخوون
وە ڕووی ڕەخـتمدا نـەکەرۆ گـوڵگوون
وە گـیسووی حـەسرەت نـەپێچۆ تـەرمم
چـون شـیرین نـەکـا شـیوەن گـەرمم
وە تـێشەی نـازش نـەکـەنێ قـەورم
وە زاری نـــەکـــا وە گـــوڵزار دەورم
بـە ڕێـزەی ڕازان کـەرۆش گـوڵکاری
وە سـەیل ئـەسرین قـەترەی مـرواری
وە نـەسیم مـەیل ئـاوپاشی کـەرۆ
خاس چون شێوەی وێش نەقاشی کەرۆ
«ئـەحمەد» تـیر نـاز سەوزەش‌ها لە دڵ
بـەر نـەشی لە دڵ تـا بـەردش وە گـڵ

## ئازیز کەرد وەکێش

ئازیز کەرد وە کێش، ئازیز کَـەرد وە کـێش
چون شیرین گیسووی مشکین کەرد وە کێش
پەردەی دڵ چون گوڵ چـڵ مـەدا لە ئـێش
بـێ نـازکـەفتە بـی بێ نـازکێش وێش
مـەدیا وە حـەسرەت خـار خـاتر ڕێش
شـیرین هـەواڵـێ بکـیانۆ پـەرێش
وەسـیەت مـەکـەردش وەو خـەیاڵەوە
زلـف مـەدا وە دەم بـای شـەماڵەوە
واتش: ئـەی نـەسیم پـەیك پـڕهونەر
چـون دووی هـەناسەم بیرێ گـڕ وە بـەر
مـدارات نـەبۆ ڕاهـی بـەر ئـیمشەو
بـیاونە پـەیام شـیرین وە خـەسرەو
کەی ڕەوان ئەو حوڕ لە سەحرای حـوڕ دا
مـن لە تـای تـەنوور نـار پـڕ گـڕدا
واچـە بـە دڵسـۆز: دڵ کـەواوشـەن
قـامەتم چـەم دان چـەم بـێ خـاوشەن
ئـەر وێش وە خـەسرەو شیرین مـەوانۆ
تـازە هـەواڵـێ پـەرێم مـەکـیانۆ
ئـەگـەر چـە «شـیرین» ویـەردە یـەکسـەر
مـوبارەکش بـۆ عـەرووسی «شـەکـەر»

«شیرین» شیرینەن «شەکەر» چکارەن
«شەکەر» بێ «شیرین» وە زەهر مارەن
تا کەی مـن بەیتەور تەن وە جەفاوە
هوون دڵ وەرووم بە ڕووی وەفاوە
کەی یە مەقبووڵەن لە دەرگای باری
تۆ خەندەو مەزاق من گریەو زاری
ئەر زڕە مەیلت مەندەن جە لامان
ئامانەن ئامان دەسم وە دامان
فەڕ قەدەمت بوەر وە ماڵم
باوەرە وە حاڵ دڵەی بێ حاڵم
وە ئیلا مەبون وە کۆتەی زوغاڵ
گەردم مەوەران زلان یا شەماڵ
هەر تۆ وەشت بۆ گیان شیرینم
بۆرێوە جارێ باڵات بوینم
زام تێشەی تۆن «شیرین» لە سەرم
باز هەم تۆ مەدەی تانەی «شەکەرم»



## شەماڵ ناشادم

شەماڵ ناشادم، شەماڵ ناشادم
شەماڵ فدات بام، خاتر ناشادم
چون جاران ئەمجار، بپەس بە دادم
بکەرە جە دەست، مەینەت ئازادم
بای غەم دان خەرمان، شادی وە بادم
مێهرو وەفاو مەیل، بەردەن جە یادم
چەندێون شەماڵ، من لەو سەروەرم
مەر نمەزانی، من بێ خەبەرم
مەکیانووت بشو، کۆکۆ کاو وە کاو
هانی وە هانی، سەراو وە سەراو
مدارات نەبۆ، دەسم وە دامان
تەی کەرە ڕاگەی، چۆڵ بیابان
ئەمانەت فەرزەن، ئەوەڵ لەم لاوە
بگێڵە هەرتا، مەشی وە «پاوە»
شەماڵ سادەیسا، بەدحاڵەن حاڵم
مازە لە حەسرەت، ئازیز بناڵم
جەختت وە خەیر بۆ، ئاخێزکەر وە جەخت
وێت بدەر وە قەلب، دەربەنان سەخت
تەنگ «لۆن» وە تاو، تەی کەر وە زەروور
«هەتاوە چەرمە»، دەرەی «نوورە سوور»

دگـــانەی «بـــەرکوڕ»، وەو بـــەرزدەماغی
یـــاڵ «نـــوور کـــەوە»، تـــا وە «گـولْباغی»
چـــیەی «چـــاڵاوە»، پشت «تـــاقەڕەش»
سەرکێشە خوەشە، سەیر کەر وە سەرخوەش
کوپ «سووراوە ڕێ»، «شین کۆو «خەلانە»
ســـەیر کـــەرە بـــدیە، ئـــەو گشت مـــلانە
«مای شـەوەر» «دەیـلەم»، تـا «خـڕەسفید»
قـــەدیم شکـــارگای، «ســـەرداره ڕەشـید»
«گوڵ‌کـێ» و «بـەورە وار»، نسـارو هـەتاو
شان «شەتی نـوور»، سـەرتەخت «سـاناو»
«کانی گولیجی»، حـەوش «حـەوشە زەرد»
هـــەنگ حـــوڕئاسا، گـــێڵە بەرد وە بەرد
شەوگەی شکارگای، سینەی «سـێ خـڕان»
نـــاومای «چـــاشتەوەر»، کـــاو «گـــاقڕان»
بـــەرزی «پـــیر خـــضر»و، بەرزە دەمـاخی
تـا وە هـەوارگـەی، قـەدیم «قشـڵاخی»[1]
سەراو «سەریاس»، تـا سـارای «شـەمشیر»
شـێرانـــە شـــەماڵ، بـــا نـــەشۆت لە ویـر
چاوگەی «دووریسان»[2]، چیەی «دەرەنـێش»
دیش «سەراوهەوَلی»، بۆی هوون مەیۆ لێش

---

١- هەموو ناوو شوێنەو مەحاڵەکان لەم شێعردا هی کێوی «شاهۆ»یە.
٢- سەریاس، شمشێر، دووریسان هەرسێ گوندی سەر بە شاری «پاوە»یە.

پـــەشێو بـــی دیـــا، پـــەشێوی «پـــاوە»
شـــابالْش کـــێشا، وە «ئـــاتەشگا»وە[1]
ســـەرسام بـــی ســـاتێ و ئـیستغناوە
تـــەمانایۆش کـــەرد وە «خـــانەگـــا»وە
دیش خاکش چون خاك خوەتەن زەمـینەن
شـــیرینەن شـــیرین پـــڕ لە شـــیرینەن
بـــاغەن بـــاغاتەن، گـولەن، گـوڵ گـەشتەن
شـــینەن شـیرینەن، مـــاچی بـــەهەشتەن
گـــۆشە وە گـوشە نـوور لێش مـەوارۆ
هـــەزاران هـەزار پـەری و حـوور دارۆ
شـــیرینشان هـــەرچـــەند شـیرینی دارۆ
لە شـــیرینیشان شـــەکـــەر بـــوارۆ
شـــیرینی شـــیرین بـــێ وەر[2] مـــەحاڵەن
ئـــەگـــەر وەر نـــەبۆ شـــیرینی تـــاڵەن
شـــیرینشان وە نـــوور ئـــافتاب شـــیرینەن
گـوڵ وە بـــێ ئـــافتاب کـــەی عـەبیرینەن
بـــدیە چـــە قـــەڵای تـــازە ســـازێوەن
بـــا شکـــۆ و شـــەوکەت قـــاپی وازێـــوەن
هـــیچ تـــاقش لە تـــاق «کـەسرا» کـەم نـیەن
ســـاحیبش کـــەمتەر لە حـــاتەم نـــیەن
چـــمانێ «فـــەرهاد چـــینی» ســـازنان
شـــیرین پـــەی «شـــیرین» شیرین ڕازنـان

---

١- سەراو هەولی، دەرەنێش، ئاتەشگا هەرکام بە شێ لە شاری «پاوە» یە.

٢- خۆر، هەتاو.

یـــا قـــەسر شـــاهان خـــوسرەوان دەور
شاپوور نـەقاشیش کـەردە بـوو وەی تـەور
تـــارمەو تـــالار قـــەسرش قـــەشەنگەن
یـــەك پـــارچـە مـاچی ئـایەنەی سـەنگەن
عـــــەرش عـــــەزیمەن بـــاب هـــیمتەش
دنـــــیا نـــــمەدۆ نـــــیمەی قـــــیمەتش
بـــۆی بـــەهەشت مـــەدۆ مـــاوا مـــەنزڵش
حەوش و حەیات و گـوڵ بـاغچەی گـوڵش
«اَللە» گـــوڵزارش هـــەر بـــێ گـــوڵ نـــەبۆ
بـــــــولبول بـــــاغش داخ لە دڵ نـــــەبۆ
غـــونچەی گـــوڵاڵان نـــەو ڕەســـیدەشان
وەش بان پـەی سـەیران سـەفای دیـدەشان
بـۆ لە جـای «ئـەحمەد» کـەمتەر غـوڵامش
نـەك جـارێ سـەد جـار بکـەر سـڵامش



## «شەهلا»

«شەهلا»، شەهلائی، شەهلا چەمانم
بژانگ خەدەنگی، ئەبرۆ کەمانم
یە چە تیریٚ بی، تۆ دای لە جەرگم
ئاوات مەوازووم، هەر ڕۆ لە مەرگم
بەخشای پێم دەردو، نیەن دەرمانم
دەوا کەر دەردم، دەردت لە گیانم
نەرگس و سۆسەن، وەنەوشەو شەوبۆ
هەر چوار ماتن، لە بۆی زلف تۆ
نەرگس وە دیدەن، دیدەت دڵ تەنگەن
کەیٚ وەك دیدەی تۆ، مەست و قەشەنگەن
سۆسەن جە لای لێو، لەعلت حەزینەن
پەڕەکەی وەك پەڕ، لێوت شیرینەن
بەنەفشە لە لای خاڵت بیٚ ڕەنگەن
کەی وەك خاڵ ژێر، لێوت قەشەنگەن
گوڵباغی پەی گوڵ گۆنات دڵ تەنگەن
کەی گوڵش وەك گوڵ گۆنات گوڵ ڕەنگەن
ڕاسە دانەی دوڕ بەها سەنگینەن
کەی وەك دانەی دوڕ دگانت مەکینەن
نارنج و لیمۆ، پرتەقاڵ و بەی
هەر چوار کەیلن، لە واوەیلاو وەی

مەخسووسەن نارنج، نالآن دەردەن
ڕەنگش لە لای ڕەنگ، زنج تۆ زەردەن
لیمۆ وە خەیال، گەردەنت زەردەن
کەی وەك گەردەنت، زەردو بێ گەردەن
بەی‌و پرتەقاڵ، پەشێون وە خوار
هەریەك پەی ویشان، مەنالآن وەزار
چەنی گەردەنت، گرەوشان کەردەن
گەردەنت گرەو، وە لێشان بەردەن
سینەت چەنی عاج، هەم چەنی مەڕمەڕ
هەر سێ چەنی هەم، هان لە داواو شەڕ
عاج پێشەی فیل، مەڕمەڕ خۆ سەنگەن
کەی وەك سینەی سیم، سافت قەشەنگەن
نەنە وە ڕاسی ڕازنەبات من
بواچە چێش بی تەقسیرات من
سەد ساڵ وەك یەك ڕۆ، غولآمیت کەردم
هاتی وە سەمەر، میوەت نەوەردم
«الله»، «موحەممەدعەلی»، یارت بۆ
حەیفەن غەیر لە ئەو، خەریدارت بۆ
خەم دان وەك ئەبرۆی کەمانت بالآم
وەی دەی وێنەی نەی، بێ نەوا نالآم
ئەفعی زلفانت، وست وە گەردەنم
گەردەن گیرم بۆ، تا ڕۆی مەردەنم
کێ دیەن غونچەی نەشکوفتەی نیم ڕەس
دەستەی شکوفتەی گوڵ گێرۆ وە دەس

## شەماڵ بۆ «نەوسوود»[1]

چـاگـە مـەویەری وە سـەیرو سـەفا
لە «کـێل سـولتان» تـا «سـەیدەلوەفا»
ئـەمجار جـەو دمـا بـە دڵـەی مـوشتاق
ڕووی دڵ بکـەرە و سـوڵتان سـاق
چـەولاوە شـەماڵ وە سـدق سـافێ
وەشـڵەت پـەنە بـۆ بکـەر تـەوافێ
ڕجـاو لاڵـە کـەر وەو بـارەگـاوە
بـا ڕووسـفید بـای بـە لای خـوداوە
بویەرە لە سەر «سیروان» وێـنەی تـەیر
بـە تـەمەناوە سـاتێ بکـەر سـەیر
«بـرج ئـایەنە» مـیاوی «تـەکـاو»
تـا «بـەلەبزان» مـەوێنی وە چـاو
دەماخ چاخ وە بۆی شەوبۆی ئـێڵاخان
مـەشی وە «چـاوگە» بـدیە وە بـاخان
هـەوارگـەی هـەرساڵ «بـەلە بـزانـە»ن
جای وەعدەو وەعید شـەکـەر ڕازانـەن
سەیر کەرە «کرن خـان ئـەحمەدخانی»
جـەو دمـا شـەماڵ تـۆ وێت مـەزانـی

---

١- بە داخەوە ئەم شەماڵە لە دەس نووسەکەیدا زۆربەی فەوتاوە وە ناتەواو ماوەتەوە.

ڕات غــەڵەت نــەبۆ بــەرزی «وەزەنـە»
ســەختەن هــەڵەتەن ئـەو مـای گـەردەنە
نــە وە ڕۆ ئـارام نـە شـەو کـەری خـاو
خاوێ وەش کەرە لە سـەر «وشکـەناو»
تێ پەڕ کەر شەماڵ بشـۆ وە «نـەوسوود»
نــەوار مــەرزی تــا حـەدو حـودوود
سەرملەی «سوونی» تا «کـەلە هـەرات»
بســـــدیە بـــوێنە وڵات بـــە وڵات
ســـەر کــۆی «داڵانـی» پشت «دزاوەر»
تـــا «هـــانەماران» وە نـــەزەر بـاوەر
«کـــەلە هـــەرات»و «دەرەی تـــاریکە»
شەماڵ ئەر چی ڕاش سـەختەو بـاریکە
ئــاسۆ وە ئــاسۆ بــەرزی وە بــەرزی
چـەم بدەر وە چـەم بـاغات و ئـەرزی
تــاکــە دارەکــە دیــارەکە حـودوود
مــدرۆ مــەقابڵ مــەدیۆ وە نــەوسوود
ســاتێ دانــیشە سـەیر کـەر خـەمینەن
شـەکەتی بەر کـەر دڵـەی حـەزینەن
ئـەم دێــوو ئــەودێو خــاس بـوێنەوە
هــــەوار «گــەشێنە» وە «پــەروێنە»وە
قــابلەن تــەواف «هــەریەزاز» کــەری
تەوافگـای شـیرین شـەکـەر ڕاز کـەری
عــوزر نــاوەری هــیچ نــەوەر چـەنە
تەشریف بەر وە سەیر «چەشمە کەچەنە»

کۆی «ڕوەوزەنی» قەڵاگەی «سۆراڵ»
مەحاڵێ نیەن وەشتەر لەو مەحاڵ
تماشای چەشمەی «هانیبا» کەرە
شوکرزات پاك بێهەمتا کەرە



## نە هەر تەنیا تۆ

ئامیرزا «شەریف»، ئامیرزا «شەریف»
«سیفالله» نامەت، ئامیرزا «شەریف»
دا وە دەسمەوە، یەك یەك وە ڕەدیف
وانام و کردم، لە فامت تاریف
نە هەر تەنیا تۆ، زام زەدەی تیری
گیر لە تۆڕ دام، کەمەند پیری
جوانان دەور، دنیا سەراسەر
جە دەرد پیری، مەناڵۆن یەك سەر
جوانیو فکرو فام، هۆشو بەشارەت
پیری بێ پەروا، مەدۆش وە غارەت
گلە بەعیدەن، لە دنیای عەبەس
عومر ویەردە، نمەیۆ وە پەس
من جە تۆ فیشتەر، دەروون پڕداخم
پیری ها کەمکەم، گرتەن سەرشاخم

ئـــیسە لە مـــاڵا، خـــوار خـــەریکم

شـــەریکیم نـــاکـات، قـەدیم شـەریکم

مەلەك مەحبووبان، جەمین چون جامان

شـــیرین شـــەوکەتان، بـــاڵانەمامان

وێـــنەی مـــن و تـــۆ، ئـالوودەی دەردن

یەکسەر وە خەزان، پـیری ڕەنگ زەردن

من هەم چەند فەردێ، مـەبۆ بـواچـووم

جەرگ جـوانو پـیر، وە هـەم بـپاچووم



## نامەکەت یاوا(١)

نـامەکـەت یـاوا، میوتاڵەعەم کـەرد
دوود هـەناسەم، لە گـەردوون ویـەرد
لەو سـاوە قـوربان تـەشریف بـەردەنی
زیـارەت خـاك، «رضـا»[٢] کـەردەنی
تەرك ئاب و خاك، «کوردسان» کـەردی
دڵ لە دووری وێت، هەراسـان کـەردی
دیدەم لە دووری، دیـدەت تـەم پۆشان
سەیلاتش وەك سەیل، ئەسرینم جۆشان
خاس بی نامەکـەی، نـامیت پـێم یـاوا
زیـارەتم کـرد، بـە دیـدەم سـاوا
شـاد بـیم بەو نـامەی، پڕ لە فـامەوە
بـەو عـەترو تـەسویر، بەو مـەقامەوە
بـە شـادی بـادەی، بـەشارەتم وەرد
سوجدەم بەرد بو خواو، زیارەتم کـەرد
ڕۆشـن بـی زەمـیر، چـەشمو چـراغـم
سـاکـن بـی دەردم، سـافی بـی داغـم
بـەری لە ئـافات، دوور لە بـەڵا بـای
سـپەردەو مـەحفووز، زات «الله» بـای

---

١- جواوی نامەی یەکێ لە دۆسانکە لە خوەراساندا بووە.

٢- حەزرەتی «رضا».

ئــومێدەوارم، وە شــای خــوەراســان
تــەشریف بــاوەری، بــاز وەکــوردسان
تــا دڵ بــە دیــدار، دیــدەنت شــاد بــۆ
لە بــەند مــەینەت، دووریت ئــازاد بــۆ
«ئەحمەد» تــا بــە ڕۆی، قــیامەت مــاتەن
مــاتو مــونتەزیر، چــەمەڕای ڕاتــەن



## دوور لە وەتەنم(١)

دوور لە وەتــەنم، دوور لە وەتــەنم
غــەریب غــوریەت دوور لە وەتــەنم
سەرو سەهی تەرز مینووی چەمەنم
ئاهووی بێ ئاهووی خەتاو خوەتەنم
لەوساوە ڕۆڵە تەشریفتان بەردەن
دیدە پڕ لە غەم دڵ پڕ لە دەردەن
حەوش و حەیات و ماوا مەنزڵم
لوتفی نەماگە بێ عەتر گوڵم
هاین لە تای تەنوور توون(٢) ڕەنجووری
گڕگڕ ئەگرین لە تاو دووری

---

١- ئەم شێعرەی بە تەقازای «میرزا عباس گویری» و خێزانی بە بۆنەی دووریو جیایی لە منداڵەکانیان وتووە.
٢- ئاگردان ـ جەهەنەم.

باغان بێ پەرداخ گوڵزار بێ گوڵەن
چەمەن چەمەڕای ئامای بولبوڵەن
«کرماشان» یەکشان خارو پەرێشان
پەی جاگەی خاڵیت هەر ئاه مەکێشان
هەر لە «تاقۆسان» تا «سەراو قەمەر»
شارو خەیابان کووچەو دەشتو دەر
بێ ئێوە ڕۆڵە نووریٚ نەدارۆ
هەور تەم پۆشان غەم لێش مەوارۆ
«کرماشان» وە نوور ئێوە بەهەشت بی
زمسانش هەر ئان ئوردیبەهەشت بی
ئیسە بێ ئێوە نار حرمانەن
پەشێویش وە بار غەم وە خەرمانەن
تاقۆسان یەکسان تا وە «باغ نەی»
غەم لێش مەوارۆ بێ ئێوە پەی پەی
«شەش بەهمەن» بەو گشت فەزاو سەفاوە
بێ سەفان یەکسەر هان وە جەفاوە
کافەو سینەما شەهرو مەغازە
دووریا بێ ئێوە یەکسەر بێنازە
«مەیدان کوورش» تا «پارك شیرین»
شیوەنشان بەرزەن یەکسەرهان لە شین
«سیلوو» «سەراسیاو» «مەلامیرانی»
بێزیان بێزار لە زندەگانی

«سێڕای پەهلەوی» تا «دامنەی باخ»[1]

داخـین داخ‌دار هـەر مـەکێشن ئـاخ

★ ★ ★

## قەدمش وە خەیر

ئـازیز مـرادت، ئـازیز مـرادت

گوشاد بـی مـوشکڵ عـومدەی مـرادت

خوداوەن وە لوتـف کـەردەن دڵشـادت

غـەم و پـەژارە خـاس بـەرد لە یـادت

شکـۆفا بـە شـاد گـوڵ‌غونچەی گـوڵت

گوڵ وە بـار ئـاوەرد پـەی وەشـی دڵت

قـەدەمش وە خـەیر نـەو ڕەسیدەتان

حسب المـرام و بـەرگوزیدەتان

وە خەیر پا نـیان وە عـەرسەی زهـوور

ئـەڵبەتە کـوڕەن نـوورەن عـەلا نـوور

چـە لازم وە شـەرح دادە و دەلیـلەن

دوو سـەرە پـەیوەن سـەرو ئـەسیلەن

ئەداش نەقشینەن نەقشش وەش تەرزەن

سـەرو سـەعادەت بـەڕێز و بـەرزەن

١- تەواو شوێن و مەحاڵەکان کە لەم شێعرەدا هاتووە هەمووی هی «کرماشانە».

بــابۆش هــەر ئـەو دوڕ سـفید سـافەن

ئـــەمین مـــوبین تـــایفەی جـــافەن

«الله» ئــی غــونچەی شکــۆفەی تـازە

نــازارتــری کــەیت شــایستەی نـازە

ئی غـونچەی سـەرچـڵ تـازە ڕەسـیدە

عـــەزیزتر لە نـــوور بـــینایی دیــدە

پــەی دیــدە شـەمو پـەی دڵ چــرا بۆ

وە بـــراگــەورەی چــەندین بــرا بــۆ

درەخت عــومرش سـاحێب سایە بۆ

سەر بەرزو سـەوزو سـاحێب پـایە بـۆ

بــیاوۆ وە چـــەرخ حـەفتەمین پـایەش

بـــنیشن وە شـــاد هـەر دوو لە سـایەش

«ئــەحمەد» انشــاالله دوعـا دەورە وێت

وە ناز باوك و دایك، كوڕە گـەورە وێت



## تەسکین بەخشەکەت[1]

تەسکین بەخشەکەت، تەسکین بەخشەکەت
شەماڵ دا نامەی تەسکین بەخشەکەت
«مانی» تەرز تەور پڕ لە نەخشەکەت
مرواری و مەرجان، لەعل بەدەخشەکەت
چـون بۆی زڵف لەیل داش لە دەماخم
ڕۆشن بی جە شەوق چەشم و چراخم
شکۆفا بە شاد گوڵ باخی باخم
ساکت بی دەردو سافی بی داخم
نەشە بیم وە مەی مەیخانەی ئەدەب
کام شیرین وە شەهد شیرینی ڕوتەب
نەشەی ڕەشحەی مەی بێ تابی شەراب
پەی مەزەش مەر هەر دڵ کەرووم کەباب
دڵێ پەی مەزەی شەرابت نەبۆ
ئەر حازر پەی سیخ کەبابت نەبۆ
بە چەنگاڵ خەسم پڕ ئێش لە بێخ
ڕێزە ڕێزە بسۆ بڕێزێ وە تێخ
سەر هەر بەردە باز پاشێل پات بۆ
چەم هەر توتیای گەرد پالات بۆ

---

١- «میرزا ئەحمەد داواشی» ئەم شێعرەی لە جواوی نامەی «ملا محی‌الدین صالحی» کە لە «لوڕستان»دا بووە نووسیوە.

وەســەن فــدات بــام ســەیید ســەروەر
چــۆ کــاریم مــەکــەر جــە ئێد زیــادتەر
کــەی مــن شــایستەی لوتـف عـەتای تـۆم
من هــەر ئــەو کــەمتەر سایەو پــەنای تـۆم
لە لەعـــل لەبــان بــەدەخشانیت کــەرد
لە دورج دەهـــان دوڕ ئــەفشانیت کــەرد
نـــامەی خــــەتابەی خــەت شــیرینت
مــــەفاد مــــەزموون مــــوعەنبەرینت
شــەتڵت کــەرد لە دڵ بــە شــیرین کــاری
کــارێت کــەرد بــە دڵ پــەی یــادگاری
مــەدام چــون بــولبوڵ نــاڵان گــوڵ بـۆ
نــازکتەر لە گــوڵ زەدەی ســەر چـڵ بۆ
زووخ زامــــەتان مـــــەینەتوار وە لێش
غـــەیر لە یــاد تــۆ یــادێ نــەبۆ تــێش
بــە شــێوای شــیرین شــەکــەر ڕازەکــەت
بــە مــەودای مــۆبەت بــێ ئــەندازەکــەت
حــەڵقم حــەڵقاوێز حــەڵقەی پــەتت بــی
بــــە مــــەرام مــەیل دل لەت لەتت بــی
مـــــازە بــــەی زامــــان نـــاسۆر کــەفتەوە
بـــــە نــــار هـــیجران گــڕەی نــەفتەوە
هــــەر وا زووخ زام مـــــەینەت بــــنۆشم
چـــەم لە خــــاس گشت دنــیا بــپۆشم
ئـــیزهار کـــەردە بــیت دوور لە وەتــەنی
چون بوڵبوڵ مەحرووم سەفای چــەمەنی

قـــوربان ئــــامانەن دڵواپـــەس مـــەبەر
وەتـــەن کـــۆرۆ بـــۆ یـــاد کـــەس مەکـەر
وە تـــەن کـــاموەتەن؟ کـــەی ئـــەو وەتـەنە
ئـــیسە خـــــراوەی پـــــڕ لەجـــــەنە
وەتەن چون خـوەتەن نـافەی مـوشکین ڕێز
پـــڕ لە شـــیرینان شـــەهد شـــەکـەر بـێز
ئـــــیسە قـــومقومەو مـــەزووکەو مـــارش
جـــاگـــیرەن لە جـــای گـــوڵ لەگـولزارش
چ «ڕوانســــــەر» و چ «گـــــەرمەخانی»[1]
بـــێ خـــان و خـــاوەن وەســـە وێـــرانـــی
«قـــەڵاگـــە»[2] خـــەمین «قـوله»[3] مـــاتەمەن
تـــەم غـــەم لە بـــان «هێڵەوڕ»[4] جـەمەن
ئەو سەیر «سەراو» سـەر «تـەخت زەنگـی»
هـــیچ ســـەفاش نـیەن غـەیر لە دڵتـەنگی
چـــەمەن بـێ چـەمەن بـاغ کـەی بـاغەنان
نـــــەجای بـــــولبولان پـــــڕ لە زاغـــەنان
نـــــــەماگـــــە زەڕە قـــــەدرو قـــــابلی
بـــــۆ ڕەوەن خـــــاسە بـــــەیت کـــاولی
خـــــودا وە غـــــەزەب بـــەرقی لێداگـــە
تـــــەڵاو مـــــەفرەقی فـــــەرقی نـــەماگـــە

١- ناوی بەشێکە لە «ڕوانسەر».
٢ و ٣- ناوی کێون کەهەر دوویان لە پشتی سەراوی «ڕوانسەر» دا قەراریان گرتووە.
٤- ناوی کێوێکی بەرزە لە باکووری «ڕوانسەر».

چــاو خــوەتت هـاورد لەو گشت خـراوه
خـــوەتت نــەجات‌دا لەو گشت عــەزاوه



## سەرو سەهی تەرز[1]

«مــوحەممەد عــەلی» تــازە ڕەســیده
عـــەزیزتەر لە نــوور بــینایی دیــده
سـەرو سـەهی‌تەرز بـاغچەی سـولتانی
مـــەتلووب تــاڵب دەرس ئــینسانی
انشـــاالله لە دەور ئـــی دونـــیای فـــانی
بـــمانی وە شــــاد وە کـــامەرانـــی
بەو شەرت نەواچی «ئـەحمەد» نـادانـه
من وێم مـەزانـووم «زیـره» و «کـرمانه»
ئـــێوە بــوزرگ‌و ســاحێب مــەقامن
شـــیواو شـــیرین و شـــەکـەر کـەلامن
لە فــــــەزڵ‌و دانش وا بـــــێ‌نیازن
دەس‌و دڵ بســازو مسکـــین نـــەوازن
هەر تـا جـوانـی‌و قـوەی کـارت هـەس
تــەوانــاو تــاقەت ڕۆزگـــارت هـەس

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» کە لەگەڵ «موحەممەد تاهێربەگی سولتانی» هاوەڵ دەبێ ئەم نامە بۆ ئامۆژگاری ئەدیب‌و نووسەری بە ڕێزکاك «موحەممەد عەلی سولتانی» کوڕی ئەو کە لەو کاتەدا لە شاری «کرماشان» قوتابی بووه نووسیوه..

فـــــرسەتە ئـــامان وەك شـــێر بـــوانـــە

بـــــترسە لە تـــــیر تـــــانەی بـــێگانە

دانش پــــــەژوو بــــــەر وە دڵ بــــخوێنە

پشت ڕەقـــــــیبی ڕەقت بشکـــــێنە

عەرز بەندەی وێت مـەکـەر فـەرامـۆش

بـــنیەری ڕوتـــبەی بـــوزرگیت لە دۆش



«میرزا ئەحمەدی داواشی»

١٣٥٣ی هەتاوی

## هەر دڵ دەرد نەکا[1]

کاکە «ئەحمەد» گیان برای قەزوێنی
یا خوا تا ماگی تەڵخی نەوێنی
چەندێ لەمەو بەر پێم گەیی نامەت
نەشە بیم وە شەهد شیرینی خامەت
خوا نەکا برا بەد حاڵ بێ حاڵت
ئێش نەکا سەرو دەس‌و پاو باڵت
وەلێ «ئەحمەد» گیان کوردی بێژم پێت
قسەم با وەك زەنگ دەنگ بدا لە گوێت
ئێش باڵ خاسە ها لە ئیدارە
ئەڵبەت بۆ حەکیم زوو ئەوێت چارە
هەر دڵ دەرد نەکا لە حوجرەی دەروون
دەرمانی ناکات دووسەد ئەفلاتوون
کاکە درد من لە تۆ بەدتەرە
دەرد تۆ باڵە دەرد من سەرە
لەم یەخبەنانە پام سڕیاو کەفتم
سەرم وا شکیا دە ڕۆژ بۆی خەفتم
تەقەی سەرم هات حەوش پڕبوو لە خوێن
«ئەحمەد» چۆن تەقەی نەگەیە «قەزوێن»

---

١- نامە بۆ «ئەحمەد فەریقی» یەکێ لە هاوەڵانی «میرزا ئەحمەد» کە لەو کاتەدا لە «قەزوێن» دا ژیاوە.

«الله» بـــاڵ تـــۆ ســـاکت بـــۆ لە ئـێش
تـــازە زام ســـەر مـــن بـــووگە ســـاڕیش
ئـــــەو مـــاە کـــامڵ ئـــەو دوو مـــاەپارە
خـــوا لێت نـــەیسێنێ ئـــەو سێ نـــازارە
ڕووت چون ڕۆجیار «ئەحمەد» ڕووناك بۆ
ڕووی ماهت لە گەرد حەسوودان پاك بـۆ
وێـــــــنەی بـــێوێنەت یـــــادگاریەن
مــــــەڵهەم زامـــــەت دەرد کـــــاریەن
هـــەر ئـــان وە دیـدەن دیـدەنیش وەشـم
چـــــمانێ دنـــــیا بـــــووگە وە بـــەشم
وێنەی «مەنووچهر» «مەنسوور» و «ڕەشـید»
هەرسێ ڕۆشنەن لە لام چـون خـوەرشید
یاخوا ئاغەگـیان، هـەرئان خـوەشت بێ
دیندار، ئاخرخەیر، بەهەشت بـێ



## سروە مەعلوومەن بای بەهاریەن[1]

ئاغە «سەردار»ت، ئاغە «سەردار»ت

هەر پایەدار بۆ پایەی «سەردار»ت

وە زمسان نەوێت هەرگیز بەهارت

هەر پڕ لە گوڵ بۆ باخچەی گوڵزارت

هەر کامڕەوا بی لە ڕۆزگارت

هەر وا گەرم بۆ گەرمی بازارت

«سالار»ت نەهاڵ یادگاریەن

سەمەرش میوەی ڕەستگاریەن

شکۆفەی شیرین تازە چڵتەن

خوا لێت نەسێنێ چرای دڵتەن

وە ناز دایك و وە مێهر پدەر

یاخوا گەورە بۆ تا بێتە سەمەر

ئیسە سەوڵێکە ئەکەی تماشای

خوەشە وە پیری دانیشی لە سای

«سەردار» انشاالله هەم سالاری بێت

برای پشتیوان کەس نەداری بێت

نەسیم سروەی وەش بۆی بەهاری

مەڵهەمەن بۆ ئیش زامان کاری

---

١- ئەمنامەی بۆیەکێ لە دۆسانی بە ناو «عطاءالله مەردۆخی نووسیوە.

مــاڵ و دەوڵـەتو دارایـیو سـەروەت
نمەدۆ بەهای نـیم سـروەی «سـروە»ت
کــولم گــۆنا سـوور وەك هـەنار سـاوا
زەردی گــەردەن وەك زەردی خــوەراوا
چاو وەك هـەسارەی شـوعرای یـەمانی
پــرشنگ مــەشانۆ شــەو تــا بــەیانی
ســڵخۆو خــەیاڵی وەڵــەد غــەزاڵـەن
«ئاهوو»ی بێ ئاهووی ڕامیش مەحاڵەن
ســروە مــەعلوومەن بــای بــەهاریەن
بــەهار بــێ ســروە دەردش کــاریەن
ســروە سـەفابەخش شکـۆفەی گـوڵەن
گــوڵان بــێ ســروە مــات ومــاتڵەن
گوڵسۆسەن سادار سیمای شـێوەشەن
شــەقایق لە شـەوق شـێوەش لێـوەشەن
گــوڵان ئـینتیزار شــنۆی شـێوەشەن
هەر گوڵێ پەی وێش شـێتو لێـوەشەن
بـولبوڵ چــەمەڕای قـەدەم ڕنـجەشەن
شمشاد حەسرەتمەند دەستو پەنجەشەن
سەرو کـەی لە تـەرز بەرزی بـاڵاشەن
چــەمەن چــەمەڕای پــاوو پــاڵاشەن
گـەڵا کـەی لە ڕەنگ کـاڵای واڵاشـەن
بــەنەفشە کــەی وەك خــاڵ ئــاڵاشەن
شـەوبۆ لە بـۆی زڵـف خـاوی خـجڵەن
چون بـۆی لە لای بـۆی زڵـفش بـاتڵەن

دوو دەستە گوڵەن خودا دایگە پێت
یاخوا «مەردۆخی» نەیانسێنێ لێت
«ئەحمەد» تا لە دەور دنیا بمێنێ
سەنای «سەردار» و «سروە»ت ئەخوێنێ



## «ئەحمەد» دەماغم

«ئەحمەد» دەماغم، «ئەحمەد» دەماغم
«ئەحمەد»[1] وە «ئەحمەد»[2] نیەن دەماغم
جەو ساوە هەواڵ «نەبیم» شنەفتەن
لە باڵای مەسجد جامعە کەفتەن
منیش بەو دەستوور هەوام بەست لە بان
سەرتاپا ئەعزام هاتە ئەلئامان
زام ئەو کاری ئێش من سەختەن
وەلێ زام سەختی «نەبی» ناوەختەن
نەو ڕەسیدەی نەو تازە پەرداخ بی
چون سەرو سەهی شکستەی باخ بی
زام من سەختەن دەردم کاریەن
زامم ها لە دڵ نادیاریەن

---

١- نامە بۆ یەکێ لەدۆسان بە ناوی «ئەحمەد فەریقی».

٢- پێغەمبەری خۆشەویست «حەزرەت موحەممەد» درووددو سەلامی خودای لە سەر بێ.

خەیاڵش خارەن هەرئان لە جەستەم
نەشتەرەن پەی زام تازە تۆژ بەستەم
دڵ بەو زام سۆوە سارێشیش نیەن
غەیر لە خوەشی ئەو دڵ وەشیش نیەن
ئامان «ئەحمەد» گیان لە تاقەت تاقم
وەختەن تەبدیل بۆ عەقڵ و ئەخلاقم
زووتر لە «نەبی» لە چۆنیەتی حاڵ
بە خوەش هەواڵی باوەرەم وە حاڵ
بە موژدەی سحەت وەزع مەزاجی
عەلاج پەزیر بی کریان عەلاجی
سا دەی بە موژدەی بێ نیازم کەر
دەی سەرەفراز بای سەرەفرازم کەر
وە ئیلا وەسڵەی حاڵم ناجۆرە
زامەکەم تا ڕۆژ مەحشەر ناسۆرە
شەوان لە هجران ڕۆژ لە وەسواسە
تۆ لە چە حاڵی حاڵ من واسە
زیادەن پەی من لاف ڕەفیقیم
حەقیقەت واچووم بەندەی فەریقیم
ئەر قەبووڵتەن دڵ پڕ ئیخلاسم
«ئەحمەد» بۆ غوڵام «ئەحمەد» گیان خاسم

★ ★ ★

## نامەکەی نامی

بەنام ئەو کەس، کەسە بۆ بێ‌کەس
غەیر ئەو کەس، کەس، نیە بالادەس
سەڵوات‌و سەلام بێ حەد و شومار
نازڵ بێ‌ لە سەر «ئەحمەد موختار»
«ئال» و «ئەسحاب» و زومرەی «تابعین»
بەخەتم خاتەم «موحەممەد ئەمین»
تا دێر زەمانە هەر پایدار بی
دارا فکرو هۆش بە دڵ بێدار بی
سەرچاوکەی زەینت وا پرخرۆش بێ
مەیلت وا گەرم‌و دڵت پڕ جۆش بێ
هەر وەها سەودای سەرەفرازیت بێ
بە دڵ ئیرادەی دڵ‌نەوازیت بێ
لە ڕەویەو ڕەوش خودا شناسیت
نە من عەرز ئەکەم گشت ئێژن خاسیت
ئیزهار لوتف و بوزورگیت کەردەن
کەمترین بەندەت وە یاد ئاوەردەن
گیانم بەئێد بی نامەت پێم یاوا
قولف قاپی عەشق شادی شکاوا
خاس‌تر لە ڕەیحان بۆ نیام وە بۆش
غوسەو هەم‌و غەم گشت بی فەرامۆش

ڕەیحان کەی تاوشت لوتف تۆ دارۆ
لە بۆی لوتف تۆ عەمبەر مەوارۆ
بۆسامو نیام وە سەر بینایيم
مالاّ چون سەیقەل ڕەنگ سیاییم
دەروازەی مەینەت جە ڕووم بەستەوە
دڵ جە مەینەتان دنیا ڕەستەوە
حەیفەن هەر نامەی چون تۆ سەڕافێ
بکیانۆ وە لای «بووریا» بافێ
کەی من قابلم بێ عەیب و ئەڵەم
مەقابڵت بم بە علم و قەڵەم
کەمەند مەیلت هەوادا وا هات
گرتمی کێشامی هاوردمی بۆلات
وەسواسەی مەیلت وا مەجنوونم کەرد
شێت بیمو ئەو ڕۆژ تلیفوونم کەرد
شەکیبای تۆ بیم وشك بیم وە پاوە
با شەکیبایی جواومی داوە
تا دیدە بە دین دیدەت تازە بی
شاکری شوکرم بێ ئەندازە بی
سەرخوەش لە شێوەی شوکوفتەی گوڵت
مەست بیم وە مەرام ماڵو مەنزڵت
عاجزو غەمگین یانەی دڵ خاپوور
بێ بەش لە شادی لە خوەشی هەر دوور
تار تەمئەنگێز تاریك دەیجوور
زڵمات زاتی موبەڕا لە نوور

مەگێلیام سەفیلْ[1] سائێلان دەستوور
یاوام وە دووکان ئاغای «بێدار پوور»
دەرلاد فریشتەی شادیم بە زەروور
دڵ ئاوەرد وە جۆش بە وەجدو سروور
بەرکەرد خەیالان خارغەم نەدڵ
ڕەنگین کەرد ڕەنگم ڕەنگینتر لە گوڵ
ڕۆشن بی زەمیر چەشم و چراغم
جە نۆ شکاوا گوڵباغی باغم
لە موساحبەی دوستەکەی گیانی
تەبدیل بی پیری من وە جوانی
دەست وە تۆی یەخەی عارفانەش بەرد
نامەکەی نامی عالیش بەر ئاوەرد
تارف کەردش پێم وە ڕووی فامەوە
مەڵهەموار نیام وە ڕووی زامەوە
ئومێدەوارم هەر خاترجەم بین
بە ڕشتەی وەفاو مەیل هەر موحکەم بین
خولووسیەتم لە ڕووی ئیخلاسەن
ئەڵبەت مەحبەت دوو سەرە خاسەن
بە خوون ڕیختەی شەهیدان دین
ڕیایش نیەن «ئەحمەد» بۆ «ئەمین»[2]



---

١- بەدبەخت ـ زەبوون.
٢- جواوی نامەی یەکێ لە دۆسان بە ناوی «محمد امین بطحایی» خەڵکی «سنە».

## تەبریك نەورووز

سۆمای بینایی دیدە ڕاسەکەم
تەسکین دڵەی پڕ هەراسەکەم
مەگەر وە دینت بشکێ تاسەکەم
کۆتا بۆ دووکەڵ دووی هەناسەکەم
لە دووریت قوربان ئەوەن تاسەمەن
«ئاویەر» عاجز دووی هەناسەمەن
تەبریك عەید نەورووز کەردە بیت
ڕۆژو ماەو ساڵ فیرووز کەردە بیت
پیرووز فیرووز ڕووز نەورووز بای
لە بەزمو سازو گودازو سووز بای
ئەو کارت تەبریك هەر ئەو دەستەی گوڵ
دەست خوەش تا دەستە نیشت لە ڕیشەی دڵ
منیش هەم کارت تەبریك نەورووز
ئەڵبەت ئاتەشین ڕیشەی جگەر سووز
ها هەناردم بۆت دانای دیاری
تا تۆیش سووزان بای پەی یادگاری
فەرمانو ئەمرت وە فەرز، فەرز ئەکەم
هەرعەید ساڵ نۆت تەبریك عەرز ئەکەم

«ئەحمەد» تا ئەبەد بە سدق‌و یەقین
بەندەن بۆ جەناب «موحەممەد ئەمین»[1]



## چون بولبول پەی گول

شەریف ئەشراف ساحێب ڕوتبەو شان
جناب سەرهەنگ «عەلی‌ئەشرەف‌خان»
یە چەندێ وەختەن بە وێنەی بولبوڵ
پەروازت کەردەن لەی گوڵزار گوڵ
دوور بۆ لە گیانت جاگەت خاڵی‌یەن
جای خاڵیت پەی دین دیدەم تاڵی‌یەن
چون بولبوڵ پەی گوڵ ناڵان زارم
بە دین دیدەت دڵ ئینتزارم
«الله» خەم نەبۆ بەرزی دەماغت
مەدام پڕ گوڵ بۆ باغچەی باغت
جەو ساوە تەشریف بەردی پەی «تاران»
دینت تازە کەرد بە دین یاران
«ڕوانەر» بێ تۆ نەماگە فەڕی
وەك تاو تەرزە ئەوارێ شەڕی

---

١- جواوی نامەی یەکێ لە دۆسان بە ناوی «محمد امین بطحایی» خەڵکی «سنە».

یــەك جـاری دەردم چـەکـەردەن کـاری
قـــەڵەمێ دای پـــێم پـەی یــادگاری
ئەگـریا هـەر ئـان دڵـمی تـەنگ ئـەکـرد
وە ئەسر حەسرەت دەسمی ڕەنگ ئەکرد
دەورانت تا سەر «سەرهەنگ» وە دڵ وێت
باغت پڕ سـەمەر بـاغچەت پـڕگوڵ وێت
دەس دشـــمن دایـــم بـــە دامـــانت بـــۆ
«ئەحمەد» بەی تـەورە سـەنا خـوانت بـۆ



## ڕەفیق شەفیق

ڕەفــیق شــەفیق حــاتەم تــەرزەکـەم
شــــایستەو لایـــق پـایەبەرزەکـەم
فەردو فەرموودەت وە دوڕ فەرز ئەکـەم
حەقیقەتی هەس هەر چە عەرز ئـەکـەم
دانــــاو دانشــــمەند دارا دانشــــی
بـــا حــوسن نـیيەت بــێ ئــالایشی
فـەیلەسووفـفام «ئـەرەستوو»ی دەوری
«لوقمان» لایـق جـای سـەڵاو شـەوری
سیمای سوورەتت نـەقش «مـانی» یـەن
ئــــاینەی خـــەیاڵ پــڕ مـــەعانیيەن
نـــوتاق نــاتق ســوخەن ســەنجەنی
کـــلید قـــاپی دەرگـــای گـــەنجەنی
تۆ هـەر ئـەو دانـەی دەریـای گـرامیت
دوڕ مــــەعریفەت نــــادرو نــــامیت
ڕۆشــــنەن لە ڕوو نــوور ئــیخلاست
لاڵ بام ئـەر وە خـان کـەرووم قـیاست
چــون تــیر شـــەهاب زەڕەی بــاتنت
جاگیر بۆ لە جەرگ بـەدخواو دوژمـنت
کــان مـــەعریفەت کــۆی کـەماڵەکـەم
عــارفان سـفەت خـوەش خـەیاڵەکـەم

هـــیچ حـــاڵم نـیەن بـەد حـاڵەن حـاڵم
حـــاڵ زانـــیٚ نـــیەن هـــاوار وە مـــاڵم
یــەك جــار لە دووریت تـاقەتم تـاقەن
دڵ لە گـــێج مـــەوج دەریـــای فـراقـەن
دووریت هـــەر ئـــەوەن مـــەدۆ ئـــازارم
وەگـــــیانت قـــەسەم لە گـــیان بـــێزارم
لە یـــــادت ئـــــانیٚ دڵ نـــیەن غـــافڵ
وە خـــار دووریت مـــەدام مـەدۆ چـڵ
وەگــیانت قــەسەم ئــاگــر وەگـــیانم
یـە چـۆن نـاشنەوی قـرچـەی بـریانم؟



## ڕەفعەت پایە بای

ڕەفــعەت‌پایە بــای، ڕەفــعەت‌پایە بـای
یاخوا! «ئـەرفەعی»[1] ڕەفـعەت‌پایە بـای

سـەریەرزو سـەوزو، سـاحێب‌سایە بـای
بـــە فـــەڕو دانش، دارامـــایە بـــای

ڕەخشان بۆ جە فـەوق، سـەعد سـتارەت
هــەر پــایەدار بــۆ، پــایەی ئــەدارەت

ڕوتــبەی بـوزورگیت، بـنیەری وە دۆش
عەرز بەندەی وێت، مـەکـەر فـەرامـۆش

گۆش مەدەر وە چەرخ، بێ ڕای پـڕستەم
کـەشتیت گـوم مـەکـەر، لە گـێجاو غـەم

ئەی چەرخ چەپ‌گەرد، چەواشەی چەپ‌خۆ
بــەدخۆی بــەدمەجاز، بـێ‌تانو بـێ پـۆ

هەر ئان بە نەوعێ، هـەر نـەوعێ تـەورێ
هەر تەورێ دەورێ، پڕ جـەفاو جـەورێ

بــازار مــەکــرش، وە هــەزار ڕەنگــەن
بوخچەی خەلعەتش، پڕ خودعەو جـەنگەن

سەرمایەی لوتفش، هەر جەفاو جـەورەن
مـــوقەدەراتش، بـــێ فکــرو شــەورەن

---

١- یەکێ لە دۆسانی هۆنەر.

دۆسـی و دوشـمنیش، هـیچ دیـار نـیەن
پای دۆسیش پـەی کـەس، پـایەدار نـیەن
دانـەی مـۆبەتش، پـەی مـەردان دامـەن
نـامەردان دەوران، دنـیای وە کـامەن
عـەجووزەی عـەرووس، دەور زەمـانە
قـەساس قـاتڵ، پـیرو جـەوانـە
وە کێ تەی نەکەرد، ڕای توون و تەوەس
کێ بەرد کێ نەوەرد، کـێ گـێڵا وە پـەس
نـە هـەر تـەنیا تـۆ، دڵ داخـی کـەردەن
بـەرگ چـەن کـەسان، قـەڵاخی کـەردەن
ڕاسـتە تـۆ مـاچی، ئـازیزم مـەردەن
فـەڵەك هـەر تـەنیا، وە تـۆش نـەکـەردەن
دڵـدارو دڵـبەر، تـا سـەر نـەوەردەن
فـەڵەك داخ وە دڵ، دڵـداران بـەردەن
چون «تاق‌تاق‌کەرە»، هەر تـاق‌تاق کـەری
شـەوان تـا بـە ڕۆ، الفـراق کـەری
لە شـالوولەی عـەشق، گـاز ئـاتەش‌خێز
سـارا سـووزان بـۆ، سـەما تـەم‌ئەنگێز
بـڵێسەش بـەرز بۆ، وە بـەرزی کـاوان
مـەناش مـەکـەرە مـەگـێر لێش تـاوان
ڕاسـە هـەر دڵـێ، دڵـبەر مـەردە بـۆ
مـەبۆ زار مـار، ئـەژدەر وەردە بـۆ
ئەر چە بێ سوودەن، وەر چـە دڵبـەسەن
زاری پەی مـەردەن، کـەردەی عـەبەسەن

«شیرین» بەو شێوەی، شیرین کارەوە
بەو شۆخی شێوەی، شەکەربارەوە
شازادەی «چین»ش، ئاوارەی زێد کەرد
بە وەعدەی وساڵ، وێش نائومێد کەرد
نەوەی «نوشیروان»، شێوان لە ڕا بەرد
وا بەرد راە وە سەر، شاهی وێش نەوەرد
«ئێران» دا جە ڕای تورەی مشکینش
«فەرهاد» ڕەها کەرد، چین‌وماچینش
خەسرەو ئەو سەریر، فەڕبەخش شاهیش
ئەو تاج ئەو تەخت، حشمەت پەناهیش
جە عیشق «شیرین»، پاسە بی دینش
گشت مەدا بە نیم، نگای شیرینش
«زلێخا»ی زیبا، وا بی زینەتش
تای زلفش نەوی، «مصر» قیمەتش
عەزیزتەر لە گیان «عەزیز»، عەزیز بی
وە مەیل مەی لە جام، مەیلش لەبڕیز بی
بەرگ شکۆفەی، شەرمش وا ڕیزا
تا «یوسف»ش دی، عەزیزش بێزا
چەند ساڵ بەو زامەت، زووخ زامەوە
بەو کزەی ئەوین، بی ئارامەوە
وا پەردەی شەرم، لە ڕووی خوەی لادا
وا لادا شاهی، وێش وە گدا دا
«بلقەیس» «چلگیس»، هەمەلای پەری
خەرمان چین زلف، «لەیلای عامری»

نەبی چون «لەیلا»، چەرخ چەم شیرین
«تەرسا» «سەنعان»ش، بەری کەرد لە دین
«مەجنوون» دێوانەی، دوو دیدەی لەیل بی
«لەیلا» پەی مەجنوون، جە غەمان کەیل بی
هەر ئانێ ئەو لەیل، سەوزەی شاهێنچاو
باڵ چاو مەدا، سەنگ مەکەرد وە ئاو
فەڵەك شێونا، بەزم بادەشان
چین چین، چین، چون گوڵ نەمەند وادەشان
«ئەرفەعی» «ئەحمەد»، ئازیز نەمەردەن
داخ ئازیز مەردان، وەردەن وا زەردەن



## ناڵینم وێنەی نەی هەزار تەرزەن

مــــــوعەمبەرینت، مـــوعەمبەرینت

پـــێم یــاوا نــامەی، مــوعەمبەرینت

مـــەفاد مـــەزموون، نـــەزم شــیرینت

تەزهین بی وە هــوون، دڵـەی حـەزینت

کــەفتەنی نـە دام حـەڵقەی زڵـف دێـز

نـەشەی بـە ڕازان، ڕێـزەی شـەکـەرڕێز

دیـــارەن دووربــا، لە غـــەم کـــەیلەنی

سەرعیو سەرگەردان، سەودای لەیلەنی

ئــاشوفتەو پــەشێو، شـێوپای شـێوەی

لەیل لێوەت کەردەن، وەو خاڵو لێـوەی

گەردەن گیرۆدەی، سەر حەڵقەی تەوقیت

پات پابەن وە کـۆت، زەنـجیر ڕەوقـیت

ئــەر وە ئـێش نـێش، مـوژەی دڵـبەرت

دڵ پــــارە بـــیەن، بــڕیان جگــەرت

هۆشو فکرو فام، ئـەر بـرد وە غـارەت

دین نەدەی لە دەس وە یـەك ئـیشارەت

مـــەبۆ لە ســـزاو، جـــەزا نـــەتەرسی

چون «سەنعان» ئەر دین، «تەرسا» مەپەرسی

عـــاشق مـــەبۆ وا، لە ســازو سـووز بـۆ

زمسانش هەر ئان، فـەسڵ نـەورووز بـۆ

چون بولبوڵ هەر ئان، مەرامش گوڵ بۆ
وە نەسیم گوڵ، شوکوفتە دڵ بۆ
پێکیای پەیکان، شەست نازەنی
نە چەنگاڵ باز، ناز بێهازەنی
مەزانووم قوربان، گیر دامەنی
لە سەد لا چون من، زەدەی زامەنی
منیچ هەر وەك تۆ، زووخ زام وەردم
سەد بەرابەر تۆ، گران بی دەردم
شوکر، تو جوانو، ئەوەڵ دەمتەن
بازاڕت ڕەواج، دی چە غەمتەن
تۆ وێت ئەو غونچەی، تازە دەمەنی
کەی ئەوەن دەربەن، دەردو غەمەنی
دەرد من بەدەن، عەلاجش نیەن
پیریەن کاڵام، ڕەواجش نیەن
بەهارم سەر چوو، زمسانم سەختەن
خوەرم دای لە کەل، خوەراوای وەختەن
سەرو زندەگیم، خەزانش خێزان
خەزان کەردەن بەرگ، ئومێدم ڕێزان
ناڵینم وێنەی، نەی هەزار تەرزەن
جە باغ و بۆسان، هاوارم بەرزەن
تۆ نەخل نۆخێز، باغچەی بەهاری
پڕ سایەو سەمەر، ئومێدەواری
بەهارەن تەشریف، بەر وە سەفاو سەیر
ئەر چە بەهاری، بەهارت وە خەیر

شــادی بــەهارت، وە ئــەنازە کــەر
دڵو دیــن بــە دیـن، دڵـبەر تـازە کـەر

بەهارت هەر وەك، ڕەنگو ڕووی دڵـبەر
بۆ وەش‌تەر لە بۆی، بۆی گیسووی دڵبەر

چون خەسرەو چەنی، شیرینت سەرشار
بە شـاد بـویاری، هـەر سـاڵ نـەوبەهار

کەی مـن ئـەو دانـام، دەواکـەم دەردت
شایستەگیم کـۆن، بـووم وە هـامفەردت

تۆ هەر ئـەو شـاعێر، شـیرین فـەردەنی
عــــارفانە جـــام، عـــرفان وەردەنـــی

هـــەمیشە نـــەشەی، بـــادەی ئـــەدەبی
شـیرین‌تەر لە شـەهد، شـیرەی ڕوتـەبی

کەی چون من «سەنعان»، حەفتاد ساڵەنی
دایــم هــەر خــەریك، ئــاەو نــاڵەنی

وە تـــاڵ گـــیسووش، ئـــازیز دڵــبەر
دەستو پلت بەستەن، تا یەومولمەحشەر

قوربان گیان «ئەحمەد»، هەر غولام تۆن
کەی ئـەو هـام فـەردو، هـامکەلام تـۆن

تـــووتیای دیـــدەش، غـــوبار پـــاتەن
دوور بـــۆ یـا نـزیك، گـیان وە فـداتـەن

★ ★ ★

## دانای خوەش مەزموون

دانای خوەش مەزموون، دانای خوەش مەزموون
دانای خوەش کەلام، دانای خوەش مەزموون
هام فەردت نیەن، لە ڕووی دەهر دوون
حەککاك حالْی، وە دڵەی پڕهوون
مافەوقت نیەن، لە ڕبع مەسکوون
بەر ئارەندەی دوڕڕ، لە «دەریای جەیحوون»
زاناو پایەبەرز، تەبیعەت مەوزوون
دایم هامنشین، وە کزەی دەروون
«ئەرەستو» سەرسام، فکرو هۆشتەن
«ئەفلاتوون» غوڵام، خەرقەی دۆشتەن
واعزو ناسح، مەوعزە شیرین
پا بەرجا بە ڕاس، لە سەر ڕاگەی دین
هادی گومڕاهان، بە ڕەویەی ئەدەب
بە شیرین شیرین، چون شیرەی ڕوتەب
هەر مفتی و قازی، پەدەر بەر پەدەر
هەر دوڕ لە دوڕ بین، گەوهەر لە گەوهەر
شێر بێ ئەندێش، بێشەی شەریعەت
ئاشنای شاڕای، هەر چوار تەریقەت
تەی کەردەی ڕاگەی، ڕاسی وە ئیخلاس
پەی بەردەی ئکسیر، کیمیاشناس

نـــایافت نـــایاب، نـــادرو نـــامی
چـــراغو چـــەشمەی، دیـــن ئـیسلامی
«کــوردوستان» یـەکسان، لە فـەیز فـەڕش
گشت بەر خــوردار بـین، لە گـەنجو زەڕش
وە نــوور دانش، «ســنە» ڕەوشــەن کـەرد
وە بەزر فـەزڵش، گشت وە گـوڵشەن کـەرد
هەمیشە مـەس بـی، وە بـۆی لەقـای حـەق
نـــوور لێش مــەوارا، تــەبەق وە تــەبەق
عەزمش جەزم بـی، خـاس وە خـاترجـەم
تـا شـی وە تـەواف، مـەککـەی مـوعەزەم
خاکش پەی مـەڵهەم، دەوای دەرد وەردش
حەمدو سەنای حـەقق، وە جـا ئـاوەردش
لە بـــەرزان بـــەرزەن، بـــەرزی دەمـــاغش
ڕەوشـــەنەن وە نـــوور، ئـیمان چـراغش
ســـەفای نـــوور حـــەقق، وە لێش مـــەوارا
وا وارا وارا، ڕەحـــــــــەمەت وە ســـــارا
مەوسووف بە سـیفات نـامیو بـەرجـەستە
کەمەر بـۆ خـزمەت، دیـن ئـیسلام بـەستە
لە باغچەی عـرفان، دانـەی فـەزڵش کشت
فەزڵ ئەفشانیش بی، وە خەروار نەک مشت
«ئەحمەد» ئەر چە دوور، ڕۆحش جە لاتەن
قـەبووڵ کـــەر قـوربان، گـیان وە فـداتـەن

★ ★ ★

## بێ قیاسەنی[1]

بــــێ قــــیاسەنی، بــــێ قــــیاسەنی
مــــــیرزا! بــــێ نەزیر، بــــێ قــیاسەنی
ئــــوستاد دانــــای، خــــەیاڵ خــــاسەنی
چــــون ســـەرو ســەرتەڵ، ڕێكو ڕاسـەنی
مــــــەرد مــــــوبارز، بــــێ گــــەزافــەنی
شــــێر شــــێرشکێن، هــــەر مــــەسافەنی
شــــــارەزای ئــــەوزاع بــــەڵاو کــۆسەنی
خەیرخــوای مــللەتو، وەتــەن دۆســەنی
بــــــا حــــــوسن‌نییەت، مــــەردم‌دارەنــــی
قــــــازی قــــــەزاوەت دێــــــهو شــــارەنی
بــــا ســــەفاو ســـفەت، بــاکــــردارەنــــی
بـا مـهرو مـووبەت، خـوەش گـوفتارەنی
دارا ئــــــوبوهەت وەقــــــرو شــــــەرەفی
ســــــپەرو قــــــەڵخان، تــــــیر تــــەرەفی
بــــا جــــوودو ســەخاو، لوتــفـو کــەرەمی
مــــــەحرەم ئــــــەسرار، ڕاز حــــــەرەمی
خاستر لە خانان، سفرەو خـوانت هـەس
بــۆ مــەردم‌داری، دیــواخــانت هــەس

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی بۆ یەکێ لە دۆسانی نووسیوە.

عـالمی بـۆ وەخت كـارت بـۆ عـەمەل
عـەمەڵت خـەیرەن، دوورەن لە خـەلەل
ئـومێدەوارم، هـەر بـێ نـیاز بـای
هـەر وا مـەردمدار، دەروازە واز بـای
بـا یـومن‌و نگـین، فـەڕو ئـیقباڵ بـای
«مـەحبوب القـلوب»، مـاڵ و مـناڵ بـای
مەخسوس «حەمیدە» هیممەت بەخشتەن
سـەرمایەی نشـات، پـڕ لە نـەخشتەن
هـامسەر دڵسـۆز، دڵ نـەوازتـەن
نـازكێش نـازار، شـەكـەرڕازتـەن
هـاممەیل‌و مـەرام، هـام خـەیاڵتەن
قـوەی قـەلب‌و گـیان، چـرای مـاڵتەن
دەست‌و پـسا شـێل‌و، جـەفاكـێشتەن
مـەڵهەم زام‌و، زووخ‌و ئـێشتەن
ڕەفـیق شـەفیق، هـامسەفەرتەن
بـۆهەر سـەردو گـەرم، ئـابای بـەرتەن[1]
ڕەونـەق مـاڵ‌و، شـێوەو ڕەنگـتەن
هـامشەورو سـەڵای، وەخت تـەنگتەن
تۆ خوەت چون خەسرەو، ئەو شـیرینتەن
هـامدەم، هـامنشین، هـام قـەرینتەن
سـەوڵ سـایەدار سـاحێب سـایەتەن
بـاعس حـەیات‌و مـایەو پـایەتەن

١- ئیشارە بە ئایەی (١٨٧، بقرە)، هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ و أَنتمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ.

ئــــەنیس و مـــوونس، شـــەوبێداریـــتەن
بـــــاغ مـــــیوەی عشـــــق، یـــادگاریتەن
حاتەم خـوّی خـەیاڵ، شیرین تـەبیعەت
شـــارەزای ئـــەوزاع عـــیلم شـــەریعەت
هـەر کـارێ کـەردی وە مـەردی کـەردی
گۆی مەردی لە بەین هـامفەردان بـەردی
زانـــــای پـــایە بـــەرز، ڕووی ئـــەیامەنی
ڕەهــــنمای ڕاســـی، خـــاس‌و عـــامەنی
پـــدەر بـــەر پـــدەر، عـــولەمای ئـەعلام
بـــاشەئن‌و شـــەرەف، مـــەرتەبەو مـــەقام
بـــە نـــام نـــامیت، ئـــەسیل‌و نـــەجیب
«نَـــصْرُ مِـــنَ اللهِ وَ فَـــتْحٌ قَـــرِیبْ»
«ئەحمەد» تا زنـدەی ڕووی سـەربساتەن
مـــیرزای ئـسازیزم، گـــیان وە فـــداتـــەن!



## بوزورگوارەنی

بـــوزورگوارەنـــی، بـــوزورگوارەنـــی
ســـەروەر عـــەزیز، بـــوزورگوارەنـــی
گوڵبوی گـوڵئەندام، گـوڵگـوفتارەنی
شـــیرینتەر لە گـــوڵ، نـــەوبەهارەنی
ســـومای بـــینایی دیـــدەی تـــارەنی
تـــەسکین دڵـــەی، پـــڕ جـــە خـــارەنی
دانـــەی جـــەواهـــر، گـــرانبـــارەنی
پـــدەر بـــەر پـــدەر، بـــوزورگوارەنـــی
شـــەکـــەرین زوان، شـــیرین بـــەیانی
شکـــۆفەی شـــیرین، بـــاغ عـــرفانی
ڕاسـته بـەهاران، عـەتر گـوڵ خـوەشەن
کەی بەهار چون گوڵ، ڕەنگ تۆ گەشەن
بەهار چون ڕەنگت، کەی خوەش ڕەنگو بۆن
بەهار هـەر بـەهار، شـێوەی ڕەنگ تـۆن
بـــەهار شـــێوەت، ئـــەوەن پـــڕگوڵەن
گـــوڵ لە لەتـــافەت، لوتـــفت خـــجڵەن
پەژموردە نـەبۆ، غـونچەی سـەرچڵت
هـــەر شکـۆفا بـۆ، گـوڵباغچەی گـوڵت

حـــەیفە بـــەهارت، کـــەری وە پـــایز
بەهار کەی خوەشە، بێ شـێوەی ئـازیز
یــاخوا شـاداب‌و، شـادو بێ‌غەم بـای
مدام چون بەهار، سـەبزو خـوڕەم بـای
بــــەهار ئــــازادی، پــڕ لە ئـومیدەن
ئـومیدەوار بــەر، عـەیدت سـەعیدەن
بــە مــوبارەکــی، سـوورەی «تـبارك»
«تــبارك‌الله»، عـــەیدت مـــوبارەك



## نامەی مامۆستا «سەیید تاهیری هاشمی»
## بۆ «میرزا ئەحمەدی داواشی»

پــڕ جــە نـۆشەکـەت، پـڕجە نـۆشەکـەت
«ئەحمەد» نـامەکـەی پـڕ جـە نـۆشەکـەت
نــەتیجەی ســەهبای تــازە جـۆشەکـەت
ڕەشحەی خـامەکـەی مـەی فـرۆشەکـەت
مــەزموونش غــارەت دەیـرو هـۆشەکـەم
یــانیهای مـــەتلەع سـیا پـۆشەکــەم
یاواو خاس وانـام یـەك یـەك فـەردەکـەت
فەردەکەی شیرین گشت بێ گـەردەکـەت
نــمەز جــە تـەئسیر سەهبای تـەبع وێت
چـــەنی حـــاڵ مـــن نــیاوان وە ڕێت
ڕەشحەی پڕ نەشئەی خامەی مەستی خێز
تـــەئـیر پـــڕ شـــوور نـامەی بـادەبێز
تـــازە کـــەردەوە دەورەی جــوانــیم
هـــۆر داوە پـــەردەی ڕاز نـــەهانیم
جـــەشنۆی ڕازان ســـەر نـــە پـەردەوە
تـــەن ســـەنگینی کـەرد دڵ ویــردەوە
جــە خــاوو خــەلسەو ڕابـطەی مـەستی
لادی ئــازاد بـیم جــە قــەید هــەستی
دیــم ئـەرواى زومـرەی شـیرین گـوفتاران
نـــامی دانـــایان ڕووی ڕۆزگـــاران

ویـــنەی مــامۆسای «بـێساران» مـەنزڵ
هەم «ترکە» و «حەیدەر» «خانای» داخ نە دڵ
«شاکەی» وش مەزموون چەنی «مەنسوورخان»
«ئـەڵماس» پـڕ شـەوق «شـەفی» نـوکتەزان
مەلاکەی «گۆران» «یاقووی» سوخەنسەنج
«مەهجووری» دڵتەنگ «وێسووی» مایە ڕەنج
«قادر» و «بولبوڵ» «مەڵکە»ی، مەینەت کێش
داخی و داخ نە جەرگ «سەیدی» دەروون ڕێش
مــەلاکـەی «کـڵاش» دێـوانـەی پـەروەی
یا نـە جـە شـۆڵەی شـەمان چـەپەی نـەی
«کۆماسی» و «مەحزوون»، «شـێخسازانـی»
«حـــەبیب» و «سـەلیم» «فـەهیم» و «فـانی»
چـــمان ئـــیبتیدای بـــەزم نسۆشانەن
یـــا خـــەیر ڕەســـتاخیز واتـەی تـۆشانەن
خـــەیر تـــۆم وەفـــات نـــە دڵ مـــەکـاران
قـــــەدرزانــــی تـــۆ وە چـــەم مـــەداران
پـەی چـێش تـا بـولبوڵ تـەبعشان پـەرواز
کەرد نـە شـاخەی گـوڵ هـۆردار لە ئـاواز
ئەر سەد پرووزیای شـۆڵەی مـەینەت بـین
ئەر سەد ساحیب شەرت وەفاو بەینەت بین
پـــای دڵ گـــیرۆدە نـــە تـــۆڕداو عـــەشق
مەگێڵان وێـنەی «قـەیس» مـەینەت مـەشق
بــــەردە بـــی زاری ســـۆمای دیـــدەشان
خـــەفەت کـــەردە بـــی قـــەد خـــەمیدەشان

بـــەڵام جـــە ئـــاداب عـــەشق مـــەجازی
نەکـەردەن چـون تـۆ سـوخەن پـەردازی
حـــەقەن جـــەم بـــەستەن جـەگـردین لاوە
دڵ بـــە ئـــافەرین لێـــو بـــە سـەناوە
بـــەڵێ هـــەی دەروون گـــەنجینەی ڕازان!
دڵ نشـــانەی تـــیر نـــاوەك ئـــەندازان
بـــۆ وەگـــیان وێـــم هـــەم وە مـــەرگ وێت
قە بووڵ کەر چەنیم چێوێ ماچوون پێت
حـــەیفەن ئـــی گـــردین دوڕو مـــەرجـــانە
ئـــەڵماس و یـــاقووت مـــرواری و دانـــە
نـــیمێ نـــە مـــەخزەن سینەت مـــەدفوونەن
نـــیمێتر کـــەفتەی ســـارا و هـــاموونەن
پـــەی ئـــی خـــەزانـــەی خـــەمان پـرڕازە
ســـندووقێ نـــە چـــۆی مـــۆبەت بســـازە
تـــا ئـــەرگـــیان تـــەسلیم دەور ساقی بـۆ
نـــامت نـــە ســـەفحەی دەوران بـــاقی بـۆ
«تـــاهر» مـــەکـــیانۆ ســـەفاو ســـەلامت
مـــەستەن جـــە نـەشئەی بـادەی کـەلامت



تاهر هاشمی

١٣٤٠/١٢/١٦ ی هەتاوی

## نامەی «میرزا ئەحمەدی داواشی بۆ «مامۆستا سەیید تاهیر هاشمی»

قـەسەمت وەردەن وە دیـدەی یـاران
وە کـێش کـەمەند گـیسووی نـازاران
بـە شـەوق ڕوخسـار گـوناگـوڵناران
بـە نـازکی نـاز سـیمین عـوزاران
بـە لەنـجەو لارەی نـزاکـەتداران
وە شـەرتو وە شـۆن شـای وەفـاداران
بە ئـیشو وە نـێش جـەرگەی دڵـداران
بـە ئـینتزاری سـەباو ئـێواران
وە بەیزای بلوور جـەمین چـون جـامان
وە قـەدو قـامەت بـاڵانەمامان
وە ئـەتوار نـاز نـازك کـەلامان
سـا چـەن مـەقبووڵەن نـازش جـەلامان
مـاچی یـە مـایەی دڵ سـەردیمانەن
یـە ئـاخر نـامەی هـام فـەردی مـانەن
«لوقـمان» کـاران «سـەحبان» سـانی
کـاتب المکـتوب کـەنز مـەعانی
هـیچ کـام نـەمەندەن پـێمان ئـەحواڵێ
ئاخ! من پەی سەوزە، داخ! تۆ پەی کاڵێ
بـە شـۆخی شـێوەی کـاڵ تـۆ قـەسەم
وە فـریفتەگـی حـاڵ تـۆ قـەسەم

وە ئەندووهناکی عەرزەی ویـم قـەسەم
وە خاڵ ژێر لێو سـەوزەی ویـم قـەسەم
هەر تـا نـەنیەران لاشـەی مـن وە قـەور
نــەڕێزان وەنــەم خــاك گـڵ وە جـەور
نــە ڕای لوام بــۆ نــە ئامان وە پـەس
نەزانۆ وە حاڵ جەستەی من هیچ کـەس
تــا نــەبۆ خــامۆش بــەزم یــارانــم
نــــەشنەوان تــانە جــە ئــەغیارانــم
ســا نــەبۆ ســامان ئـەساسەی فـەردم
شین نەکەن شـۆخان جـە نـاڵای دەردم
تا سەوزەم ڕوخسار وێش وە سەرناخوون
وە ڕووی ڕەختمدا نەکەرۆ گـوڵ گـوون
تــا هــۆر نـەگـێران خـوێش و بـێگانە
لەشم وە پای تـەخت مـەردەشۆرخـانە
غــاسڵ نــەدۆ غـوسڵ وە ئـاو ئـوقبام
قــەتع نــەبۆ ئــومێد زنــدەگــی لەلام
هــەرتا نــەپیچۆن وە ســفید بــەرگم
بــەرز نــەبۆ لە عــام ئـاوازەی مـەرگم
هـــەرتا هــامسەران نــەیان لە دەورم
نەنیەران چون شـاه وە تـەخت جـەورم
تـا هـۆر نـەگـێران تـابووت یـا تـەرمم
خوشك نەبۆ چون چۆ ئی ئەعزای نەرمم
فــاتحە نــەدۆن وە مــەجمووع یـاران
باز نەشۆ وە جای ویش ڕۆح چون جاران

تـا بـینی وە سـەنگ ئـەڵحەد نـەماڵم
نـەکـەرۆن پـەرسا ئـەو ڕۆ ئـەحواڵـم
دەست بەردار نیەم مـن جـە کـۆتەریت
شەرتە بـاز نـەکـەم کـەمەر نـۆکـەریت
یــەکـسیٚوەن بـاتن چـەنی زاهـرم
«ئەحمەد»م بەندەی ئـا «سـەید تـاهر»م



٢٠/١٢/١٣٤٠ی هەتاوی
میرزا ئەحمدی داواشی

## سولتان دەعوەتم کەرد وە «ڕوانسەر»

«سولتان»[١] دەعوەتم، کەرد وە «ڕوانسەر»
دیم کە «ڕوانسەر»، لە پا تا وە سەر
مونەقەش کریان، بە دێبای ڕەنگین
خاستەر لە دێبای «ڕۆم» و «هند» و «چین»
خوردو کەلانو، ئناس و زوکوور
گشت لە شادی و شوور، غەرقن لە سروور
«قولە» چون جاران، دەماغش بەرزەن
هەر ساتێ سەفاش وە هەزار تەرزەن
«هێلەوڕ» وا بەرگ، شادی وێش پۆشان
لە شادی وە ئەوج، فەڵەك سەرکێشان
«قەلاگە»[٢] نیان تاج زەڕ وە سەر
زندە کەرد ئایین، «زردشت» ئازەر
دەهۆڵ کەڕ ئەکات، مەلەك لە فەڵەك
فەڵەك ئەکات سەیر، خشپەی ڕەش بەڵەك
«سولتان عەلی خان»، فەهمیدەی فازڵ
بەشیرین شیرین لەب بازکەرد چون گوڵ
منیچ وە ئاگر عەشق و دڵداری
گەش و ڕۆشن وەك گۆنای گوڵناری

١- «سولتان عەلی خان ئەردەلان».
٢- «قولە» و «هێلەوڕ» و «قەلاگە» ناوی سێ کێون لە پشتی «سەراو»ی «ڕوانسەر» کە «هێلەوڕ» زۆر بەرزترەو لە باکووری شارەوە قەراری گرتووە.

پەی یاران وەندم شێعری دیاری
تا هەر سووزان بان پەی یادگاری



## زام غونچەی گوڵ[1]

«میرزا لطفاله»، تازە ڕەسیدە
نامەکەت نیام، وە بان دیدە
«لطفاله» لوتف نامەت لەتیف بی
شێعرت شیرین‌و، شیوا و شەریف بی
تازە بۆی بادەی، کەماڵت کەردەن
بۆ کۆی عارفان، خەیاڵت کەردەن
نەکەفتی وە ناو، سەرمەستی مەستان
بوێنی بازار، جە مەی پەرستان
ئیمانت ئەدەی، وە بێ بەهانە
ئەکەفی وە ناو، دوردو[2] پەیمانە
قەلەندەر[3] ئاسا، فام ئەدەی لە دەس
چون من دێوانەی، تا حەیاتت هەس
ڕاسە چون بولبوڵ، پەی ئەو غونچەی گوڵ
تازە نەشکوفتە، داخت چوو لە دڵ

١- نامەو سەرەخۆشی بۆ ئاغەی «لطفاله صید احمدی» خەڵکی گوندی «بەدراوای» «ڕوانسەر» بە بۆنەی کوچی دوایی ئەوەل منداڵی بەکۆرپەیی.
٢- ئەوەی لە شەراب تانشین دەبێ.
٣- پیاوی تەنیاو بێ قەید لە دنیا، دەروێش، عەبداڵ.

چەن کەسان چون تۆ دڵ داخ دەردەن
هەزاران هەزار ڕۆڵەشان مەردەن
باز هەم چرای شەوق شادیشان گڕان
پەردەی غەم و تەم وە شادی شڕان[1]
ئومێدەوارم دنیات وە دڵ بۆ
مرادو مەتڵەب دڵت حاسڵ بۆ
بولبوڵی دڵت فارغ لە ئێش بۆ
زام غونچەی گوڵ دڵت سارێش بۆ
خوەت بدەی ئەجرش فەرد فەریادڕەس
بدەر وە دەستش ئاواتیش وە دەس



١- دڕان، دڕاندن.

## موبارەکت بۆ کەردی عەرووسی

شـــــنەفتم ئـــاغە وە تـــەندرووسی
مـــوبارەکت بـــۆ کـــەردی عـــەرووسی
یـــومن و ئـــیقبال و فـــەڕو نگـــینت
شـــیرین‌تەر مـــەبۆ چـــەنی شـــیرینت
ئەو غونچەی سەرچڵ حـوسن زەرافـەت
پەروەردەی عسمەت باغچەی شەرافـەت
هـــەر دوو هـــام‌تەراز مـــیزان و عـــەدڵن
تـــان‌و پـــۆ خـــالس هـــەورێشم ئـــەسڵن
وەیـــومن‌و نگـــین وە فـــەڕو ئـــیقباڵ
وە خـــوەش بـویاران تـا وە هـەزار ساڵ
فـــریشتەی خـــەیرت هـــاورد وە مـــاڵت
ڕەونـــەقەن بـــۆ شـــەئن شکـۆو جـەلاڵت
ئـــەسیل پـــەیوەن لە هـــەر دوو ســـەرەن
ئـــومێدەوار بـــەر ســـاحێب ســـەمەرەن
یـــا شـــای خـــوەراســـان دامـەنی پـڕبۆ
پای خەیر وێت بۆ خان دایك حەفت کوڕ بۆ
پـــەژموردە نـــەبۆ غـــونچەی ســـەرچـڵت
چون بولبوڵ مەست بای وە عەتر گـوڵت

★ ★ ★

## دڵ مەدەر بەدوان

دڵ بــدەر بــە یــۆ مــەدەر بــە دوان
دڵ بــە دوو کــەس دەر مــەبۆ پــەشیمان
عــاشقی «الله» لایــق بــە ئــەو کــەس
یەك مەعشووقش بۆ لە ڕووی دنیاو بەس
نەك وێــنەی چــۆپی لە دنــیای عــەبەس
هــەر کــەسێ ســاتێ بگــێڕۆش وە دەس



## ئامیرزا نامەت

ئـــامیرزا نـــامەت، ئـامیرزا نـامەت
یـــاوا پـــێم وانـــام، ئـامیرزا نـامەت
نـەشە بـیم وە شـەهد، شـیرینی خـامەت
مەلهەم بی ئـازیز، پـەی شـەفای زامـەت
نـــامەت نـــەزانـیت، وانـــامو زانـــام
بە دەرکـێ کـەردی، وە سـەرگەردت بـام
مەمنوون بیم وە لوتـف، بـوزورگەواریت
جـــە مـــەغز نـــەغزو، زات هـــۆشیاریت
زام کـــۆنەو نـــۆم، یـــەکســـەر تـازە بـی
دەرد لە بـــان دەرد، بـــێ ئـــەنازە بـــی
ئـــاگـــر لە کـــۆرەی، دەروونـــم جـــۆشا
دوود هـــــەناسەم، ڕووی ســـەما پـــۆشا
بـــڵێسەش بـــەرز بـی، وە بـەرزی کـاوان
یـــانێ بـــۆی بـــۆسۆش، وە تـۆ نـیاوان؟
گـــیانم بـــەئێد بـــی، نـــامەت پـێم یـاوا
قـــوڵف قـــاپی عـــەشق، شـادیم شکـاوا
بۆی عەتر نامەت، بەو تەور خوەشم کەرد
جە خوەشیت خوەش‌و، نەشەو گەشم کەرد
مـــەڵهەم دای وە دەرد، بـێ دەرمـانەکـەم
بـــی بـــە ڕاحـــەتی، نـــیمە گـــیانەکـــەم

دەست دەرد نەکا، ئوستای عەزیزم
تەبدیل وە بەهار، کەردی پایزم
زەحمەت وە شەماڵ، دادە بیت وەمەیل
کیانابیت وە لای، بەندەی خاترکەیل
قوله وە قوله، کۆکۆ کاو وە کاو
چەمەن وە چەمەن، سەراو وە سەراو
باهوو وە باهوو، لەیلاخ وە لەیلاخ
تەی کەردە هەڵەت، سەخت شاخ و داخ
«سەفی ئاوا» و «سەرۆ»، تا وە «توورکەپان»
سارای «بیاشۆش»، «کەڵێ»[1] و «مافیران»
بەرزی «تەیمەزیەگ»[2]، چیەی «چل یاران»[3]
وە «کانی خەیران»[4] ئاما چون جاران
نامەکەی نامی، هام فەردەکەی فەرد
دا وە دەسمەوە، موتالعەم کەرد
گۆی مەردی لە بەین، مەردان بەردە بیت
تەعریف لە بەندەی، بەندەت کەردە بیت
کەی من وا مەوسووف، بە ئی سفاتم
کەی من شایستەی، ئی تەعریفاتم
هەر تۆ شایستەی، وەسفی چون بولبوڵ
چون مەدام مەستی، وە بۆی عەتر گوڵ

---

١- هەموو گوندەکان کە لەم بەیتەدا هاتووە سەر بە شاری «جوانرۆ»یە.
٢-کێوێکە لە ئاوایی «کەڵێ»و «مراوا» قەراری گرتووە.
٣-کێوی بەرامبەری لادێی «کانی خەیران».
٤- ماوای «میرزا ئەحمەدی داواشی» سەر بە شاری «ڕوانسەر».

مــــن وەی کـــــرمۆڵیو، نـــاتوانـــیەوە
تـــۆ وەی جـــوانـــیو، خـــوەش زوانـــیەوە
تـــۆ هـــێمان جـــلووس، نـــۆجوانـــیتەن
وەخت وەفـــــاو مـــــەیل، مـــێهرەبانیتەن
هـــەرهای لە ســەودای، تـازە نـەوڕەسان
دین مەدەی وە دین، سەوزە و چاومەسان
منیچ یەك وەختێ، چـون تـۆ جـوان بـیم
کـــەڵ کـــەڵەهەرز، بـــەرزە کـــوان بـــیم
جـــــواو نـــــامەت،هـــا دام وە شـــەماڵ
بـــــاوەرۆ وە لای، دانــــــای پــــڕکەماڵ
هـــا کـــیاستم هـــات، دەردت لە مـــاڵم
چـــەم ئـــینتزار بـــەر، پـــەرێ شـــەماڵم
واتـــــم وە شـــەماڵ: بـــەدحاڵەن حـــاڵم
مــــازە لە حــــــەسرەت، ئـــازیز بـــناڵم
جـــەخت کـەرە وە خـەیر، بشـۆ وە ڕاوە
نامەم دەر وە دەست، «موحەممەدنیا» وە
ئـــەمانەت فـــەرزەن، مـــن مـەدەم وە تـۆ
مـــدارات نـــەبۆ، بـــەن بـــەن کـــۆ وە کـــۆ
مـــدارات نـەبۆ، بـە وەخت و بـێوەخت
وێت بدەر وە قەلب، دەربەندان سـەخت
چـــــەی «چـــاڵاوە»، پشت «تـــاقەڕەش»
سەرکێشە خوەشە، سەیر کەر وە دڵخوەش
کۆپ «سووراوەڕێ»، «شینکۆ»، «خەلانە»
ســـەیر کـــەرە بـــدیە، ئـــەو گشت مـلانە

«مای شەوەر» «دەیلەم»، تا «خڕەسفید»
قەدیم شکارگای، «سەرداره ڕەشید»
«گوڵ کێ»و «بەورەوار»، نسارو هەتاو
شان «شەتی نوور»، سەرتەخت «ساناو»
حەسرەتش بڕیا، یاوا وە ئاوات
دای لە «هەسوونی»، بەرشی لە «کاوات»[1]
سارای «سامله»، «هەسێرەگولان»
بەند «بێڵەگی»، تا وە «ناوملان»
لە «عەزیم کوژیاگ»، تا وە «نیشان کرد»
مات مەبهووت بی، خاس دیا بە ورد
چە زیباو زینەت تازەشاری دی
چە شار «قەڵا»ی، پڕ نگاری دی
دیش «کانی خاڵ خاس»، باغ «هەڵانی»
تەفریحگای زومرەی، خانو خەوانی
دەوری دا لە دەور، شار «قەڵا»[2]وە
دیا وە «قەڵا»ی، خاکە تەڵاوە
نگا کەردو دیش، وەو مەنزەرەوە
ئازیز سەرکێشان، وە پەنجەرەوە
چون میرشکاران، وە بێ درەنگێ
شانا پەی شەماڵ، تاکە خەدەنگێ
مەنزوورش ناز بی، عەزمش جەنگ نەوی
پای شەماڵ وە تیر، نازش لەنگ نەوی

١- هەرکام لە ئەم شوێن و مەحاڵانە ناوی بەشێ لە کێوی «شاهۆ» یا دەوروبەری «شاهۆ»یە.
٢- مەبەست شاری «جوانرۆ» یە کە «قەڵای جوانرۆ»یشی پێ دەڵێن.

چە کەمەند کلاف، مشکین لە دۆشێ
شیرین چون «شیرین»، شەکەر فرۆشێ

چەرخ مەدا وە ناز، چەم وە جەلاوە
مەدیا وە قەلای، تازەی «قەلا»وە

سەوڵ سیم ئەندام، تووڵ تەلێ بی
سەوزەو نمەکی، چاو کەژەلی بی

وەختێ چون «شیرین» وە ناز مەخێزا
شیرینی «شیرین» «خوسرەو» مەبێزا

مەواتی غونچەن، ئەگەر چە گوڵەن
موعەممایەن، حەلش موشکڵەن

دارای وەڵەدەن، وەڵەد غەزاڵەن
بەچەئاهوویە، خوەش خەت و خاڵەن

سیرەت ساڵ دیدە، سەیادان پیرکەر
هێما وە ساوا، مەیۆ وە نەزەر

سەرو سەهی تەرز، توویا تەرکیبەن
تفەنگچی تەڕدەس، خەیلێ عەجیبەن

ئەگەر وە سووفار[1]، چاچی کەمانش[2]
بنیەرۆ خەدنگ، موژەی چەمانش

---

١- سووفار: بنی چێوی تیر کە بە ناوی کەمان دەیەخەن، میسال لە «نظامی»:

تا بە سوفار در زمین شد غرق — پیش تیری چنان چە درع و چە درق

٢- چاچی: نیسبەتە بە لای «چاچ» کە نێوی ڕابردووی شاری «تاشکند» یا «کاشغر» بووە وە لە ئەوێدا کەمانی زۆر چاکیان دروست کردوە، میسال لە «فِردوسی»:

«بمالید چاچی کمان را بدست — به چرم گَوَزْن اندر آورد دست»

ئەر بدۆ لە کاو، کۆی سەخت «شاوە»[١]

مەدۆزۆ «شمشێر»[٢]، مەسۆزۆ «پاوە»[٣]

شیرین تەر لە گوڵ، هەنار ساوا

زەردی گەردەن وەك، زەردی خوەراوا

چەم چون ستارەی، شەعرای «یەمانی»

پرشنگ مەشانۆ، شەو تا بەیانی

گوڵ «سۆسەن» سادار، سیمای شێوەشەن

«شەقایق» لە شەوق، شێوەش لێوەشەن

«نەستەرەن» کەی وەك، باڵای ئەو ڕاسەن

«یاس» و «یاسەمەن»، کەی عەترش پاسەن

بولبوڵ مونتەزیر، قەدەم ڕەنجەشەن

شمشاد دڵ حەسرەت، دەست و پەنجەشەن

یاخوار هەر خوەش وێت، ئەو دەس و پەنجە!

نەوێنی لە دەور، دنیای دوون ڕەنجە!

وە گیان «ئەحمەد»، «موحەممەدنیا»[٤]

نیەن ناپەیدان، لە دەور دنیا



---

١- کێوی «شاهۆ».

٢- ئاوایی سەربەشاری پاوە.

٣- شاری «پاوە».

٤- کوڕی سۆفی «ئەحمەد» خەڵکی شاری «جوانرۆ».

## ئیمشەو

چون گوڵ لە ناو، مەحفڵمان ئیمشەو
سەوز بیتو نیشتی، لە دڵمان ئیمشەو
یاد عارفان، کامڵان ئیمشەو
دێوانە مەکەرد، عاقڵان ئیمشەو
نەوای سازو سۆز، بە دڵان ئیمشەو
لوتف لەتافەت، بۆ گوڵان ئیمشەو
سەبا سەفاش دا، دەماغمان ئیمشەو
ڕەوشەن کەرد وە نوور، چراغمان ئیمشەو
لە ڕەشحەی نەشەی، ئیسلامی ئیمشەو
لە جموجۆش بین، چون جامی ئیمشەو
گەرم بی بازار، عەتتاری ئیمشەو
بێزیا گوڵان، بەهاری ئیمشەو



## نامەی مامۆستا شێخ «موحەممە سەعید»ی نەقشبەندی بۆ«میرزا ئەحمەدی داواشی»

کاکە میرزا گیان، بێ تاقەت نەوی
لە بەر نەبوونم، لە زامەت نەوی
چونکە پەراسووم، کەمێ ئێش ئەکا
هەروا پشتیچم، ئێشی ڕێش ئەکا
لێم عاجز نەوی، لە خزمەت دوورم
لە فەیز حوزوور، کەمێ بێ نوورم
مەشهوورە عوزریش قەبووڵە لای ناس
کام‌ناس؟ ئەو ناسە ئەوە خیرُالناس
مەعنای ڕەفاقەت ئەر باتنی وێ
کەمێکی لە عشق ئەر چاشنی‌وێ
دوور لە نزیکی، نزیك‌تر ئەبێ
ئەم لە فەیزی ئەو شەریك‌تر ئەبێ
مسافەی دووری، نامێنێ لە بەین
یەك‌تر ئەوێنن وەکوو علم عەین
ڕۆژێ «لەیلای» زار فەسدی باڵ ئەکات
لە خوەی شکاتی بەدی حاڵ ئەکات
خوێن گر ئشارەی نەشتەری لێ کرد
خوێنی هاتنی لە ئەو پەیدا کرد
«مەجنوونی» شیفتەی دەردی عیشقی «لەیل»
دڵ لە زاری و دەرد نامرادی کەیل

لە عــەینی جـێدا خـوێن فـوارەی کـرد
تــەئسیری عشــق و وەهــا پـارەی کـرد
مــــؤمن یــەکــێکن حــەدیسی تــیایە
یــەکــی و یــەك دەردی ئـەسڵی وەفـایە
تــــوولی تسێ نــادەم هــمەتم ئــەوێ
قــەزای دۆسـێ خـاس لە عـالەم کـەوێ



«موحەممەد سەعید نەقشبەندی»

«مراوا»

## وڵامی «میرزا ئەحمەدی داواشی»
## بۆ «شێخ موحەممەد سەعید نەقشبەندی»

بــــوزرگوارەکـــــەم، بــوزرگوارە کــەم
ســــەروەر عـــــەزیز بــوزرگوارە کــەم
گـوڵبوی گـوڵئەندام گـوڵگـوفتارەکـەم
عـــــەزیزتر لە گــــوڵ نــەوبەهارە کــەم
تــــەسەلای دڵــەی، پــڕ پــەژارە کــەم
ســــۆمای بــینایی، دیــدە تــارەکــەم
یــــاوا پـــێم نــامەی، مــوعەنبەرینت
وانــام عــبارەت یــەك یــەك شــیرینت
شــــادم کــــەرد نــامەی پــڕبەشارەتت
بــە شــیوای شیرین خــوەش عبارەتت
زیــــارەتم کــەرد هــەر تــا کــە تــاوام
بـــۆسام و وەبــان دو دیــدەم ســاوام
چــەنی گــدایــە لوتـف شاهیت کـەرد
وە بوزرگی وێت، عوزرخـواهـیت کـەرد
دانـــەی قـــیمەتیت، دوڕ شــەهواریت
پــــدەر بــــەر پــدەر، بــوزرگەواریت
دانـــەی پـــڕ بــەهای گــران قــیمەتی
دارا کــــەرامـات، ســاحێب هــیمەتی
شێر بەچەی نەخشی، بێشەی عـوسمانی
غــــەواس دانـــای، بــــەحر عــرفانی

تــــۆ تــــاقەتدار و مــــن بــی‌تاقەتم
کـــەی مـــن شـــایستە بـــۆ ڕەفـــاقەتم؟
مـــن عـــەوام ســـرف، ڕمسووز نـــەزانـم
عـــامی حـــاڵیم کـــە، دەردت لەگـــیانم
تۆ شێخ ئیرشاد، مـن کـەی «مـەولەوی»م
کـــەی مـــن ئـــاشنای، ڕەمـز مـەعنەویم
بۆت وە عەمەڵ بێ، عومدەی ئـارەزووت
شـــفا یـــافتە بـــێ پشت و پـــەراسـووت
فەرمابیت: «لەیلی» فـەمد بـاڵی ئـەکـرد
لە خوەی شکایەت بەدی حـاڵی ئـەکـرد
مـنیش یـەك کـەمێ فشـارخـوونم هـەس
شەیدا چون «مەجنوون»، حاڵ جنوونم هەس
فدات بام قوربان، لە ڕووی وەفا و مـەیل
خوێنگیر چون نەشتەر، دا وە باڵ «لەیـل»
وێت بـەر وە خـوێنگیر، دەردت لە مـاڵم
ئـــیشارەی نـــەشتەر، بکـــەر وە بـــاڵم
دەفـــع زخـــوومەت، خـــوێن تـــاڵمکەر
چون ساحێب حاڵێ، حاڵ وە حاڵم کـەر
«ئەحمەد» ئەرچە دوور، ڕۆحش جە لاتەن
تـــووتیای[1] دیـــدەش، غـــوبار پـــاتەن



---

١- سرمە ـ کل.

## وڵامی «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «سەعید وەزیری»

قوربان لە دووریت تاقەتم تاقەن
دڵ نە گێج مەوج دەریای فەراقەن
ئەوەن ئارەزۆی دین تۆ داروومم
وەختەن جە دووریت گیان بسپارووم
ڕەویەی بوزرگی وێت بە راه بەردی
هەی یادت وە خەیر وا یادم کەردی
ئەی کاش من و تۆ جارێ‌تەر وە دڵ
بچین وە قاپی موورشید کامڵ
سەر لە ئاستانەش سەرفەرازکەریم
قاپی فەیز لەڕووی وێمان وازکەریم
مەجلسمان دارای فەڕو زینەت بۆ
موبارەك وە لوتف ساحێب هیمەت بۆ
شەوچەرەی شەومان فەرموودەی شێخ بۆ
حەیفەن گیان لە ڕای ئەمرش درێخ بۆ
حەوز و حەیات و گوڵباغچەی گوڵش
بۆی بەهەشت مەدۆ ماوا و مەنزڵش
ئەو خەتم خوتبەو ئیلتجاو ئەوراد
ماوەران ڕۆی مەرگ تا مەحشەر وە یاد
موفتی و قازی و عولەمای ئەعلام
سەیدو شێخ‌و خەلیفە و عەوام

یــەك ڕوو یــەك ڕەنگـن لە ئـەو ئـاستانە
شـێخ مـاچی شـەمعەو ئـەوان پـەروانـە
ئـەو پـاركو ویـلای قـەسر بـێ قـوسوور
مـونەقەش وە نـەقش شـاهانە دەسـتوور
فەرشەن بە مـەفرەش مـوخەتای ڕەنگـین
مەر قەسر «خاقان» یا «فەخفوور» «چـین»
قـــەرینش نـــیەن لە مـاە تـا مـاهی
نـەنشتەن لە تـەخت شـاهێ بـە شـاهی
ئـەحیانەن ئـازیز ئـەر تـەشریف بـەردی
زیـــارەت زات پـــاك ئـــەو كـــەردی
وەرە لە جـای مـن خـاك حـەوشەكـەش
چەن جار نمك یەك جار ماچ كەركەوشەكەش
عـــەلامەی دەهـــر فـــازڵ شـــەهیر
«حـــاجی مـــامۆسای» پـاوە بـێ نەزیر
«ئـەرستوو» سـەرسام فكـرو هـۆشـەن
«ئەفلاتوون» غـولام خـەرقەی دۆشـەن
هـەر پـابەرجـا بـۆ دانـەی قـەدیمش
ئینشا و ئیملا و خەت مـەلا «كـەریمش»
«ئـەحمەد» تـا لە دەور دنـیا زنـدە بـۆ
هەر «سەعید» خواجە و «ئەحمەد» بەندە بۆ

★ ★ ★

## یا واپێم نامەی ...[١]

یـــاوا پـــێم نـــامەی، مــوعەنبەرینت
وانـــام عـــیبارەت، یـەك یـەك شـیرینت
یەك یەك چون دانەی، دوڕ نشانیت کەرد
لە باغچەی ئەدەب، گوڵ ئەفشانیت کەرد
کێ بۆ وێـنەی تـۆ سـاحێب قـەڵەم بـۆ
دەست و قـــەڵەمت، هـــەر بێ ئەڵەم بـۆ
حـــەقیقەت قـوربان، بـوزرگی کـەردی
دڵ نـە گـێج مـەوج، غـەم بـەرئاوەردی
نـۆشای پـێم بـادەی، شـیرین خـەیاڵی
بـەر کـــەردی لە دەم دەروونـــم تـــاڵی
پینەت کەرد پارەی ئەعزای جەستەکـەم
دەوا دای وە زام، تـــۆ نـــەبەستەکـــەم
تـــەسکین دای بـە دڵ، پـڕزوخاوەکـەم
خەو بەخشای وە چاو شەو بێ خاوەکەم
زندەت کەرد ڕیشەی، گیای زەوقـەکـەم
شۆڵە دای وە شەم، عەشق و شەوقەکـەم
خاس لێت حاڵی بی، یـەند دەردنـاکـم
پـەی فـەوت کـاکـەی تـاکـم هـیلاکـم

١- لە جوابی نامەی یەکێ لە دۆسان دا بە ناوی مەلامحیەدینی ساڵحی کە بۆ فەوتی شاعێری پایە بەرز «سیف‌الله یعقوبی» سە رە خوەشی بە میرزا ئەحمەد گوتورە.

مەر چون دێوانان، هەر کاو و کۆ کەم
بدەم وە سەردا و هەرکاکەڕۆکەم
ئەو خەت و ئیملاو، ئینشا و عیبارەت
تەسەلی دا پێم، غەم بەرد وە غارەت
گلەگی لە چەرخ، بێوەفا کەردی
بێلوتفیت فەرموو تەشریف ناوەردی
من هەم حازر بیم، پەی پەزێرایی
چەنی هەم هەر دوو خوایی نە خوایی
تەشریف وە مەنزڵ، کاکە مەوەردیم
بادەی مەعنەوی، فەردش مەوەردیم
مەنیشتیم وە هەم، وە ئارەزۆوە
مەکەردیم غونچەی، فەردش وە بۆوە
ئارێ دانشمەند، دانای ڕۆزگار
لە بێوەفایی، مەبەر دڵ ئازار
بەی تەورەن گەردش، چەرخ پڕستەم
نمازۆ[1] تا سەر، دو مەیل چەنی هەم
لە تۆی بۆتەی قاڵ وە ئامێتەوە
وە ئاواتەوە بتاوێتەوە
هەرکار لە دونیا، «حسب المرام» بۆ
نەقسەن پەرێ چەرخ، تا سەر تەمام بۆ
باش باڵادەس، نازك خەیاڵان
سەڕاف دانەی ساحێب کەماڵان

---

١- ناهێڵێ.

یـــەك یـــەك دانــایان، دەور زەمـــانە
بــا فــەزڵ و ئــەدەب، ڕوتــبە و نـیشانە
دانــا و دانشــمەند، کـان کـۆی کـەماڵ
ســینە خــەزانــەی دوڕ و دانــە و لاڵ
خاك چون ئەژدەهای، سەمی سەهمناك
گشت کێشا وەکام، بەرد و کەرد وە خاك
شایستەگیم کـۆن بـووم وە هـامفەردت
بـــنووسم فـــەردێ، دەوا کــا دەرت
ئــەحیانەن ئـازیز، ئـەگـەر مـن مـەردم
گیان فیدای وەفـای بـا سـەفات کـەردم
وە خـــەتت فـــەردێ، لە ســـەر مـەزارم
بـنووس پـەی تـەخفیف، سـزاو ئـازارم
مەر ئەوسا «ئەحمەد» ساکن بۆ دەردش
وە خەتت[1] جەم بۆ، مەجموعەی فەردش



١- مەبەست خەتی جوانی مامۆستا «محی‌الدین صالحی» لە شوانکارەی «دەوڵەت ئاوای» «ڕوانسەر».

## شێعری بێنوختە[1] لە «میرزا ئەحمەدی داواشی»

سەلام کەردەوە، سەلام کەردەوە
ئای‌های دڵ هەوای، سەلام کەردەوە
دڵم ڕەعدئاسا، گرمە کەردەوە
وا کەردوە گەرد، کەرد وە هەردەوە
لە کوورەی دڵم، ئاگر مەوارا
واوارا، ئاگر وارا وە سارا
سەرسام، سام ئاوەر، سەحرا و کاو و کۆ
کڵاو وە کڵاو ئاسۆ وە ئاسۆ
سەراسەر سارای، دڵەی وە کوڵم
کوڵ مەدا وە کوڵ، لە دووری گوڵم
ئاما وە هەواڵ، دڵ وە ئاراوە
دوارە ئاو وە ئار، دڵم واراوە
مەڵهەم دای وە دەرد، کاری دەردەکەم
گەرمی دا دەرلاد، ئاهە سەردەکەم
لوولام لوول وەردم، وەك لوول لەولاو
وەك ئەوە سەد ساڵ، ئەو دووروێ لە ئاو
ڕۆحم دای وە دەم، سەم مارەوە
هاوارم هەڵسا وە هاوارەوە

---

١- هۆنەر ئەم نامەی لە جوابی «مەلا محی‌الدین صالحی» نووساوە کە لە خورەم ئاوای لوڕستاندا ژیاوە.

کــــێ طــــەی کــەرۆ ڕا وە ئــارامــەوە
وە ئـــــارام ئـــارام، دۆوە لامـــەوە
ئـــەر ئــەو گــوڵاڵەی، هــەڵاڵەی کــاڵە
ئـــەر ئــاما وە دەس، لە ئــەو مــەحاڵە
لەو کــۆگــای گــەوهەر، لەو لەعـل و دوڕە
وەك کــــوڕ دادڕە، لەو کـــاڵای[1] لوڕە



دەبـــــیر دانـــــای، داراتـــەدارەك
بــەهارت بــە خــەیر عــیدت مــوبارەك
سـەرشار و شـاداب، شـاد و بـێغەم بـای
مەدام چـون بـەهار، سـەبز و خـوڕەم بـای
یەند لێـم حـاڵی‌یەن، ئـەو ئـۆستای فـەردە
شـیفتەی کـەسێ وەن، بـێنوختە و گـەردە
نـەك وەك مـن ئـەوەن، وە زامـەت سـەختم
یــەك دانــە نــوختە کــەردەن بــەدبەختم
خاڵ خاڵ کەرد ئەو خاڵ، سەد خاڵ وست وە لێم
خــــەیاڵ بـــاقی، خـــاڵان نــەما پــێم

مانگی گوڵانی ١٣٥٣ ی هەتاوی کانی خێران ـ بناری شاهۆ
«میرزائەحمەدی داواشی»



---
١ - مەبەست کچی لوڕە لە «لوڕستان».

## مەرسیەلە «میرزا ئەحمەدی داواشی»
## بۆ «شێخ حسام‌الدّین»

کێت موحتاج نەکەرد، کێت موحتاج نەکەرد
لەڕاسی چەپ گەرد، کێت موحتاج نەکەرد
سکەی بەخت کێت، نارەواج نەکەرد
کێت موبتەڵای دەرد، بێ عیلاج نەکەرد
چەواشەن چەرخت، وە چەپ مەگەردی
مەردان رووی دەور، لەمەیدان بەردی
خان تا خەوانی، سەید تا وە شێخ
فەڵەك بنچینەی، کێت ناوەرد لە بێخ
خسووسەن ئەو قطب، «علی‌بن بَها»
هۆرکەندی لە رووی، تەخت چون شەهەنشا
پیر بێ نەزیر، رەوشەن‌زەمیر بی
پەی کەفتەکاران، هەر ئەو دەس‌گیر بی
جادار بەرحەق، «بَها الدّین» بی
سراج مونیر، رووی سەرزەمین بی
قطب رووی دەوران، وەخت و ئەیام بی
«شێخ المشایخ»، «غَوث المقام» بی
هەم باز شەش دانگ، شێر هوشیار بی
پیر تیرئەنداز، هەم میر شکار بی
هەم کەمەن ئەنداز، کافر وە زۆر کێش
هەم پیر سۆفی و هەم شێخ دەروێش

شای سەخاوەتدار، ساحێو سفره و خوان
مەشهوور مەعرووف، پیر «هەورامان»
خانەقا تەیار، تەکیەگا قەشەنگ
جە سەرای ئیسرار، بێ شنۆ و بێدەنگ
ئەبرۆ و پێشانیش، قاب قەوسەین بی
بێشك مەلائك، بێگوناو دەین بی
عەینش مەنەوەر، پەردەی حەرەم بی
گوڵ ڕوخسارش، ڕەوزەی ئەرەم بی
شەهد گوفتارش، ڕەوزەی ڕزوان بی
هەرکەس مەشنەواش، ساحێو ئیمان بی
هەم دینش سەیقەل، گوناباران بی
وێش جە گونا پاك، مینای یاران بی
«باخەکۆن» نشین، «خورماڵ»[1] ماوا بی
چون خوەر لە ڕووی چەرخ، ئەخزەر ئاوا بی
هەزار و سێسەد، پەنجاچەنی هەشت
موشەڕەفش کەرد، وە ڕەوزەی بەهەشت



١- باخەکۆن و خورماڵ دووگوند لەکوردستانی عێراق.

## شنۆی شەماڵێ بۆ «شێخ نصرالدین» «پاوە»[١]

شــــنۆی شــــەماڵێ، شــــنۆی شــــەماڵێ
یــــەکڕۆ دیــــم ئــــاما، شــــنۆی شــــەماڵێ
وێــــم بــــە وێــــمەوە، کــــەردم خــــەیاڵێ
قــەیس ئــاسا بــا لێش، پــەرسووم هــەواڵێ
دەس هــۆر دام دەرســات، دەم وە ســەناشۆ
نــــالاّم و کــــەفتم، جــــە ســــەرەڕاشــۆ
چــــەم وە ئــــەسرەوە، ڕەنگ وە گــــەردەوە
لەب وە بــــــــارەوە و دڵ وە دەردەوە
واتــــم: ئــــەی مأمــــوور، ئــــەمر ئــیلاهی
ســــەیارەی ســــەیاح، هــــەنت ئــــاگــاهی
مــــەشریق تــــا مــــەغریب، مــەدەی وە پــاوە
دایــــــم هــــــای لە ڕای، «کــــعبَةُ الله»وە
خــــەوەرێ لە تــــۆ، مــــەپەرسووم شــــەماڵ
ســــاتۆێچ بــــۆ بــــە زات، بــینای بــێزەواڵ
ئــــەرچــــی شــــەکــــەتی، ئــــامای وە ڕاوە
مــــەپەرسووم هــــەواڵ، ئــــازیز[٢] «پــــاوە»
دڵ جــــــە نــــــەدینش، بــــــێقەرار بــیەن
بــینایم پــــەی دیسن، دیــدەش تــار بــیەن

---

١- میرزا ئەحمەدی داواشی ئەم شێعرەی لەکاتی نەخوەشی شێخ نصرالدینی پاوەدا نووسیوە.

٢- مەبەست عارفی پلیە بەرز «شێخ نصرالدینی» پاوەیە.

مـــونتەزیرەنان، پــەی ئــامان ئــەو
دەســـمان بـــیاو بــه دامـــان ئــەو
دیــده بــه دیــدار، ویش ڕەوشــەن کــەرۆ
سەحرای «ماهیدەشت»[1] وە گوڵشەن کەرۆ
هەشت قـاپی بـەهەشت، لیـمان واز کـەرۆ
دەرویش و مــەنسووب، ســەرەفراز کـەرۆ
تــا ئــەرواحــمان، وە پــیشوازش شــۆ
ســـەر و مــاڵ و گــیان، پــایەنازش بسۆ
چـــەندیوەن شــــەماڵ، بــێخەوەرەنان
ویـــڵ و بـــێساحیو دەروەدەرەنـــان
ئــیسە جــه شــنۆی، ئــامای تـۆ شـەماڵ
هــا وەخــته سوورزیوم، بـووم وە زوخـاڵ
ئــامانت[2] ئیمجار، چـون جـاران نـیەن
مـــنباب خـــاتر، نـــازاران نـــیەن
مــوژدەت وە مــەرام، دەرویشـــان نــیەن
فــەرەحت پــەی قـەلب، دڵڕیشـان نـیەن
هــاژە و هــۆنەی شـەوق، شـەتاوت نـیەن
چــێشەن تـــەوانــای، جـــواوت نــیەن
یا دنـیات چـون مـن، تـۆیچ وە کـام نـیەن
حــەکــیمێ پـەی دەرد، شـفای زام نـیەن
ڕەقـــــیبان ئــــاسا، داوە جـــــواوم
بەدبەخت بۆ وە سـەخت، کـەردی کـەواوم

---

١- دەشتێکی زۆر پان و بەرینە کە لە «کرماشان» تا «ڕوانسەر» درێژەی هەیە.

٢- هاتنت.

وات: تۆ بەدبەخت بای، جە حەق نەتەرسای

هەوال ئازیز، جە من مەپەرسای

من هەم جەو بۆنۆ، خولقم وە تەنگ بی

لە پرسان تۆ، زوانم لەنگ بی

مەئموور بیم یەك ڕۆ، خێزام وێنەی تەیر

وە کاوانەدا، پەی وێم، کەرووم سەیر

بێخۆف جە ئەغیار، ڕەقیبی بەدگۆ

مەدام وە پاوە، سەحرا و کەش و کۆ

سەرشار و لاقەید، بێ خەم وە ڕاوە

ڕاگەم کەفت و شیم، وە شار «پاوە»

سەرسام بیم ساتێ، دیام وە «پاوە»

دیم زەڕەی شادیش، نیەن وە لاوە

دیم باخان یەکسەر، بێ پەرداخ بیەن

سەمەرشان یەکسەر، ئاخ و داخ بیەن

هانی «هەولی»[1] لێل «بی‌میری» ماتەم

نیشتگە لە «شاهۆ»، هەور وەشت غەم

«زاوەلی» زاری، زایەلەش بەرزەن

«لارەکاو» نالەش، وە هەزار تەرزەن

«حەسارگا» حاسر، وە بار دەردەن

«ملە برالووك»، لە حەسرەت زەردەن

«سێ‌ملە» «باوەڕ»، «هانی» و «زلێخا»

«کەلی بەرزەلنگ»، کنیان جە بێخا

---

١- سەراوێکی گەورەیە لە سەرینی شاری پاوە.

«کـانی کـەڕیـان»، تـا «دۆزەقـەی زاز»
گـەردەنەی «نـجاڕ»، ڕووی کـەعبەی نـیاز
«سـینە» و «سـەیاران»، تـا «یـۆسف کـوژە»
«بـــان زەمـــانگە»، مـــاتەم و مـــژە
«هـــانەساو» هـەرەس، ئـەسرینش گـەرمەن
«دەربەند» و «گەزەن»، بانگش بێشەرمەن[1]
«بـــانمەڕان» مـێریان، «مـارانـی» بـێنوور
«کەلیان» کاول بـی و «پشـتە» بـی خـاپوور
«ئـــاتەشگاە» ئـــاتەش، گـرتەن یـەکسەرە
وە قـــەقنەس کـــەردەن، تـا کـەلی «بـەرە»
«خانەگا» غـەمگین، «دووریسـان»، مـاتەن
«چـــیەی دەرەنـــیش»، غـــەمش خـەڵاتەن
یـــەکســـەرە لە ئـــێش، ئـــازار نـــازار
مـــەر نـــمەزانـــی، مـەناڵان جـــەزار
لەو ســـاوە ئـــازیز، ئـــازوردەی دەردەن
هــەنی مــن عـبوور، «پـاوە»م نـەکـەردەن
واتــم: ئـەی شــەماڵ، بـێپەڕوباڵ بـای
حەق هۆر نـەگـێرۆ، لێت بـەڵکی لاڵ بـای
مــەویا تـوو زووتـر، تـەشریف بـاوەردای
مــەنسووب و دەروێش، حـاڵی بکـەردای
ئـــیستە مـن تـەنها، نـمەز چـێش کـەرووم
چتەور دڵ ساکن، جـە ئـی ئێش کـەرووم

---

١- هەرچی ناو هەیە لەم شێعرە دا هەرکام کانی و ناو یاگوند یاکێو و یا بەشی لە شاری پاوەیە.

گیان کێشان نیەن، کەس بە دەست وێش
ئازیز ناوەش بۆ، من گیانم پەی چێش
خوا نەکا ئازیز، بار دەردش بۆ
یا ڕەبی سەری، من سەرگەردش بۆ
حەیفەن ئەو ڕوخسار، چون شەمس ماهش
زەعیف بۆ نە سای، تاج و کولاهش
خودا نەکەرۆ، خساترش خار بۆ
ئازیزم عاجز، جەور ئازار بۆ
بینایی دیدەی بەدکارش تار بۆ
بەدخوای وجوودش بارش ئازار بۆ
دڵ زەڕڕەی شادیش، نەمەند وە تێشدا
پێچ وەردم چون مار، لە جەور ئێشدا
بێهۆش و گۆش بیم، چون مەردەی مەزار
بەو ماجەراوە، مەناڵام وە زار
ناغافڵ پەی دەرد، دڵەی پڕجۆشم
سەدای شیوەنێ، ئاما وە گۆشم
سەر هۆر دام و دیم، نیشتگە دوو نەفەر
مەناڵان هەر دوو یەك لە یەك بەدتەر
«مەولوود» بێ و چەنی، دەروێش «عەلی موراد»
مەکەردن زاری، وە خاتر ناشاد
واتن: ئەی مەجزووب، جەزب جەزایی
جەلب قەزای حەق، ئەمر ڕەزایی
هۆرزە تا وەکەی، مات مەدهۆشی
غەمخانەنشین، جام غەم نۆشی

بـا قـامەت وە بـار، ئـاسای غـەم کـەریم
بـا خـاتر وە مـەیل، ئـازیز جـەم کـەریم
سـەر نـە ئـاستانەش، سـەرئەفراز کـەریم
دڵ جـە ئـێش غـەم، بـێ‌نیاز کـەریم
«فـتح‌الله» جـەو دەم، وە مـوشفیقمان بـی
وە ڕووی ڕەزای حـەق، وە ڕەفـیقمان بـی
دەست یـەك گـرتیم، وە داد و بـێداد
«فتح‌الله» و «مەولوود»، من و «عەلی مـوراد»
هـەر چـوار وە زار، بـار غـەم وە کـۆڵ
وە گـریانەوە ڕوو وە هـەردەی چـۆڵ
مـەکـەردیم زاری، چـەمان پـڕ ئەسرین
هـەتا کـە یـاوایـن وە «بـورهانەدین»[1]
«عەلی» و «ئیبراهـیم»، مـەندە بـین سـەفیل
ئەفسووس جە یانەش، نـەبی «ئـیسماعیل»
ئـەوان دوو نـەفەر، هـێمە چـواروین
هەر شەش هەر عاجز، خوار و غـەمباروین
خـار خـەم لە دڵ، بـار غـەم نە دۆش
وە هەر حاڵ ئەوشەو شین وە «بیا شـۆش»
چـون شـنۆی نـەسیم، پـای پـەیك دەلیـل
نـەخاو بـیم و دیـم، ئـاما «ئـیسماعیل»
وات: یـاران تـا کـەی، خـام خـەمۆشن
لاف خـاو خـەم، وە سـەر ئـەپۆشن

---

١- ناوی گوندێکە لە نزیکی شاری «ڕوانسەر».

بـــێدار بـــن یـــاران، ڕاهـــی وە ڕاوین
بـەڵ زووتـــر وە حـــاڵ، ئـازیز ئـاگـاوین
بـــار غـەم نـەدۆش، خـەستەی دڵ پـڕداخ
وە زاری کـــردن، یـاوایـن وە «قشـڵاخ»[1]
دیـــمان چـــەن نـــەفەر، ئـــەهل تـەریقەت
ڕەفـــــیق ڕاســـــی، ڕاگـــەی حـــەقیقەت
تەشریف وە تـەکـیەی، تـاکش بـەردە بـین
زیـــــارەت زات، پـــــاکش کـــەردە بـــین
پـــەرسیمان ئـــەر هـــەی، یـــاران گـــیانی!
هـــــەواڵ ئـــــازیز، چـــــێوێ بـــــزانـی
چـــــوونەن چـــــەتەورەن، ئـــازیز نـــازار؟
سەر شارەن دڵشاد، یـا خـوارە و غـەمبار؟
واتـــــن: جـــە ئـــەڵتاف، بـــاری ئـــیلاهی
شـــادەن وێـــنەی شـــا، وە تـەخت شـاهی
گـــــەردێ وە خـــــاتر، وجـــــوود نـــازار
نـــیاوان ئـــاسیب، نـــە ئـــێش نـــە ئـــازار
ئـــێمەیش وێـــنەی تـەیر، تـێژ وە هـەواوە
دەست و پـا شـەندیم، یـاوایـن وە «پـاوە»
ســـەر وە ئـــاستانەی، بـــارگاش بـــەردیم
خاکش پـەی مـەڵهەم، دەوای دڵ وەردیـم
چون شەمس خـاوەر، سوبح لە شـەرقەوە
نـــمانا جـــەماڵ، تـــاج وە فـــەرقەوە

---

١- ناوی گوندێ لە نزیکی شاری «پاوە».

دەسمان پەرێ چاك دامانش بەردیم
شوکر زات پاك، بێهەمتا کەردیم
ئەو شەو بێخەیاڵ، بێخەم و خەتەر
ویارایین[1] وە شاد، تا وادەی سەحەر
شێخ فەرما: «میرزا، موحەممەد قودووس»
باغان ڕازیان، وێنەی نەوعەرووس
«عالم‌العلوم، مفتی‌القاضی»
ئوستاد تەعلیم، عیلم ڕیازی
حەل نمای مودریك، عیلم جەبر و جەڕ
واقف الوقوف، ئاگای خەیر و شەڕ
لە تورکی مەلاح، لە فارسی مەلیح
عولەمای ئەعلای، عەرەبی سەحیح
بفەرما تەشریف، بوەریم وە باخ
بادا ساکن بۆ ساتێ دڵ جە داخ
نوور دیدە و دین، شەمع شەوچراغ
موشەڕەفش کەرد، تەشریف بەرد وە باغ
«سفید چناران»، چەمیان چەم وەردن
سوجدەی خاكوپای، عەزیزش بەردن
«بی»[2] چەتر سەیوان، سایەی سەرش کەرد
«توورك» تەبەڕوك، خەرقەی بەرش بەرد
«گردووان» گردین، شانان شاخشان
فەرش کەردن چەمەن، وە ساچاخشان

---

١- وەختمان ئەبردە سەر.
٢- داری بید.

«ئـەنار» بـەو غـونچەی، نـەشکوفتەشەوە
«لەولاو» بـەو شـەونم، شـەو خـوفتەشەوە
«ئـاڵوو بـخوارا»، ئـەڵوان کـەرد وە بـەر
«ئـەمرۆ» جـوقەی تـاج، زەڕ نـیا وە سـەر
«شـەفتالوو» وەو بـەرگ، پـڕ پـەرداخـەوە
«شـەلیل» مـەشنیا، وە تـۆی بـاخەوە
«ئـەنجیر» ئـەجەب مـەن، وەو ئـەساسەوە
«گـۆگـجە» یـاوا، وە «گـێلاسەوە»
«زەردەلوو» زەریـف، زیـبای زینەت بـێ
بـازاڕش ڕەواج، قـەدرش قـیمەت بـێ
پەل کـێشا «مـەیوان»، پـەی پـابۆسی پـاش
بـاقی درەخـتان، مـەکـەردن سـەناش
مـابـاقی داران، وە تـۆی پـەردەوە
خونچەشان جە شەوق، شێوەش کـەردەوە
خـورشید ڕەشـید، حـاتەم تـەبیعەت
غـەواس دانـای، بـەحر شـەریعەت
شاباز شەش دانگ، سەید وە چەڵگ ئـاوەر
کەرامات شـیرین، سـەنگ وە دەنگ ئـاوەر
بـەبر بـێ ئەندێش، بـێشەی تـەریقەت
مـەحکووم وە ڕەزای، ئـەمر حـەقیقەت
ئەی کەردەی ڕاگەی، ڕاسـی وە ئـیخلاس
پـەی بـەردەی ئـەکسیر، کـیمیاشناس
«صـادق‌الیـقین» بـا سـدق و وسـووق
بـینا وە بـاتن، وە زاهـیر مـەسبووق

نـــایافت نـــایاب، نـــادرو نـــامی
چـــراغ چـــەشمەی، دیـــن ئـــیسلامی
شان شـەوکەت خـاس، لاو شـێوە شـیرین
ئـیسمش «نـصراللە»، لەقـەب «نـصرالدیـن»
«اللە» تـــا دونـــیا، وە بـــان گـــاوە
بـــەنەن بـــمێنێ، «شـێخ» وە دونـیاوە
بەری جە ئـافات، دوور جـە داخـی کـەی
«ئەحمەد» سەرئەفراز، سای بەیداخی کەی





وینەی «میرزا ئەحمەدی داواشی» لەگەل
مامۆستا مەلا ئیسماعیل کەلانتەری زاوای

## مەرسیەبۆهۆنەری پایە بەرز «سیف‌الله[١] یەعقووبی» «اللّە یارخانی»

ئەر هەی موهەندس، تەحسیلّ نەکەردە
گرەو[٢] لە تکنیك، ئەلّمانی بەردە
ئەر هەی دانەی دوڕ، دەریای باهۆشم
فەردت چون دانەی دوڕ ها لە گۆشم
فەیلەسووف‌فام، «ئەرەستووی» ثانی
«لوقمان» لایەق، «سوقرات» سانی
ئەر هەی دانشمەن، دەریای گرامی
نایافت نایاب، نابغەی نامی
کاکەی بێ‌نەزیر، سوخەن سەنجەکەم
کان مەعریفەت، کۆگای گەنجەکەم
ئەر هەی «جالینوس»، نەوەندە «جامی»
هیچ بێجا نیەن، «جامی» مەقامی
«مەولەوی» مانەن، مەنەن کەلامت
سەد چون «مەولەوی» ماتەن جە فامت
«نەجەف» و «تورکە» و «شەفیع» و «ئەلّماس»
«سەیدی» و «سەی یاقوو» قسە و قافیە خاس
«شاکە» «خان مەنسوور» «خانای قوبادی»
«مەلّکەی موراد وەیس»، بەو شەوق و شادی

---

١- هۆنەرو ئەندازیاری پایە بەرزلە ناوچەی دووچیای ئەلّایارخانی کە «میرزا ئەحمەد» بە «کاکە» ناوی لێ دەبات.
٢- ڕۆژێ «سیف‌الله یەعقووبی» لەکێ بەرکێی ئەندازیاریدا زاڵ دەبێ بەسەر ئەندازیارێکی ئەلّمانیدا.

«شاقولی» و «نەوروز»، «سالم» و «سـائیب»
نـامی «ئـێل بـەگـی»، نـایبو غـایب
«وەفایی» و «نـاری» و «نـالی»و «موستەفا»
یـەك یـەك گـەردو بـەرد، دونـیای بێوەفا
وەشت بـــۆ بـــادەی جـیایی نـۆشای
چـــەم لە هـــام فـەردان، دونـیایی پۆشای
کـاکـــە مـــەرگ تـۆ کـارێ پێم کـەردەن
وە مـــەرگت مـــنیش ڕازیـسم وە مـــەردەن
کـاکـــە بـــۆ وە یـــاد دەورەی جــوانـــی
شــــەوو ڕۆ چـــەنی «عـــەزیزە جـانی»
شکـــــار مـــــە کـــــەردەن، وە کـــاوانـــەدا
گـــۆش مـــەدان وە دەنگ، شـــەتاوانـــەدا
وە شـــاد مـــەویاران، چـەنی هـام فـەردان
وە شۆخی و سوحبەت، شەو لە پای هەردان
خەو خوەش وە نسیم، شـنۆی وەرکـاوان
گۆش وە سەدای کەوك، لە شـیرین خـاوان
مەشام کەیل وە بۆی، «سۆسەن» و «شەوبۆ»
کـاکـــە بـێفەزان، بـێ تـــۆ فـەزای کـۆ
مـــەخـــووسەن پـــایز،فـــەسڵ کـەڵە هـەرز
هـــەر شـــەو لە شـەوگە و سـەرکوان بـەرز
چـــەنی هـــامفەردان، وە شـۆخی کـەردەن
کـاکـــە هـــیچ نـــەوین، وە یـــاد مـەردەن
تـــفەنگچی چـــابوك، چـــالاك تـــوندخێز
وە پـــــارێزەوە، پـــــا مــــەنیای وە ڕێـــز

یۆز[1] ئاسا بێ‌دەنگ، ئاخێز مەکەردی
لە شکار چون شێر، پارێز مەوەردی
«کاکە» وەرکاوان، بێ تۆ خوەش نیەن
هاژەی وەفراوان، بێ تۆ خوەش نیەن
«کاکە» وەرکەمەر، بێ تۆ خوەش نیەن
سەیری دەشت و دەر، بێ تۆ خوەش نیەن
سەیر سەرهەردان، بێ تۆ خوەش نیەن
جەرگەی هامفەدران، بێ تۆ خوەش نیەن
«کاکە» کەڵ کوشتن، بێ تۆ خوەش نیەن
لە شەوگە نشتن، بێ تۆ خوەش نیەن
سەدای ماردەمان[2]، بێ تۆ خوەش نیەن
ڕەمیای کەڵ ڕەمان، بێ تۆ خوەش نیەن
چریکەی سەرکەش، بێ تۆ خوەش نیەن
سەدای هەی دمس خوەش، بێ تۆ خوەش نیەن
سۆسك نساران بێ تۆ خوەش نیەن
کەوك کۆساران بێ تۆ خوەش نیەن
کاکە دمای خان بەرز دیاری
«تساهێر» تەنیاباڵ وە کێ مەسپاری
کاکە لەیلەکەت دڵ داخی نەکەیت
تا مەحشەر بەرگش قەڵاخی نەکەیت
مەواچۆ: سەردار سایەی سەرم ڕۆ
داناو دڵنەواز دڵاوەرم ڕۆ

١- یۆز پەلەنگ.
٢- تفنگێکی ڕاوبە.

بـۆ بـدیە جـەستەی «ڕەبـابە» کـاکـە
بـێخوردو بـێخاو بـێتابە کـاکـە
زەلیـلو زارو زەبـوونەن کـاکـە
ئـاگـر وە کـوورەی دەروونـەن کـاکـە
یـەکـجاری «هـاجەر» زامـینەن کـاکـە
قـەڵاخی و داخـیو حـەزینەن کـاکـە
گـۆش دەر وە عـەرزم ئـامانەن کـاکـە
ئـەر چـی دەردەکـەت گـرانـەن کـاکـە
تـەنیا «تـاهێر»ت سـەرگەردان نـەکـەیت
وەرەق شـادیش بـەرگەردان نـەکـەیت
وە مـەرگت کـاکـە خـاتر ڕێش نـەکـەیت
مـناڵەکـانی بـێ نـازکێش نـەکـەیت
مـوبتەڵای جـەلاد، رەوقـم کـاکـەڕۆ
بـەتاڵەن شـادی و شـەوقم کـاکـەڕۆ
زووخـاوت لە جـەرگ، جـەمەن کـاکـە ڕۆ
هـەرکـاکـەڕۆ کـەم، کـەمەن کـاکـە ڕۆ
قـامەتم جـە غـەم، قـاخەن کـاکـە ڕۆ
لە سـەد لا جـەرگم، داخـەن کـاکـە ڕۆ
شـەو و ڕۆ ئـەوەن، ئـارەزۆی تـۆمەن
ئـەدەم وە سـەردا و هـەرکـاکـە ڕۆمـەن
کـاکـە ڕەفـیقان مـەنەی دڵ داخـیت
تا مەحشـەر یـەکسـەر لیباس قـەڵاخیت
شـێویا بـیسات شـەونشینیمان
وە بـێ تـۆ تـاڵە گشت شـیرینیمان

## مەرسیەلە «میرزا ئەحمەدی داواشی» بۆ «خەلیفە سەیید عەنایەت» «ورا»[(١)]

کەوەی کۆنە ساڵ، کەوەی کۆنە ساڵ
ئەرهەی ستەمگەر، کەوەی کۆنەساڵ
نادانیمەن ئەر، لێت پەرسووم هەواڵ
کێت نەوست وە ناو، غەمخانەی خەیاڵ
دڵ کێت وەك دڵەی، من داخی نەکەرد
بەرگ کێت وەك من، قەڵاخی نەکەرد
بەهار کێت بەرگەرد، وە گوڵڕیز نەکەرد
کێت وەك من مەحرووم لەئازیز نەکەرد
سەرمایەی لوتفت پڕ جەفاو جەورەن
موقەدەراتت بێ فکرو شەورەن
دۆسیو دشمنیت هیچ دیار نیەن
پای دۆسیت پەی کەس پایەدار نیەن
دانەی مۆبەتت پەی مەردان دامەن
نامەردان دەوران دنیای وە کامەن
شیشەی شادی دڵ دۆست ئەشکێنی
دۆسو دشمنت وەك یەك ئەوێنی
ڕاسە پیرە چەرخ دەور زەمانی
قەساس قاتل پیرو جوانی

١-گوندێکە سەر بەشاری «پاوە»نزیکی ئاوایی «داریان»، بەرامبەری ئاوایی «شەڕەکان».

خـان تـا خـەوانـی سـەیید تـا وەشێخ
فـەڵەك بـنچینەی کـێت نـاوەرد لە بێخ
مەخسووس خەڵیفە سـەیید «عـەنایەت»[1]
بـولبوڵ گـوڵزار بـاغچەی هـەدایـەت
وێـنەی مـەلایك لە عـەیب مـوبەڕا
مـەدرۆشا نـە جـەمع جـەماعەت «وڕا»
تـەسکین دەهـندەی دڵـەی دلڕێشـان
بـاش بـاڵادەست ڕیـازەت کـێشان
سـادق و مـەسبووق بـائیمانم ڕۆ
حـاتەم تـەبیعەت سـاحێب خـوانـم ڕۆ
خـەڵیفەی شـیرین شـەکـەرڕازم ڕۆ
دانـاو دڵاوەر دڵـنەوازم ڕۆ
نـاوەشداریێ بسـۆ کـێ بشـۆ وە لاش
بـبۆ وە مـەڵهەم پـەی دەفـع بـەلاش
بـە مـەرد مـوراد دلداری دەرۆ
مـەردەی عـەزیزش لە یـادش بـەرۆ
دڵـداری وە دڵ دڵـڕێشانم ڕۆ
دڵسـۆز مـەنسووب دەرۆیشـانم ڕۆ
پـڕتەقواو تـاعەت بـا سـەبرو سـلووك
نەسیحەت کریاگ ئەولیای «کەرکووك»[2]
خەڵوەتگای خاڵی ئای تـەکـیەی دڵـتەنگ!
مەحرוومی مەحرەم سەنگ مـارۆ بـەدەنگ

---

١- یەکێ لە پیاو چاکان بووە، خەڵکی ئاوایی «وڕا».
٢- شاری کوردستانی «عێراق».

مـــەواچـــۆ: ســـەردار ســـایەی ســەرم ڕۆ
دەروێش مــــــــەنسووب دەروەدەرم ڕۆ
دەســـتوورات شـەرع بـە وەرع حـاڵیم ڕو
جـــا لە جـــەماعەت جـومعەی خـاڵیم ڕۆ
ئامان ئەورامـان، سـەیید چـۆڵ نـەکـەیت!
خان تا خەوانیش غەم بە کـۆڵ نـەکـەیت
ســەتح ئــەورامــان تــا حــەدو حـودوود
«هــانەگــەرمەڵە» و «نـۆدشە» و «نـەوسوود»
مـــــــەرنمەزانـــــــــی زەلیــــل زارەن
چـــمان گشت پـــەرێت چـــەم ئــینتزارەن
«تەویڵە»[١] و «بەڵخە»[٢] و «دزلی»[٣] «دزاوەر»[٤]
«شۆشمێ»[٥] «سۆسەکان»[٦] ناڵانەن یەك سەر
مەواچان: سەیید ســاحێب دیـن جـە کـۆن
فریشتەی فەڕبەخش ڕووی زەمین جە کۆن
عـــــەوام و عـــــالم خــــاتر پــــەرێشان
پـــەی فـەوتت ئـاغە هـەر ئـاخ مـەکـێشان
مــاچان: خـەڵیفەی شـیرین ڕاز جـەکـۆن
سەیید «بەرزەنجی» تـەکـیە بـاز جـە کـۆن
ناو «ئەسپەرێز»[٧] «هەجیج»[٨] و «ڕوار»[٩]
هــەر ڕو ڕۆشــانەن هــەر ڕۆ تــا ئــێوار

١- «تەوێڵە»: شارێکە لە کوردستانی «عێراق».
٢- «بەڵخە»گوندی عێراق.
٣- «دزلی»گوندی سەر بە شاری «مەریوان».
٤- «دزاوەر»گوندی سەر بە شاری «نەوسوود».
٥- «شۆشمێ» ئاوایی سەر بە شاری «نەوسوود».
٦- «سۆسەکان»گوندی کوردستانی «عێراق».
٧- «ئەسپەرێز»گوندی «مەریوان».
٨- «هەجیج» ئاوایی «نەوسوود».
٩- «ڕوار»گوندی «مەریوان».

مەواچان: سەیید ساحێب نان جە کۆن
چرای ڕۆشنایی ئەورامان جە کۆن
دارا کەرامەت ئەهل دڵ جە کۆن
بولبوڵ مەناڵۆ: دەستەگوڵ جە کۆن
«وڕا» و «شەڕەکان»[1] «داریان»[2] و «تەشار»[3]
چەمەڕانَ تەشریف بەری پەی «نەجار»[4]
دیدەنی بە دین ئازیزت کەری
خاکش پەی مەڵهەم دەوای دڵ وەری
دەخیل سەد دەخیل ئامان سەد ئامان
شێر تەریقەت بێشەی تاڵەبان
ئەر عەزم سەفەر قیامەت داری
دەروێشەکانت وە کێ مەسپاری
«دووئاو» و «هیروێ» تا «بەلەبزان»[5]
بزان و نەزان گشت غەرق خەزان
«مەلە مەلاندەر»[6] وە مەیل مەناڵۆن
تا خاک پالات وە چەم بماڵۆن
لە «سەردێ»[7] «پاوە» تا وە«سەردەرە»[8]
«نۆریاو» و «گڵاڵ» «دشە»[9] یەکسەرە
یەکسەر پەی وەفات بێ وادەت جۆشان
سەرتاپا وە بەرگ ماتەمی پۆشان

---

١- «شەڕەکان» ئاوایی «نەوسوود».
٢- «داریان»گوندی «پاوە».
٣- «تەشار»گوندی «نەوسوود».
٤- «نەجار»گوندی «پاوە».
٥- هەرسێ گوندی سەر بە شاری «پاوە».
٦-گوندی «پاوە».
٧- بەشێ لە شاری «پاوە».
٨- بەشێ لە شاری «پاوە».
٩- هەرسێ گوندی «پاوە».

خەڵیفە بکێشە سەر وە «کرماشان»
مەنسووبان بدیە چەنی دەروێشان
هەریەك وە نەوعێ زکر تۆشانەن
بدیە بوێنە ئساغە ڕۆشانەن
نەك چون «حەمیدی» حەمد حەقق کەردە
جامێ جە بادەی مەیل تۆ وەردە
لە بەحر ئەلتاف لوتفت وا بی غەرق
بێ پەروا مەکەرد پارە سیم بەرق
مەواچۆ: سەیید سام سەنگینم ڕۆ
وە حەسرەت مەردەی دڵ حەزینم ڕۆ
باسدق و وسووق ساحێب دینم ڕو
چلە کێشەکەی «قوڵنگەجیمم» ڕۆ
تەکیە چوڵ و هوڵ بێ پەرداخم ڕۆ
هەی ڕۆ خەڵیفەی بێ ئوجاخم ڕۆ
کێ بۆ وا دەروێش وێش ئیرشاد کەرۆ
وا لە «کاکەمیر» باڵ ئیجاد کەرۆ
لە سەری سەریان موعەلەق دەرۆ
بە مەرام مەیل مەوەفەق کەرۆ
بەخشای بە «دەروێش غەفار ئەمینی»
وا بی «مار» بە مەیل وێش مەکەرد سینی
شیفتەی شێوەت بی «مەجید» وە ئیمان
ساج گەرم مەوەرد نەرمتەر لە نان
هەر ئایان مەکەرد «عوسمان» بێ درەنگ
مەوەرد چون نوقڵ و نەبات ڕێزە سەنگ

«دەروێش موحەممەد خان» وا دڵشاد کەردی
بێ زەرەر لە بەند زندان ئاوەردی
هەمیشە «دەروێش ڕەحمان» مەست بی
مەست وە نەسیم بۆی نەفەست بی
تا مەکەرد وە یاد مەیل تۆ هەوەس
ئەفعی چون تەسبیح مەپیچا وە دەس
«دەروێش مستەفا» کاروانش کەردەن
ئارەزووی خەیاڵ قلیانش کەردەن
قلیان لە دەستش داکەفت و گوم‌بوو
چمانێ زەمین قووتی کرد قوم بوو
جە دمای حەفت ڕۆ قلیان گوم کەردە
شکات وە خزمەت خەلیفە بەردە
خەلیفە قلیان وێش پێش ئاوەردەن
چمانێ هەر وێش لە دەستش بەردەن
«دەرویش سلێمان» شیوەنش گەرمەن
«دەرویش ئیبراهیم» بانگش بێ شەرمەن
ئێد وات: خەلیفەی حەق شناسم ڕۆ
ئەو وات: بینایی دیدەی ڕاسم ڕۆ
«عەینە» بێ بابۆ بار بە لێوەنان
«خاتوون ئافتاب» حاڵ پەشێوەنان
«ئافتاب» وە مەیل ئاغەش مەلاوان
دڵ ئەرجە سەنگ بی چون مۆم مەتاوان
مەوات: قامەتم قاخەن ئاغە ڕۆ
لە سەدلا جەرگم داخەن ئاغەرۆ

بـــــازکـــیانی لە دەســـتم ئـــاغە
بـــەرشی ئـیسە پـیر شکـەستم ئـاغە
بـــینایم پـــەڕێت نـــابینان ئـــاغە
ئـــەعزام گشت ڕێــزەی تـووتیان ئـاغە
شـــەمع شـــادیم وا خـــامۆشەن ئـاغە
وە بـــێ تـۆ هـۆشم مـەدهۆشەن ئـاغە
زامـــین زامـــدار زام بــە سـۆم ئـاغە
بێ کـوڕ ئـوجاغ کـوێر، ڕەنـجەڕۆم ئـاغە
مـەڵهەم زەدەی ئـێش زووخ زامـم بـیت
هامدەم هام سـوحبەت هـام کـەلامم بـیت
هـەم سـایەی سـەرو هـەم سـەردارم بـیت
وەشـــی و نـــاوەشیم ئـــاگـــادارم بـــیت
کـــان کـــۆی کـەرەم لوتـفـو مـەیلم بـیت
ئـــاگـــادار دەرد دڵــەی کــەیلم بــیت
ئــای دای وە تـــاڵان خــەزانــەی فــامم!
ئـــاغەم تـــا مـــەحشەر نـــاسۆرەن زامــم
«عــەینە» عـەینەینش بێ نـوورەن سـەیید
دیـن دیـدەی تـۆش مـەنزوورەن سـەیید
مـــەواچـۆ: حـــاڵم بــەد حـــاڵەن بـــابۆ
جـــەستەم مـــاچی کـــۆی زوغـــاڵەن بـابۆ
مـــوبتەلای بـــەڵای زەوقـــم بـــابەڕۆ
بـــەتاڵەن شـــادی و شـــەوقم بـــابەڕۆ
زووخـــاوت لە جــەرگ جــەمەن بـــابەڕۆ
هـــــەر بـــــابەڕو کــەم، کــەمەن بـــابەڕۆ

ئیسه تەکیه چۆڵ خانەقا دڵ تەنگ

مەنسووبان پەشێو دەروێشان بێ دەنگ

سەدای تەپڵت کۆن وە بەیداخەوە

ڕای «بەغدا»ت بەند بی، شیت[1] وە داخەوە

مەحرووم لە جادار «حاجی شیخ جەمیل»[2]

مەر لە قیامەت ببۆت وە دەلیل



١- ڕۆیشتی.
٢- یەکێ لە شێخە هەرە بەرزو بە ناو بانگەکانی تەریقەی «تاڵەبانی» بوە لە شاری «کەرکوکی» «کوردوستانی عیراق».

## مەرسیەبۆ «کەریم سوڵتان»[١]

یە چە بادەی وەن سوڵتان کەردەن نۆش
شیرین‌و شەکەر کەردەن فەرامۆش
شیرین هاله شین شەکەر بەو دەستوور
ئیسمش چون «خوسرەو» ماوەران وە موور
مەواچان: ئەرهەی سان سام سەنگی
زەنندەی دڵێر ئەژدەهای جەنگی
کەی وادەی خاوەن یە چە خەیرتەن؟
های! وەهار ویەرد وادەی سەیرتەن
ئیسا تماشای شکۆفەی دارەن
فەزای شەڕە بەق سیپەو ویارەن
کاوان کڵاوان ئینتیزاریتەن
چەمەڕای تەشریف میرشکاریتەن
وەهار وەی هەوای گوڵان وەش بۆ
حەیف نەبۆ سوڵتان تۆر کەرۆ جە کۆ
داخ و مای گران قەسر قەجەرت
سا بۆ بە سەیران بەرکەر لە سەرت
ئیسا تماشای شکارگای ڕاوەن
مەوقەی تماشای چەشمەی «شێڵماو»ەن

---

١- «کەریم سوڵتان» کوڕی جەعفەر سوڵتان، خەڵکی «خانە گا» سەربە شاری «پاوە» وەحاکمی هەورامان بووە.

ئـــیمجار جـــەو دمـا وە بـێ مـدارا
تەشریف بەر وە سەر، سەر چەشمەی «گارا»
بـا حـەسرەت نـەبۆ پـەی «بـزەڕیشە»
وە ئـــارەزووی وێت پـــێوە بـــنیشە
وە «هـــانەسەیدان» کـەج کـەر کـڵاوت
تـازە کـەر پـەی کـەوك کـۆلێت ڕاوت
نسەوکەران وەشکـەن مـەنزڵگای شـەوت
بـا بـەرز بـۆ کـزەی کـەواوی کـەوت
«کـیلی» و «تـایەرە» «ڕەزڵـە» ڕەزا کـەر
وە کـەیفو مـەیلت سـەیرو فـەزا کـەر
بـــۆی شکـۆفەی کـەیل وە دەمـاخەوە
وە شـــەوق شکـــار «بسەران شـاخەوە»
مـەیاوی وە سـەر «قـولەی بـەران شـاخ»
وە یـاد «قـەسر قـەجەر» وە چـەن ئاخ
بـــدیە دیـــارە لە هـــەر چـوار لاوە
«کەوێڵە» و «ماکوان» «ئـاتەشگا» و «پـاوە»
بـــە ڕاس مـوستەقیم قـەدیم قـەواڵـە
تـازە کـەر تـا سـەر «قـولەی قـەرزاڵـە»
«گـــالآن» و «گـــۆلان» وە گـــۆلانەوە
چـــەمەڕان سـوڵتان تـــا بـــلانەوە
«دۆڵەخلێ» و «وەرکـەل» وە «ئـەیوانـە» وە
هـەر هـان وە تسەمات وە سـەیوانـەوە
«کـۆی حـەسەن ئـاغە» ئـاخینەن سـوڵتان
«بەرە» و «گۆڵبەند» گشت داخینەن سوڵتان

«نەمراو» و «کۆتیل» کۆس کەفتەن سولّتان
ئێیش «لارەتاو» نەسرەفتەن سولّتان
«هانەڕیونینە» هەر ڕۆشەن سولّتان
هەر ڕو ئارەزۆی ڕۆی تۆشەن سولّتان
«وەنی جانالی» تا «هانەچەرمە»
بێ تۆ هان لە شین شیوەنشان گەرمە
«سەردەرە» «میراوا» «دیلّێ» تا «کۆلّە»
لە زڕەی بالّ دەبێر شکاریت چولّە
«کەلیان کەلیانان» وە باهوو یالّدا
هەورێشە ڕاو کەر وە «کۆی مەکالّ»دا
خاس بدیە «دوو سەر» «دەرچێلّێ» مازە
بە«قەڕنا» بکەر دیارێ تازە
جەو دما تەشریف بەر وە «سەرباوەر»
پەیاپەی ساتێ و خاس تماشاش کەر
قاوەخانەی چەم چاوگەی «دووریان»
تماشاش مایەی ئاخەن پەی دۆسان
«شێرەلّابەگ» و «شۆرژی» پەی توو
دوو سالّەن سولّتان هەن وەی ئارەزوو
شایەد سولّتان لوتف بێ ئەناز کەرۆ
بە ڕاوێ هەر دوو سەرەفراز کەرۆ
چون «ڕوستەم» بە ڕەخش ڕکاوو ڕاندا
جەولانێ بدەر وە «سەرکڕان» دا
هەم وە عەزم سەیر هەم ڕاو نەخچیر
شێرانەوار شۆ تا سارای «شەمشیر»

ئیمجا جەو دما گل بساوەرەوە

بدیە «نۆسمە» وە «بندەرە» وە

وە شەفاف شەوق چناران سەوز

وە بۆی لەتسافەت گولان «سەرحەوز»

بدیە وە بالای نەمامانەوە

جە غەم سەر نیان وە دامانەوە

ئارۆ وەشت غەم جە شەماڵەوە

ماوەرۆ جە کاو کۆی قەرزاڵە وە

ئەوەن غەم واران وە حەسارەکەت

بەرزەن وە بەرزی سێ چنارەکەت

«سوڵتان» سەروەردار برادرەت ئامان

ڕەفیق ڕای «قەسر قەجەرت» ئامان

«وەکیڵ»[1] و «سوڵتان» دوو برادەر بین

هەمڕەئی و هەمڕای قەسر قەجەر بین

فەلەك نەدا وەخت وە ئامانشان

وەفا بکەران وە پەیمانشان

چون «سوڵتان» جە وەخت حاڵ نەزع وێش

ئاگا بی وە حاڵ ئەسڵ وەزع وێش

وات وە «عێزەت بەگ» وەسیەت بۆ پەی تۆ

موحکەم کەر ڕشتەی دۆسی «جوانڕۆ»

---

١- لەو کاتەدا ئاڵاو کۆتەڵی خواڵێخوشبوی «وەکیلێ» جوانڕۆیان هێنا نێو چەمەریەکە و «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم شێعرەی پیاگوتووە.
وە «حوسەبن» بیگی کوڕی وەکیلێش لەوچەمەریدا بەشداری کردوە.

هەر تەورێ من بیم حامی کارشان
مەدەدکار وە کار ڕۆزگارشان

تۆیچ هەر بەو دەستوور دەست وەرمەداره
دۆسی بابۆی وێت نگابداره

«حسەین بەگ» ئەرچی وێت زگارەنی
زەلیل زامەت ڕۆزگارەنی

وەلێ «عێزت بەگ» زەلیل زارەن
پەی فەوت سوڵتان بێ ئختیارەن

ئێوە لازمە دەسگیریش کەرن
دەڵاڵەت وە دڵ دڵگیریش دەرن

مەنع زڵم و زۆر زەڵاڵەتش کەن
جەڕووی سەڵاحەت دەڵاڵەتش کن



## مەرسیە بۆ «غوڵام حوسەین خان ئەردەڵان»[١]

ئەی خاك عەرزم هەس ئەر لێت حـالی‌یەن
ئەمە «غوڵام سەین خان» نـەوەی والی‌یـەن
نـــازی بکـــێشی وەك گـــیان شـــیرین
خـــاتر خـــار نـــەکـــەی خـــان نـــازەنین
کێت زەبوون نەکەرد، کێت زەبوون نەکەرد
لە ڕاسی چەپگەرد کێت زەبوون نـەکـەرد
کێت نەوست وەگـێج دەریـای دەردیسـەر
کـــێت لە گـــێجاودا نـــاوەردەن وە بـــەر
داخـــم کـــێت نـەدان وە مـەودای خـەتەر
کێ لە سای چـەرخت نـیشتگە بـێ زەرەر
ئـەر هـەی ستەمگەر جـەفات بـێ سـەفان
هـــیچ سـەفات نـیەو سـەفات بـێ وەفـان
هـــیچ کـــەس نـــەنازۆ بـە سـەفاو وەفـات
هـــیچ کـــەس نـەناڵۆ بـە جـەورو جـەفات
دڵ فــــریبەنی بـــــە نـــــەیرەنگ بـــازی
هـــەر ســـاتێ وە تـــەبع یـەکـێ مـەسازی
چـــەنی ئـــەردەڵان هـــای لە زڵـم سـەخت
هەر ساڵ یەك والیت مەعزول کەرد لە تەخت

---

١- غوڵام حوسەین خان کوڕی حوسەین خان و برازای «سەردار ڕەشید» والی کوردوستان دانیشتووی شاری «ڕوانسەر» وە یەکێ لە سەردارانی زۆر شوجاع و بەناو بانگی ئەردەڵان بوو.

مەخسووس «غوڵام سەین خان» بەو جوانمەردی
چـــۆن ئــامات وە دڵ نــاغافڵ بــەردی
«حــاتەم» تــەبیعەت «نــادر» کــردار بی
«تــوهەمتەن» تــەمیکن نــامی دیــار بــی
ئــەر هــەی دانــەی دوڕ دەریــای گــرامــی
نــــایافت نــــایاب نــــادرو نــــامی
مــیر بــیٚ نــەزیر سـوخەن سـەنجیٚ بـیت
کــان مـەعریفەت کـۆگـای گـەنجیٚ بـیت
ئــەر هــەی بــاوەقار شــێر زۆر وە مشت
ئەر هەی چـرای چـاو ئـەردەڵانی گشت
مــەڵهەم بــیت پــەی دەرد زامــان کــاری
کــێت نــــەجات نــــەدا لە گــرفتاری
ئــەر هەی شـاشناس خـەڵعەت شـاپۆش
وە عــەرز بــەندەت ســاتیٚ بدەر گـۆش
یە چە بادەی بی «خەسرەو» کەردەن نۆش
شــیرینی «شــیرین» کــەردەن فـەرامۆش
فــدات بـام سـا دەی خـان «حـاتەم» خـۆ
وە حـــەسرەت لادە لەحــاف گـــڵکۆ
بــدیە وە جــەستەی لەیـل دڵ داخــیت
تـا مـەحشەرَیـەکسەر لیباس قـەڵاخیت
هــەی خــان هــەی والی بیٚ نـەزیرم ڕۆ
خوەش نوتق و بەیان خوەش تـەحریرم ڕۆ
عــــەرزم هــەر ئـێدەن والی زادەی دەور
ئــەی کــاش مــەدیای لەو سۆراخ قـەور

بـــدیە ڕەفـــیقان مـــەندەی بـــریانت
تـامەحشەر یـەکسـەر چـاو بـە گـریانت
یـەك یـەك چـون قـەقنەس ئـاگـر وارانـن
چـــەمەڕای خـــانو ڕێگـــەی تـارانـــن
ئـــاغە مـــەرگ تـــۆ چسە ئـاخێ دارۆ
هـــەر ئـاخەن وە بـان، ئـاخدا مـەوارۆ
حـــەیفەن لە دنـــیا پـــەی یـادگاری
تـوولێ دەس نـیشان جـە وێت نـەداری
نـەجاگـەت سـەوز بـۆ لە دیـواخـانت
چـــون وێت بکـــێشۆ نـــاز مـێوانت
«ئـەحمەد» ئـەر سـەری جـیا کـەن لە لەش
خان وە هیچ خانێ نایەژم خوەت خـوەش



## مەرسیە بۆ «فەتاح بێگ» «وەڵەد بێگی ڕوانسەر»

دوشمنیت چێشەن چەرخ بێ ئینساف
ڕاست واچە چەنی سەرداران جاف
یەکێت برد وە توون یەکێ وە تەوەس
بازهەم نەکێشای ئاخرلێشان دەس
یەکێ لە غوربەت یەکێ لە مەحبەس
یەکێ گۆڕغەریب کەردی وە بێ کەس
ڕاسی پەی دەرمان یەك دەردەدارێ
لە «وەڵەد بێگی» نەمەند سەردارێ
یە چە دانەی بی فەڵەك تۆ شەندی
یە چە دامێ بی جە ڕاشان تەندی
مەخسووس «فەتاح بەگ» وەو جوانمەردی
وە کەمەند مەرگ هۆرکەندی بەردی
ناغافڵ بێ ئێش زام وە سۆ کەردی
«شیرینش» ناوەخت بێ بابۆ کەردی
«وەڵەدبێگی» گشت، بێ سەردار کەردی
هەریەك وە دەردێ گرفتار کەردی
قوربان سەر وەردار بدیە لەیلەکەت
داخین داخدار لە غەم کەیلەکەت
زووخاو مەتکیۆ تك‌تك لە جەرگش
تا مەحشەر کەردی قەڵاخی بەرگش

مـەواچـۆ: سـەردار سـایەی سـەرم ڕۆ
مـــــــیر دڵـــــــنوازو دڵاوەرم ڕۆ
بـدیه بـاغت چـۆن وا بـیٚ پـەرداخـەن
تا مەحشەر میوەش هەر ئاخ و داخـەن
بـاغ بـیٚ بـاغەبان بـیٚ پـەرچـینه گـوڵ
لە گـوڵشەن نـاوەخت بـێزیان بـوڵبوڵ
دیوانخانت چۆڵ قـەڵات بـیٚ ڕەونـەق
ئەیوانش چون تاق کەسرا بەردەن شـەق
«یوسف» و «یونس» سەرگەردان کەردی
وەرەق شـادیشان بـەرگەردان کـەردی
یەکجار «فـەریدە» زام وە سـۆ کـەردی
«فەڕوخ» و «شـیرین» بـیٚ بـابۆ کـەردی
«فـەریدە» مـاچۆ: بسابۆی خـاسم ڕۆ
شـایستەو لایـق حـەق شـناسم ڕۆ
مـیر بـیٚ نـەزیر وە دەمـارم ڕۆ
شان و شـەوکەت خـاس بـا وەقـارم ڕۆ
«حـاجیه خـانم» هـەر ڕۆڵـە ڕۆشـەن
ڕۆڵە ڕۆش پەی مەرگ بیٚ وادەی تۆشەن
وێـنەی دێـوانـان هـەر کـاوو کـۆشەن
هەر تا ڕۆی مەحشەر هەر ڕوڵە ڕۆشـەن
مـەواچـۆ: بـوورن زوانـم ڕۆڵـە
بـلاونم ڕۆڵـەی جـوانـم ڕۆڵـە
تۆ بیت هـیچ نـەوی بـاکـم ڕۆڵـە گـیان
وە مەودای خەفەت چاکـم ڕۆڵـە گـیان

ســۆمایی دیــدەم تکــیا ڕۆڵــە گــیان
وە بــێ تــۆ پشــتم شکــیا ڕۆڵـە گـیان
وەهــارم وە تــار کــریان ڕۆڵــە گیان
گوڵباغچەم وە خـار کـریان ڕۆڵـە گـیان
یەکـجار «فـەریدە» دڵ کـەواو ئـەکـات
وە شۆر شیوەن سەنگ وە ئـاو ئـەکـات
تۆ بـیت هـیچ نـەوی بـاکـم بـاوکە ڕۆ
وە مەودای خـەفەت چـاکـم بـاوکە ڕۆ
خــامۆش بــی چـرای مـاڵم بـاوکە ڕۆ
شکـــانی ئـــەژنۆو بــاڵم بــاوکە ڕۆ
ڕۆحــم ئــاوارەی تــوونەن بـاوکە ڕۆ
چەشمانم چەشمەی خوونەن بـاوکە ڕۆ
ڕوخســـارم جــە داخ سـیان بـاوکە ڕۆ
ئـەعزام گشت لە هـەم جـیان بـاوکە ڕۆ
دڵ وە حــــەسرەتان ڕێشــــە بــاوکە ڕۆ
خــوردو خــوەراکــم ئـێشە باوکە ڕۆ
چــون دار گـڕسندەی نـەفتم بـاوکە ڕۆ
ســووزیا ڕیشــەم و کــەفتم بـاوکە ڕۆ
مــــەسڵەحەت نــیەن مــانم بــاوکەڕۆ
دەی بسۆ دەر نــاچێ گــیانم بـاوکە ڕۆ

★ ★ ★

## دوو سەرو سەهی باغچەی «ڕوانسەر»

«ئـەرەستوو» فـامان، «لوقـمان» نـەزێران
هـــۆشداران گــۆشێ لێـمان بگــێران
لە چەپ گەردی چەرخ، چەواشەی چەمەر
لە بـــێوەفایی، دنــیای دوون پــەروەر
نەزمێ چون خەمسەی، «نزامی» تـەحریر
تەقریر کەم جە باب، چەرخ کـەوەی پـیر
هەی چەرخ چەپ گەرد، هەر یـە کـارتەن
دانســـــایان دەور، گــــــــرفتارتەن
وە ڕاس چەنی کەس، تا سـەر نـەوەردی
چەپ گەرد کەچباز، وە چەپ مەگـەردی
نە سوڵحت سوڵحە، نە جـەنگت جـەنگە
بــازارچــەی بــازیت، وە هـەزار ڕەنگـە
چـــە نــازارێ بــی، نــەکـەردی بێناز
نــەوستی چـون کـەوك، لە چـەنگاڵ بـاز
بێ مروەت، بێ شەرت، بێوەفاو مـەجاز
ڕیشەی جەرگ کێت، نـەکـەندەن وەگـاز
دل فــــەریبەنی، بسە نــەیرەنگ بــازی
هــەر ساتێ وە تـەبع، یـەکێ مـەسازی
چە چەرخێ وەردی، بێ ڕای ستەمگەر
بـیت وە بـەدبەختی، پـەرێ «ڕوانسـەر»

دوو سەرو سەهی، ڕەشتەی مەعبوودی
کەشیدەی چەمەن، باغچەی «مەحموودی»
چون توول سەرتەڵ، پەی بین لە باغش
باقیەن تا ڕۆژ، قیامەت داغش
بەهار «ڕوانسەر»، وا وە تارکەردی
کشت و گوڵزارش، گشت وە خارکەردی
سەر تا پا دێبای، ماتەمی پۆشان
چەشمەی سەراوش، جەهوون خورۆشان
«قوله»[1] و «قەڵاگە»و[2]، کاو «هێڵەوڕ»[3]
گڕ سەندن هەر سێ، مەگڕیان گڕگڕ
دوو شکۆفەی تەڕ، تازەی سەرچڵبین
سەیرشان سەفای، زاخاو دڵ بین
ئاخر سەمەرش، غەم ئاوەرد وە بار
شیرینی میوەش، بی بە زەهر مار
باغەبان داخین، بولبوڵ حەزینەن
یانەی ساحێب باغ، واوەیلاو شینەن
حەیف بی وە ناحەق، سەفای سایەشان
کۆتا بی لە سەر، بابۆو دایەشان
ئەدا ها لە شین، بابۆ بەو دەستوور
یەك یەك نامشان ماوەران وە موور
مەواچان: ڕۆڵەی جوانە مەرگمان
تا مەحشەرکەردەن سیا بەرگمان

١- ناوی کێون لە نزیکی شاری «ڕوانسەر». ٢- پیشین.
٣- پیشین.

وە فدای لەیلەکان شەو نەخەفتەتان
وەفدای نازاران بێ نازکەفتەتان
براکانتان هەرسێ دڵ داخین
هەرسێ تا مەحشەر لیباس قەڵاخین
وێنەی دێوانان کاوو کۆشانەن
تا ڕۆی قەیامەت برا ڕۆشانەن
مەواچان: کاکەی بێنەزیرمان ڕۆ
خەتات خەت خوەش سەردەبیرمان ڕۆ
«مەحبووبە»ی مەحبووب بێ مەحبووب بیەن
دوو ڕۆڵەی مەحبووب لە دەستش شیەن
ئێژێ خوەم وە فدای زام سەختتان بام
وە فدای مەرگەکەی وە ناوەختتان بام
وە فدای بەستەی دەست چون ئەسیرتان بام
فدای نالەی دەرد، دەم تیرتان بام
قەزای وە حەسرەت باڵ چاوتان لێم
قەزای کارەکان ناتەواوتان لێم
مەواچۆ «نبی» جوانە مەرگم ڕۆ
نامی «یداللە» هوونین بەرگم ڕۆ
دوو باز شەش دانگ زەدەی چڵم ڕۆ
گیر ئاوەردەی دام ناغافڵم ڕۆ
دوو چەپەی نەرگس دەستەی گوڵم ڕۆ
دوو غونچەی سۆسەن داخ لە دڵم ڕۆ
دوو ڕۆڵەی لایەق وە جسەوهەرم ڕۆ
دوو دوڕ دانەی دوڕ دوو گەوهەرم ڕۆ

تـــیژتر بـــین لە تـیغ بـڕندەی دەوان
«یــداللە» وە قـــەڵەم «نــبی» وە زوان
یـەك جـار «عـبداللە» خـار لە جـەرگشەن
پـەی «نـبی» سـاتێ دووسـەد مـەرگشەن
خـــارو خـــەمینو زارو زەبـــوونەن
جگـــەر لەت لەتو دڵ غـــەرق هـوونەن
مـەواچـۆ: حـــاڵم بـەدحاڵەن «نـەبی»
سـەر تـاپام وە کـۆی زوغـاڵەن «نـەبی»
تۆ بیت هـیچ نـەبی بـاکـم ڕۆڵـەگـیان!
وە بـێ تـۆ جگـەر چـاکـم ڕۆڵـە گـیان!
هیچم پێ ناکـات گـریان «یـەدی» گـیان!
هـا وەخـتە بـوومە بـریان «نـەبی» گـیان!
چوندار گڕسەندەی نەفتم «نـەبی» گـیان!
سـووزیا ڕیشـەمو کـەفتم «یـەدی» گـیان!
مـــەسڵەحەت نـــیەن مـــانم ڕۆڵـەڕۆ
ئـەی کـاش بـەرمەشیا گـیانم ڕۆڵـە ڕۆ
وەهـــارم وە تـــار کـــریان ڕۆڵــە ڕۆ
گـوڵ بـاغچەم وە خـار کـریان ڕۆڵـە ڕۆ
یـە بـۆ بـاز نـاوێ گـڵ کـۆتان ڕۆڵـە؟
بـــدیەن وە جـەستەی بـابۆتان ڕۆڵــە
شـــایەد بـــوینم ڕەنگـــتان ڕۆڵـــە
سـەر بـنیەم لەجـای سـەنگتان ڕۆڵـە
چـــە دەنگـــێ ئـاما وە گـڵ کـۆشاندا
وە گڵ کـۆی حـەسرەت تـازەی نـۆشاندا

واتن: هەی بابۆی دەروون لە غـەم کـەیل

وە حــەسرەتمەندی لێـمان مـەبێزمەیل

مەشغووڵ بەر وە حەمد خوِدای یـەگـانە

شــەهید ســەربەرزی هـەر دوو جـەهانە

خـــوێش و بــێگانە، قــەوم و ئــەقرەبا

وەك یەك داخین بـوون خـاس تـر لە بـرا

تـــاریخ زامـــەت دەرد کـــاریشان

ڕۆژ واوەیـــلاو شـــین و زاریشـــان

مـــەبۆ بـــواچـــووم لە ڕووی هـــۆشیاری

بـــادا بـــوانـــۆن پـــەی یـادگاری

یەك ڕۆ یـەك سـەعات وە یـەك نـاکـامی

دەسیان دان وە دەس جـوقەی ئـیمدامـی

هەزارو سێ سـەد پـەنجا چـەنی هـەشت

موشەڕەف کـەردن وە ڕەوزەی بـەهەشت



## «جوانڕۆ» بێ تۆ[1]

قــوربان جــە دووریت دەروون پـڕدەردم
زۆرتــــرلە گــەردەن ئــازیز ڕەنگ زەردم
لەوســـــاوە ئـــازیز تـــەشریفت بـــەردەن
تــــەرك ئـــامۆشۆی شكـــارت كـــەردەن
«شـــاوەكــۆ» بـــێ تــۆ نـــووریێ نـــەدارۆ
قـــــولە وە قـــــولە غـــــەم لێش مـــەوارۆ
«مـــامیری» پـــەشێو «ســـاناو» حـــەزینەن
«شـــاوەكــۆ» كــۆ كــۆ واوەیــلاو شــینەن
كــەل «گــولیجی» تــاوە «حــەوشەزەرد»
«چـــاشتەوەر» هـــەرئان مـــەنالۆ جــە دەرد
«شـین كۆ»هـا لە شـین شـیوەنش بـەرزەن
«خەلانە» و «بەركوڕ» ناڵەش سـەد تـەرزەن
«گـــوڵ كـێ» ئـاگـرین تـا «سووراوە ڕێ»
گــــڕگڕ وە ئـــاگـــر دووریت ئـــەگـــڕێ
كــەل «بــەورەوار» مـــینگەی «گـولْباخی»
دوور بـــا لەدووریت پـــۆشان قـــەڵاخی
«لارەمـــــا» هـــــەرئان هـــەرها لە نـــاڵان
«دیـــلم» بـریان سـەیر، سـەفاش وە تـاڵان

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم هۆنراوە جوانەی بە یادی سەرداری بەرزودیاری «جوانڕۆ» «حوسەین بەگی» وەكیل نوسراوە كە ماوەیە لە جوانڕۆ دوور بووە.

کــۆی «کــۆسە قــەوی» «تـامۆردە زنـاو»
ئــەسرین حــەسرەت مــەڕێزان وە تــاو
شاخ «پیر خزر»، «مـای تـەڵاش» تـا «لۆن»
لە دووریت وێــنەی پــڕووزەی بــۆسۆن
«شــەتی نـوور» بـێ نـوور هـەرمێی تـارە
«گــاقڕان» وە قــسڕ چــەم ئــینتزارە
لە «قــلیان درێــژ» تــا وە «وەیســیاواڵ»
هــەوار وە هــەوار شــادیشان بـەتاڵ
«خــورەتاوە چـەرمگ» تـا «خـانكوڕەزا»
«چاڵاوە»ی زۆر جوان بێ ڕووت بـێ فـەزا
«مــلەوس» بــەستەن بــار غــەم نـەکۆڵ
چــۆڵەن هــەواران «بـازگیر» و «شـەشۆڵ»
«رێــزە»مــەرێزۆ ئــەسرینش نــە چــەم
کــۆی «بـاڵا خــانی» گـەرتەنش مـاتەم
هــەور غــەم نشــتەن نــە شـاخ «سـاناو»
«کــاوات» بێشەرمە ئـەسرینش نـە چـاو
«دێ توێ» و «شـەروێنە» تـا بـەند «بـازان»
هــەوارگــەو مـاوای نـازەنین نـازان
گشت لە دووریــستان پــڕ تــاو دەردەن
وەك گــــەڵاڕێزان پـــاییزان زەردەن
بــەهار ئــیمساڵ نــووریٚ نــەدارۆ
گوڵان سەر وە خاك حـەسرەت بـەر ئـارۆ
بــەهار ئــیمساڵ خــەمبارەن بــێ تــۆ
کــاوکــۆ و دەشت پــڕخارەن بـێ تـۆ

«نەرگس» و «سۆسەن» «وەنەوشەی» پەل دێز
چـــنوور و شـــەوبۆ مـــەخێزان نـــە ڕێـــز
داران وە داران غـــــــەم لێش مـــــەواران
گوڵان سەر وە خاك حـەسرەت مـەسپاران
هـــیمان «ڕێـــواســـان» نـــەخێزان لەڕێـــز
وەشـــــی بــــەهارش بـــــێزیان وە بـــێز
«لاڵـــە» و «هـــەلاڵە» نـــیەن چـــون جـاران
مـــــەحروومەن لە فــــەیز فــــەزای بــــەهاران
«وەرکـــــەمەر» نــــیەن عــــەتر وەهــــاریش
ســـەنگ مـــەبۆ وە ئـاو پـەی دەردکـاریش
«ســـووری دەر» مـــاتەم، «هـەلانی» مـاتەن
چــــەم «بــەرچــنار» چــەمەڕای ڕاتــەن
«هانی خـاڵ خـاسان» نـمەندەن خـاسیش
پـــــۆشان وە چـــەمەن بـــەرگ پـــلاسیش
نشــــاتگای قــــــەدیم نشــــاتگای یــاران
لە جــاگـــەی نشـــات غـەم لێش مـەواران
«قــــازانگـــا» قـــەزای بـــەد لێش نـــازڵەن
وە بـــێ تـــــۆ ڕاوگــــاو ڕاوش بـــاتڵەن
«چـــەم گــوێزان» ڕێـــزان بـەرگ درەخـتش
وە جـــەخت کـــاری‌یەن، زامـان سـەختش
«گۆم» و «بانی توان» هەوارگەی «حەسەن»[1]
شـــادیـــان شـــینەن عـــەیشـــان شـــیوەن

١- مەبەست «حەسەن بەگی»گوندی «سەرۆ»یە سەر بە شاری جوانرۆ.

ئــــازیزان عـــــاجز نـــازاران بـــێ نـــاز
مـــەکـــەندن یـــەك یـەك لەب نـاز وە گـاز
«کەڵێ» و «تورکەپان» «سەفیاوا» و «سـەڕۆ»
یـــەك لە یـــەك بـــەدتر داخـــینەن پـــەیتۆ
«لووت تـــەیمەزیەگ» سارای «بـیاشۆش»
جای خاڵیت نیەن پـەی کـەس فـەرامـۆش
«ئـــــیمامی» چـــــەنی ئـــێڵ «ئـێناخی»
هــــەردوو وە بـــێ تـــۆ پـــڕدەردو داخـــی
«جـــوانـــڕۆ» بـــێ تـــۆ مـــات و مـــاتڵەن
چـون بـوڵبوڵ یـەكسەر چـەمەڕای گـوڵەن
ماڵ وە مـاڵ خـەڵات خـەم کـریان کـۆکـۆ
ئـــازیەتبارەنان پـــەی تـــۆ «جـــوانـــڕو»
خـاکش وێـنەی تـوور کـریان وە قـەقنەس
بـــیەن وە ڕاوگـــەی ڕاویـــاری نـــاکـــەس
بــــەری لە ئــــافات دوور بـــای لە بــــەڵا
چـــــەمەڕای ڕاتـــەن «ئــەحمەد» لە «قـەڵا»
حـــــەیفەن دیـــــارت لە دیـــار دوور بـــۆ
دوژمـــن لە دووریت غـــەرق ســـروور بۆ

## مەرسیە بۆ «قاضی» پاوە[1]

«پـاوە» کـۆرۆ بـۆ دوور لە یانەی شـێخ
کـاوو کـەش و کـۆش گشت بـەیۆ لە بـێخ
نـــەمەند لە بـــاغ و بـــاغاتش چـڵێ
نـــمەیۆ چـــەنیش دەنگ بـــوڵبوڵێ
بـاغان گـرد داغـان بـێ پـەرداخـەنان
بـێ تـۆ تـماشاش مـایەی ئـاخەنان
بـوڵبوڵان مـەحرووم سـەفای باغانەن
لە جـــای بـــوڵبوڵان پـڕ لە زاغـانەن
«وەنـی جـانالی» تـا «هـانە چـەرمە»
بێ تـۆ هـان لە شـین شـیوەنشان گـەرمە
«سەردەرە» «میراوا» «دێـلێ» تـا «کـۆڵە»
غـــەم وە کـوڵەنان وێـرانـە و چـۆڵە
«کـەلیان» «کـەلیانان» وە بـاهوو یـاڵدا
وەشت غەم وەشتەن وە «کۆی مەکاڵ» دا
«زەوارە» زامـــــین زەلیـــــل زارەن
بـێ فـەزان سـەیرش مـایەی ئـازارەن
«تگـــرە» تکـرارش هـەر بـە نـامتەن
ئـــارەزۆی بـــالآی نـــەونەمامتەن

---

١- «میرزا ئەحمەدی داواشی» ئەم هۆنراوەی لە ساڵی ١٣٣٢ هەتاوی سەبارەت بە ئەپستەمی زۆری «سولتان» لەگەڵی «پاوە» بە تایبەت کوشتنی «صبغة الله انصاری» قاضی، مەشهوور بە «ئاغە مەلا» داناوە.

«هـــاڵە»مـــەناڵۆ هـــەرئان وە نـاڵان
مـــاچۆ گـــوڵانم بـریان بـــە تـاڵان
مـــیاوی «مـــەیران» مـــەندەی پـــەشێوە
مـــەواچـــی گـــوڵێ نـــەویەن وە پـــێوە
حـــــەسرەت هـــــا وە لای نـــەمامانەوە
جــــە غـــەم سـەر نـیان وە دامـــانەوە
وەیشـوومەی فـەنای گـوڵ لە بـاغان بـێز
خــــێزنا خــــەزان بــەرگ گــوڵانڕێز
بەر کەرد لە دەمـاغ بـولبوڵان بـۆی گـوڵ
جــەرگەی دڵــداران مــەندەن داخ لە دڵ
«هـــەوڵی» مـــەناڵۆ وە چـــنار ســەوز
بـــڕیان لەتـافەت گــوڵان ســەرحــەوز
«بـــیمیری» وەردەن بـــادەی دڵگـــیری
زارو زویـــــــرەن نـــــیەن تـــــەقسیری
تــەبدیل بـــی بـــە شـــین شـادمانی ئـەو
چون پای تـۆ بـڕیان لە سـەر هـانی ئـەو
مـەحەلەی «سـەردێ» سـەرتاسەر تـەواو
بـــەر بـەیۆ لە بێخ جـاش بـۆ بـە سـەراو
«قـــــەرەمەشانی» قـــــەرار بـــڕیا بـــوو
بــە نــار هــیجران دووریت گــڕیا بـوو
«کـــەڵاخوانــــیان» مـــاوای کـــەڵانەن
مـــاچان لە «پـــاوە» جـای سـەر تـەڵانەن
ئیسە چون سـەحرای خـوەتەن بـێنازەن
بـــێ ســـــەروسەدا و ســـازو ئـاوازەن

«مەلاشەریفی» حەق شەریف کەردەن
ماچان: حەیف سەد حەیف تەشریفشا بەردەن
«میراوا» کاول «تگرە»بی خاپوور
وە بێ بالآی تۆ تێش نەمەندەن نوور
«مەرە» مەرامش هەر بە مەیل تۆن
داخین داخ‌دار لە غەم کەیل تۆن
«دەرەزید» زگار زەلیل زامەن
هیچ سەفاش نیەن چون بێ نەمامەن
«پشتە» بەروپشت ویرانەی ویربۆ
چێرش بۆ وە بان، بانش وە چێر بۆ
قەڵاکەی «سولتان» کاول کۆی شەڕ بۆ
بەرەی حەیاتش وە هووناو تەڕ بۆ
وە هەرە گیرۆ بەرەی حەسارش
بەرق بدۆ لە تاق تارمەو تالارش
ئەیوانش چون تاق «کەسرا» بەرۆ شەق
بێ ساحێب مانۆ بێ ڕەنگ و ڕەونەق
وا ئەنگوشت‌نمای سەباو ئێوار بوو
ئەسڵ ئاسارش وە زرێوار بۆ
وا بۆ جە ئاسار ئەسڵش نەمانۆ
بووم شووم وە بان یانەش بوانۆ
پەی چی زوڵم سەخت «سولتان» کەردەنش
زەولانەی زەنجیر شۆ وە گەردەنش

نازاران یەك یەك ئاوارەی زێد[1] کەرد

لە زێدو ماوای وێشان تەبعێد کەرد

«الله»! ئەو هەم وێش ئاوارەی زێد بۆ

لە زێدو ماوای وێش نائومێد بۆ

مەحبووس دوستاخ دوور کەفتەی وەتەن

مەحرووم بۆ جە دین ئەقرەباو فەرزەن

بەختش چون تاڵەی یاران زەبوون بۆ

لە یاران بەدتەر ئاوارەی توون بۆ

سەرو تەختو بەخت سایەش نگوون بۆ

دامانش وە هوون زامان گوڵگوون بۆ

بشێونێ بازاڕ بسات بازیش

سامانش سا بۆ بسانێ نازیش

ئەی چەرخ تا وە کەی چەنەش مەسازی

غەرق خوونش کەر بەدتەر لە «قازی»



١- ماوا ـ مەسکەن.

هـۆره و گـۆرانـی و شـانامە خـوانـی
بـەگ و بـەگزادە و خـان و خـەوانـی
تـا شـەفەق لە شـەو سـیوا بـی سـاف بـی
هەر بەحس جەنگ و مەردی و مەساف بی
سـەحەر خـوەرکـێشا، گـۆشەی جـەلایی
پـۆشا دەر و دەشت، دیـبای تـەلایی
«عـەلیبەگ» سـەردار، زەڕین سـوار بـی
تـاك و تـەڵوزن، لە تـیپ دیـار بـی
نـوتاق نـاتق، دانـای دیـوان دوڕ
شـایستەی مـەجلیس، ئـەمیر کـەڵهوڕ
دەستوور دا «سەردار ئـەکرەم» بـە عـنوان
وات: بشـۆ چـەنی، نـمایندەی سـان
ئـەڵبەت بـە تـەدبیر، ئـەرەستووی عـاقڵ
«ئـاغە عـەنایەت»، فـەهمیدەی فـازڵ
ئـەڵبەتە وە شـەور، «ئـاغە عـەنایەت»
بکـەران هـەر دوو ئـەمرش ڕەعـایەت
بـا «ئـەمیر مـەخـووس» سـالار سـەروەر
بـچن وە خـەرگای، ئـەمیر لەشکـەر
بواچان «سـەردار»، «وەکـێڵ» چـەنی سـان
ئـامادەی ئـەمرن، بـە دیـدە و بـەگیان
نـمایندەی «سـان»، «وەکـێڵ» و «سـەردار»
بـە مـەیل و مـەرام، هـەر سـێ بـین سـوار

هەی کەردن وە ئەسپ، کێشاشان قەمچی
غورووب وە هەر حاڵ، شین وە «دایچی»[1]
دین خەیمە و خەرگای، ئەمیر «کەڵهوڕ»
زاهر بی لێشان، مەدرەوشا چون دوڕ
ڕەهنما دەرلاد[2] ڕانمایی کەرد
هەر سێ بە خەرگای، ئەمیر ڕایی کەرد
ئەمیر دین هەر سێ، سڵامش کەردن
ڕەسم ئیحترام، وە جا ئاوەردن
ئەمیر خوەش ئامەد، بە دڵ خواهیش کەرد
خەیرەمەقدەم وات، قەدردانیش کەرد
پاس ئیحترامو جە ڕووی هۆشیاری
«عەلی بەگ» کەردش، سپاسگوزاری
سفرەشان چنی سەرف شام کەردن
لە دوای شام چایی، ئاوەردن وەردن
ئەمیر ئەمرش کەرد، پێش خزمەت وە تاو
ئاوەرد پەرێشان، سێ دەس ڕەختخاو
سەحەر بێدار بین، سوبحانە وەردن
مەتڵەب بە سەر ڕای، ڕاسی ئاوەردن
سەر ئیڵ کەڵهوڕ، نەکەردش تەقسیر
هەر سێ چەنی وێش، بەرد وە لای «ئەمیر»
«ئەمیر» خوەش حاڵ بی، پەزێرایی کەرد
لە «ئەمیر مەخسووس»، عوزر خوایی کەرد

---

١- لادێیەکە لە پێنج کیلومتری خۆرنیشی «کرماشان».
٢-گورج - ئازا - زوو.

مـــەحز مـــەسڵەحەت، ئـــەمیر لەشکـــەر
ئەمر کەرد ئـاورد، خـەڵعەت یـەك نـەوکەر
پێش‌خزمەت خەڵعەت، خلس کەردش حازر
هەر سێ خەڵعەت کەرد، بـە دیبای فـاخر
«ئەمیر» وا بـە تـاس، تـەزویر بـازی کـەرد
هـەر یـەکێ وە یـەك، نـەجوا ڕازی کـەرد
بـە مـەیل مـەرام، ئـەمیر هـەر سێ سوار
هـیچکام نـەکـەردن، ڕازیـان ئـاشکار
پـــارە نـــەکـــەردن، ڕاز پـەردەی دڵ
بـــە مـــەرامـــەوە، یـاوان وە مـەنزڵ
ئـــەوەڵ «عـــەلی‌بەگ»، دانـای مـووشکاف
عەرز کەرد بە سـەردار، وڵـەدبەگـی جـاف
وات: ئـــەمیر واتـــەن، بـــەشەرت شـەرەف
بـە ئـەتەبای پـاك، نـەجەف ئـەشرەف
«ڕوانسـەر» یـەکـــەر، تـاوە «شـاەگـودار»
مـەبەخشووم پـێتان، وە شـــەرت ئـەقرار
من هەم قـەوڵم دان، وە ئـایەی مـوسحەف
حـــازرین جـــە ڕات، گـیان بـنین لە کـەف
«ســـەردار» بـــە مـەرام، «ئـەمیر» بـی‌حاڵی
نـەگـونجا لە بـەرگ، وێش لە خـوەشحاڵی
واتش: بـــە «وەکـــێڵ»، «ئـــاغە عـەنایەت»
ئـــەمیر لوتـفش هـەن، چـەنیت بێ‌غایەت
مـــوژدە بـــە دڵ دا، بـــە وەجـــد و شـادی
«بـــازان» و «زلان» «مـــیرکی» و «قـوبادی»

مـــەدەرۆ وە پـــێش وە عـــەزم مـــیری
وە حـــوکم ئـــیجرای، ئـــەمر ئـــەمیری
«وەکیڵ» وە گوفتەی، ئەمیر خوەش ڕەنگ بی
حـــازر بـی بـە دڵ، ئـامادەی جـەنگ بـی
«مـــیرزا عـــەنایەت»، واتش: بـە «سـولْتان»
«ئـــەمیر» قـــەولش دان، وە قـــەید قـورئان
«دزلی» و «قەلاگە» و «گۆشخانی» و «ڕەزاو»
«هـەورامـان تـەخـت» و «مـەریوان» تـەواو
مـــەبەخشووم وە پـێش، بـــە شـــادمانی
تـــا ئـــەبەد وە حسوکم ســولْتانسانی
«ســولْتان» شـنەفتش، نـەکـەردش درەنگ
وات: بە فەرزەندان، حازر بان پەی جـەنگ
سەربەست کەرد «ئەمیر»، هەر یەك وە حاڵێ
هـــەر یـــەك وە خـەیاڵ بـەهرەی مـەحاڵێ
دووبـــــارە «ئـــەمیر»، ســـاحێب نـــیشانە
چـــاپارێ وە جـــەخت، کـــەردش ڕەوانـە
چـــــاپار وە ئـــــەمر ئـــەمیر بــی ڕایــی
«گەشکی» و «بێڵەوار»، «سونقر» «کولیایی»
«خەمسە» و «مێهرەبان» «گەڕووس» و «لەیلاخ»
«سەردەشت» و «بانە»، «سەقز» و «سابڵاخ»
سەرهەنگ «ئەحمەد» خان، چەنی تۆپخانە
خـــەبەر کـــەرد بـــا تـیپ، پـیادەی «بـانە»
«کوردسان» یەکسان، دەس وە توفەنگ بـی
گشت کەمەر بـەستە و ئـامادەی جـەنگبی

«خوسرەوی» و «گەڕووس» تا «قەرەبەڵاخ»
«قەسڵان» و «کەمەك» پای «ئەڵمە فەڵاخ»
«زەن» و «گورگین» و «مەنمی» و «گەڵواخی»
موغرز بە «سەردار»، زام زەدەی داخی
تیپێ «حەبیبی»، تیپێ «مەشیری»
تیپێ «ئاسەفی»، تیپێ «وەزیری»
«سەرچی» و «نشوور»، چەنی «تاو» و «دوڵاو»
تا وە «شاهێنی»، کەردن سەر حەساو
وە ئەمر ئاسەف، پەی جەنگ سەردار
سالارە «سەعید»، بی وە سەرسوار
حاکم «سونقر»، «ئەمیر مەخسووس» بی
بە نەسڵ و نژاد، ئەسڵ «گەڕووس» بی
تەرتیب دا وە تیپ، بەیداخ وست وە باڵ
تیپ ئارایش کەرد، چون تیپ تووپاڵ
بە ئەمر ئیجرای فەرمان شایی
سامان دان بە سان، سپای «کولیایی»
«وسەین قولی خان»، «ئەمیر ئەمجەد»
«ئیقباڵە لەشکەر»، «سەردارە ئەسعەد»
باقی خەوانین، خان «کەڵ سفید»
حازر بین پەی جەنگ، «سەردار رەشید»
بەو سڵسڵەی سان، بێ شومارەوە
لەرزە نیشت وە خاك، «بێڵەوارەوە»
«خەران» «دێز گەران»، هەر دوو «ونڕنی»
«کارێز» و «قەڵوەز»، مەحاڵ «سوڕنی»

«ڕەزین» و «ڕازیان» تا وە «ڕزڵان سەر»
«کەنوولە» و «کەمەس»، تا وە «دینەوەر»
«چنار» و «سماق»، «کۆڵان» و «کمشوور»
ئامادەی جەنگ بین، دەرلاد بە زەروور
«قەڵاو قەیەوەن»، وە «باتمانەوە»
وە دەستەو بەستەی، «سیفاللە» خانەوە
«کامیاران» وە تیپ، «تور بە ڕێزەوە»
بەو دڵاوەران شەڕ ئەنگێزەوە
«موحەممەد مورادخان»، «گمشکی» مەدار بی
نەبیرەی «زەرقام»، زەڕین سوار بی
«خان یارئەحمەدخان»، بی چون وەزیرش
مەدام بە ئەو بی، عومدەی تەدبیرش
شێر و شێربەچەی، بێشەی «وەرمەهەنگ»
سوار بین وە جەخت، نەکەردن درەنگ
جەو تەرەف «سوڵتان»، «ئەورامان» ماوا
ئەشاعەی لەشکەر، بە سەمعش یاوا
«سان» ویش شۆر جەنگ، لێش وا ئەسەر کەرد
تیپ تەنتەنەی، سپاش خەبەر کەرد
خێزیا لە جا، «سان ئەورامی»
داش لە دەبدەبەی، دەهۆڵ نامی
سەتح «ئەورامان»، تا حەد و حدوود
«هانە گەرمەڵە»، «نۆدشە» و «نەوسوود»
«وڕا» و «شەڕەکان»، «داریان» و «تەشار»
کەردن تا سەر پێڵ، «سیروان» خەبەردار

«شـێخان» و «زلتـە»، «هـاوار» و «سـازان»
بـە تـەور و تـەرتیپ، تـیپشان ڕازان
«تـەوێڵە» و «بـەڵخە»، «وزڵـی» «دزاوەر»
وە حـوکم «سوڵتان»، کەردش جـەماوەر
ئەوەڵ «ئەحمەدبەگ»، تەڵەب کەرد وە پێش
دەسـتوور دا و فـەرما، بەور بێ‌ئەندێش
مـەتڵەبم ئـێدەن، بـەور سـام سـەنگی
چـەنی سپای وێت، ئـەژدەهای جـەنگی
«نـۆدشە» زیـرەك، زانـا و زرەنگـن
فـەتحی فـەرەحناك، مـەدام پێش‌جەنگن
شـایستەن تـۆ وێت، بـەور بـێ‌ئەندێش
بکـێشی بـەیداخ، پێش‌جەنگی لە پێش
دوهـەم «قـادر بـەگ»، شـێر شکـاری
ئـەو هـەم تـیپ وێش، بەرد وە دیـاری
وات: بـە «مـوستەفا»، سـالار «بـەڵخە»
پـەی دێـر ئـامانت، ئـەوقاتم تـەڵخە
حـازر بـەر چـەنی، بـرادەرانت
دلێـر و داوخـواز، نـامئاوەرانت
داوخـواز داو بـن، بـە عـەزم جـەزمی
مـوکەمەڵ بە رەمز، ئـەسڵەحەی ڕەزمی
مەخسووس کەریم‌بەگ، سالار مەخـووس
کـاندید سـانی، تـازەی نـەو جـلووس
بـەوسان سـپای، بـێ‌قەیاسەوە
ڕاهـی بـی بـە ڕای، بـان «سەریاسەوە»

«سـولّتان» وە بـادەی، وەشـی بی نـەشە
بـەرەحشەی شادی، چـڕیش لە «ڕەشـە»
نـوور بـینایی، دوو دیـدەی بـابۆ
بـابۆ فـدات بـۆ ئـێمشەو تـا بـە ڕۆ
مـدارات نـەبۆ، بـا تـیپ «پـاوە»
ڕاهـی بـەر لە بـەند، بـنار «شـاوە»
خـوەرشید لە مـەشریق، نـەکێشۆ بـەیداخ
بـاڵ بـەیداخت، بـاڵ دۆ لە «قشـلاخ»
خـێزیا لە جـا، سـان ئـەورامـی
فـەرماندا کـوان، دەهـۆڵ نـامی
بـادەی مـەسرووری، بـە کـەیف وێش‌دا
زاڵ زەڕئـاسا، سـاو سـەیف وێش‌دا
«وزڵی» و «دزاوەر»، «شۆشمێ» و «تـەشار»
«وڕا» و «شـەڕەکـان»، «داریـان» و «نـجار»
«دوونـاو» و «هـیروێ»، تـا «بـەلەبزان»
«شـێخان» و «زلتـە»، «هـاوار» و «سـازان»
«نـروی» و «کـێمنە»، تـا «کـۆمەدەرە»
وەئـەمر «سـولّتان» سـاندان یـەکسـەرە
«دشە» و «گراڵ» و «نۆریاب» و «دەرمـوور»
«نۆسمە» و «دووریسان»، سان دان بە دەستوور
بـەو تـیپ سپای، پـڕپەرداخسەوە
«سـان» ئـاما سـان دا، وە «قشلاخە»وە
«وەکـیڵ» «جـوانـڕۆ» شـنەفتش خـەبەر
کـەفت وە تـەدارەك، کـارسازی لەشکـەر

یەك یەك برادەر، وێش وە پێش وانا
حاڵی کەردشان، دلێر دانا

وات: «جەعفەر سوڵتان» چەنی سپا و سان
پاسەم شنەفتەن، وە «قشڵاخ» یاوان

ئیمەیچ لازمە، کارسازی کەریم
بە موهرەی ئەجەڵ، سەربازی کەریم

یا سەر ماوەریم، یا مەنیەریم سەر
«الله اعلم»، بە نەفع و زەرەر

چەرخ وە هەور مەیل، ئەر نەیرەنگ نەبۆ
وارای شەهدشەن، ئەر شەرەنگ نەبۆ

مەترسم ئاخر، شەربەتش ژار بۆ
وەشت کەرەمش، کەژدم و مار بۆ

هەر چە بادا باد، ئۆردوو دەنگ کەریم
چون حەنا وە هوون، پەنجە ڕەنگ کەریم

وە ئەمر «وەکیڵ»، بە شەب و ڕۆدا
مەئموور تاین بی، وە «جوانڕۆ»دا

تیپێ «ئیناغی»، تیپێ «ئیمامی»
تیپێ «زەردۆیی»، شایستە و نامی

تیپێ «مەزیدی»، تیپێ «ساتیاری»
هەر یەك تیپ وێش، بەرد وە دیاری

تیپێ «باینگان»، «دەوان» و «شمشێر»
حازر بین پەی جەنگ، زەندەی دلێر

«سەریاس» و «قشڵاخ»، «مەنوور ئاقایی»
تیپ تیپ وە ئەمر، «وەکیڵ» بین ڕایی

ئەمر کەرد وەکیڵ، «خوایی نەخوایی»
«دێسوور» و «بێوڵە» و «دێ توێ» و «پێڵایی»
«زلان» و «زێران» «کڵاش» و «بنجۆ»
تەمام حەول و حەوش، خاك «جوانڕۆ»
جەم بین لە قەڵا[1]، پیادە و سوار
سەفسەف، سەف بەستن، پەی جەنگ «سەردار»
«سەردارە ئەکرەم»، نامی شنەفتش
خورووش کەرد غیرەت، چون نار بە نەفتش
دەستوور دا، فەوری برادەرانش
سامی سواران، سەر ئاوەرانش
هەر یەکێ چەنی، تیپ سپای وێش
بە تەور تەرتیپ، تەڵەب کەرد لە پێش
فەرمان دا سەردار ئەمجەد وێنەی شیر
سامان دا بە سان، سپای بێنەزیر
ئەوەڵ «سۆفی‌بەگ»، بەورە سەڵتەنە
ساحێب سپا و سان، تیپ و تەنتەنە
وە ئەمر «سەردار ئەکرەم» بی حازر
تیپئارا کەردش، خاس تر لە نادر
دوهەم «عەزیزبەگ»، عەزیزتر لە گشت
چون شێر، شمشێر، جەنگش بەست وە پشت
حاتەم تائی تەور، أرفَعُ العالی
سەوار بی وە جەخت، پەی جەنگ والی

---

١- قەڵای جوانڕۆ

سێهەم «ڕۆستەم بەگ»، بەو ڕوستەمواری
بووەران وە ڕکاب، وە سەر سواری
«ئەکرەم» وە ئەکرام، بە ئەمر سەردار
سامان دا بە تیپ، پەرێ کارزار
«حەسەن» و «حوسەین» «عەلی» و «ئەولحەمید»
سەوار بین هەر یەك، وە هەزار ئومید
«موحەممەد ساڵحبەگ»، سەڵاحەت پێشە
بەر ئاما چون شێر، جەنگی لە بێشە
«ئاغەبەگ» چون شێر، شەڕ جۆی شکارگیر
بێپەروا لە تۆپ، بێئەندێش لە تیر
«خان یار ئەحمەد خان»، چەنی «فەرامەرز»
سواربین چون شێر، باڵ و باهوو بەرز
«سەعیدبەگ» چەنی، فەرزەندان وێش
دڵدار ڕەزمی، نامی بێئەندێش
مەخسووس «موحەممەدبەگ»، جەنگی مەشهوور بی
ساحێب نەسرەت و فەتح مەنوور بی
جاف «جوانڕۆ»، چەنی «ئەورامان»
«سەقز» و «سابڵاخ»، «بانە» و «مەریوان»
«خەمسە» و «مێهرەبان»، «بیجار» و «لەیلاخ»
سوار بین وە جەخت، کێشاشان بەیداخ
«سونقر»، «کولیایی»، چەنی «بێڵەور»
ئاوەردن سپا، پەی جەنگ سەردار
دان لە دەبدەبەی، کووس بەشارەت
«ماراو» و «گورگان»، کەردن وە غارەت

«ئـــەحمەدەوەنی»، «الله یـــارخـــانی»
بـــەگ و بـــەگزادە، خـــان و خـــەوانـــی
وە ئـــەمر ئـــەمیر، ئـــامادەی جـــەنگ بـین
حـازر لە حـزوور، دەس وە تـوفەنگ بـین
«ئـــەمیر ئـــەحمەدی»، بـازهەم بـە زەروور
تەڵەب کەرد «مەنسوور» خان غەریب پوور
واتش: مـــەنزوورم، دانـــای سـوخەنسەنج
ئێدەن «کەریم خان»، نـەبیرەی «مـیرپەنج»
چـــەنی قـــەبیلەی، ئـــێڵ بـــەرخـــوردار
بـــا خـــەبەر کـــەرۆ، تـــا «بـــەرزەچنار»
لەب بازکەرد «مەنسوور»، شیرینتەر لەگوڵ
بەی تەور دا جواب، «ئەمیر» چون بـوڵبوڵ
حەتمیەن «سـەردار مـوقتەدر» چـون شێر
ئـــاگـــا بسۆ جـــە کـــار، زەنـــدەی دلێـــر
ئـــــامادەن وەیتـــــەور، بـــدۆ ئـــازارش
بـــــەر ئـــــارۆ دەمـــــار، لە ڕۆزگـــــارش
ئـــــاواتش واســـــتەن، شـــێر شکـــاری
یـــــەکـــــێ نـــمازۆ، لە بـــەرخـــورداری
ئـەمیر کـارێ کـەرد وە وەسـواسـەی خـام
وێش بـــەیۆ وەپـــای، وێش بـووزۆ وە دام
قـــــاسدێ بـــەو شـــەو بـــەرق شـــەهابی
تەعین کـەرد، کـیاست، پـەرێ «سـنجابی»
وات: وە «کـــەریمخان»، ئـــەمر زەروورەن
بـــاوەرە ئـوردوو هـەر چـیت مـەقدوورەن

حـــازر بـــین و چـین، بـا چـەندین سـوار
بـەرپا بـی پـەرچـەم، ئـێڵ بـەرخـوردار
تـەشریف وە حـوزوور، سپەبود بەردن
ئـــیکرام و تـەعزیم، وە جـا ئـاوەردن
«ئـەمیر» تـەوازع، کـەردش بێ‌حەساب
وات: وە «کەریم‌خان»، سەرئێڵ «سەنجاب»
مـــەقسەدم ئـــیمشەو وە «ڕوانســەر»ەن
شـەبیخوون بـدەیم، ئـەرچـی خـەتەرەن
تـەمام سـەرداران، سـەرحـەدات غـەرب
ئـامادەم کـەردەن، حـازرەن پـەی حـەرب
«کەریم خان» جەواب، ئەمیر بەی دەستوور
عـەرز کـەرد بفەرما، خـان غـەریب‌پوور
تـەشریف بـە خـەرگا، بـاوەرۆ ئـیمشەو
واجـبەن تـەدبیر، کـەریم چـەنی ئـەو
مەخسووسەن «ئەمیرمەخسووس» دەنگ کەردن
خەیمە خەلوەت بێ شەور جـەنگ کـەردن
«سـەردارە ڕەشـید»، فـیکرش بـەردەوە
قـــاپی خـــەیاڵان، دەروون کـــەردەوە
فـــەرماش بـە ڕەئـیس‌پۆلیس سـەردار
تـەعین کـەر مـەئموور، سەوارەی سـەیار
بـــلووکنشینان، ســـەرحـــەد مـەدارم
خـــاسە نـۆکـەران، خـزمەت گـوزارم
بـەگلەر بـەگلەران، بـا فسەڕو بـەختم
حـــازر بـــان یـەکـــەر، لە پـایەی تـەختم

دەرلاد بە فەرمان، فەرموودەی «سەردار»
سەرحەددارانش، کەردن خەبەردار
جوق[1]جوق سەرداران، شوور شەڕئەنگیز
جەم بین لە قاپی، «سەردار» چو «پەرویز»
حازر بین یەك یەك، وە فەرمان ئەو
چون پاڵەوانان، عەهد «کەیخەسرەو»
سەرحەددمەداران، قابل بە شەورش
چون ماه و پەروین، جەم بین لە دەورش
بە زیب‌زیوەر، بە زینەتکاری
بەرپا بی بسات، بەزم سەرداری
بە سەفای مەجلیس، سەماوەر دەم بی
سەردار سەرئەفراز، مەجلیس بێ‌غەم بی
سەماوەر نوقرە، قەندان تەلایی
پیاڵە لە بلوور، جام جەلایی
شیرینی و شەربەت، شەهد شەکەرڕێز
میزبان ئاوەرد، چنیش لە ڕووی مێز
بە عوود و مەجمەر، بە سۆز و گوداز
سەرگەرم بی مەجلیس، هەریەك وە یەك ڕاز
والی بەوڕازان، ڕێزەی شەکەرڕێز
وات: بە سەرداران، نامی چون پەروێز
جەنگ چەنی دەوڵەت، هیچ‌کەس نەکەردەن
هەرکەسێ کەردەن، تا سەر نەوەردەن

---

١- قۆڵ قۆڵ.

مـــن بـــه ئـــارەزوو عـــەزم جـــەزمم بـــی
چـــەنی ســـپەهبود، مـــەیل ڕەزمـــم بـــی
مەزانووم بەی تـەور، جـەهد و جـەختشەن
«ڕەزاخـــان» خـــەیاڵ، تـــاج و تـــەختشەن
«ئەحمەد ئاغەش» کەرد، وە ئەمیر لەشکـەر
ڕیشـــــەی ســـەرداران، مـــاوەرۆ وە بـــەر
هـــان لەو فـــەراســـەت، ئـاوات مـەوزوون
له عـــــەشایەرات، یـــــەکـــێ نـــمازوون
بـــە فکـــر و تـــەدبیر، سـەردار ستورك[1]
بە«کورد»«فارسش»گەرد، بە«فارس»گەرتش «تورك»
به «لەك»، «لوڕ» لەبەین، باز هەم بـە «لوڕ» «لەك»
مـــەوەران لەبـــەین، ئـێمەیچ یـەك وە یـەك
ئـــەمر کـــەرد ســـەردار، بـه وێـنەی نـادر
حـــازر بـــی مـــیرزا، «مـــوحەممەد بـاقر»
فەرماش بە مـیرزای، مـونشـی وەش ڕەقـەم
هـــەرچـــی مـــەواچـــووم، بـێ زیاد و کـەم
ئەسڵ بەی مەزموون، بـە سـەرداران گشت
ئـــەختار کـەرد والی، بـە زیب و بـە زشت
مـــن هـــەر ئـــەو ســـەردار، والی نشـــینم
بـــا عـــزەت و جـــاه، ســـاحێب نگـــینم
ئـــێوە جـــە مـــن بـــی، ئـــەسڵ مـــایەتان
بە من مـوحەکـەم بی، یـەکسـەر پـایەتان

---

١- نەبەز.

مــــن وێــنەی قــاپی، ئـێوە قــەڵا بــین
تــا مــن بــیم ئـێوە، دوور لە بــەڵا بین
ئــەگــەر مــن نــەوم، یــەك ڕۆ بـێ‌درێغ
مــــاوەران ڕەگ و ڕیشــــەتان لە بــــێخ
مــەزانــووم ئـاخر، ئـێوە چـوون مـەبوون
گشت لە دمای من، تـەفر و تـوون مـەبوون
بــــە ڕەمـــز ئــەفسون، بــە دام تــەزویر
یــــەك وە یــەکــتری، مــاوەران وەگــیر
وە شـــــاڵماشتەی[1] عــــەیاری جــاری
هــەر یــەك مــەبەران، وە حـەبس شـاری
شەرت بۆ من جـە داخ، ئـێوە وە بێ‌دەنگ
«ڕوانــەر» وە جا، بـازووم وە بـێ جـەنگ
بــێ جـەنگ و جـەدەڵ، مـەشووم وە ڕاوە
چو شا مـەنیشووم، وە تـەخت «شـاوە»[2]
ئـــــەرکـــــەسێ بــەیۆ، وەو ڕاگــوزەردا
چـەرخش مـەدەرووم، وەڕووی چـەمەردا
قولەی سەرکاوان، مـەگێرووم وە جـەخت
تـاچ مـاوەرۆ، مـوهرەی تـەختەی بەخت
چوارشەممە و حەفتم، سـیام بـی و بـەهار
هەزار و سێ‌سەد، چهل و سێ[3] «سەردار»
بـــار کـــەرد و بــەردش، خـــانمان وێش
خــاڵی جــە داد کــەرد، دیـواخـان وێش

---

١- بە حیلە و قەسەمی درۆ ـ فێڵ.
٢- مەبەست کێوی شاهۆیە.
٣- ١٣٤٣ ی کۆچی مانگی.

ئیبتدا «سەردار ئەکرەم» بی ئاگا
هەر بەو شەو فەوری، شەبیخوونش دا
هەر بەو شەو نامەش، بە شادی و سروور
نووسا بە «ئەمیر»، لەشکەر بەی دەستوور
«سەردار» بارکەردەن، ئەر لێت حاڵییەن
سێ ڕۆژە تەلار، قەسرش خاڵییەن
«ئەمیر» دا نامەی، فەتح و بەشارەت
قەرائەت کەردن، وە چەن عیبارەت
بە وێنەی نادر، پەی فەتح ئەفغان
حەرەکەتش دا، سپای بێ سامان
«وەکیڵ جوانڕۆ»، شنەفتش خەبەر
«سەردارە ئەکرەم»، گرتەن «ڕوانسەر»
غوڕا وێنەی شێر، بێ پەروا و بێ غەم
وات: بە «ڕوستەمبەگ»، نامی چون ڕوستەم
ڕاهی بەر بشۆ، وە بێ درەنگی
چەنی «عەزیزبەگ»، ئەژدەهای جەنگی
«حەسەنبەگ» چەنی، نامی «حوسەینم»
عەزیزتر لە نوور، بینایی عەینم
تا شەفەق لە شەو جیا بۆ چون دوڕ
مەبۆ بگێران، قولەی «یەلەوڕ»[1]
بوەر چەنی وێت، لازمەن هەرچی
سەنگەریەنی کەر، چون باش توفەنگچی

---

١- شاخێکی بەرزەلە باکووری شاری ڕوانسەر قەراری گرتووە.

«سان» ئەورامان، بە تەڕ دەماخی
فەرماش «ئاغەبەگ»، میر قشڵاخی
بفەرما یەکسەر، بەگ و بەگزادە
موسەلەح پەی جەنگ، ببان ئامادە
حەتمیەن ئیمشەو بەر لە لیزگ خوەر
مەبۆ بپۆشیم، سەحرای «ڕوانسەر»
داشان لە دەهۆڵ، نام حەق بەردن
فەوری هەر بەو شەو حەرەکەت کەردن
مەواتی سپای، «سەلم» و «توور» جۆشان
چون موور و مەلەخ، «ڕوانسەر»پۆشان
«گەشکی» و «بیڵەوار»، «سوور سوور» بەو وێنە
ڕاهی بین لە ڕای، «ناڵە شکێنە»[1]
سپەهبود فەرما، بە «ئەمیر مەخسووس»
ڕازنسان پەرچەم، وێنەی نەوعەرووس
شەیپوور حازر باش، ژەندن هەر بەو شەو
ڕاهی بی سپا، وە دەوان دەو
بریق بساق بەرق، قوبەی بەیداخان
ئەو شەو وێنەی، ڕۆژ، کەرد وە چراخان
لە زەربەی ستوور، سەدای نای و کووس
هەوا تەمەنگێز، سەما ئابنووس
وا وێش تەیار کەرد، «ئەمیر مەخسووس»
پەی جەنگ ڕۆستەم، مەگەر «ئەشکبووس»

١- ملەیەك وكەژێکی بەرزکە وا لە بەینی «ڕوانسەر» و «کامیاران»دا.

یەڵغار[1] دان وە جەخت، چەنی لیزگ خوەر
زاهــر بــی لێشــان، قــولەی «ڕوانســەر»
سەدای تەپڵ و کووس، ناڵەی نای و سەنج
تۆپچی ئاگـر کـەرد، تـۆپ سـەد و پـەنج
ئـەڕابـەی جـەنگی، کـۆی خـارا شکـاف
ئـەفسەران چــون شـێر، کـێشانە مـەساف
ســەربازان بــە نــەزم، تـەپاڵ و مـووزیك
ئـــەفسەران بــەستن، ســەف تــاکـتیك
قــڕەی «مـوسەلسەل»، شـاوەی «شـنیدەر»
ئــاتەش ئەفشان بــی، ئـەو ڕۆ «ڕوانســەر»
مــەخسووسەن «مـا زەرد»، ئـاگـر مـەڕێزا
بــۆی پــڕووز لە ڕێــز، «کـاشتەر» مـەخێزا
«کۆشك»[2] و «بان کۆشك» و سینەکەی «قولە»
گوڵ گـوڵ بـی یـەکسـەر، لە گـڕەی گـولە
ئــاگــر وست وە کــۆی، کـاو هـێڵەوڕ[3]
چـون نــار «نـەمروود»، مـەگـڕیا گـڕگڕ
کــووچە و خــەیاوان، مــەغازە و بــازار
گشت وە تــیر تــۆپ، کـەردن یـەختەسار
«ڕوانســەر» وە خـاك، دەشت ڕەی کـردن
بــاغ و بــاغاتش، یــەکسـەر پـەی کـردن

---

١- هێرشی سواران.
٢- مەبەست کۆشکی «فەرهاد»ە کە لە کتێبانی مێژوویدا بەقەبری کوچکینی دەورەی «ماد» ناوی لێ براوە وە لە بەشی خۆرهەلاتی شاری «ڕوانسەر»ە.
٣- شاخێکی بەرزە لە پشتی شاری ڕوانسەر.

تا حەفت ڕۆژ دستوور، تیرئەندازی بی
لە دوای حەفت ڕۆژە، «ئەمیر» ڕازی بی
خاس وە ئارەزۆی، خوەی نەفسی دا
ئەو وەختە دەستوور، ئاتەش بەسی دا
بەعزێ فەراری، ئەتراف جەم کەردن
ئاوەردن یەکسەر، قەلع و قەم کەردن
«سەردار موقتەدر»، «سالارە زەفەر»
شێران جەنگی، با چەندین نەوکەر
چون شێر زامدار، خار نێش لە جەرگ
خەشمی و خەشمناك، بێ ئەندێش لە مەرگ
بەور دەریا دڵ، سەردار سەروەر
بێ خەبەر وارد بین وە «ڕوانسەر»
مەخسووسەن «ئەمیر، مەخسووس» بی لە ڕلش
ئینتیزارش بی بشۆ وە خەرگاش
زەڕە ئیعتنا، بە ئەو نەکەردن
تەشریف وە خەیمەی، سپەهبود بەردن
«ئەمیر ئەحمەدی»، لوتف لەتیف کەرد
بێ پەزێرایی، هەردوو تەوقیف کەرد
ئەو وەخت دەستوور دا، ئێڵ کەمانگەر
یەختەرمە کەردن، با ئاغە و نەوکەر
چەند ڕۆژ بە ڕاحەت، ئاب گۆشت وەردن
فراری ئەتراف، یەکسەر جەم کەردن
کاراگای مەخفی، ئاگا لە کار بی
باخەبەر لە وەزع، ئێڵ «سەردار» بی

ئــاما و بــەیان کــەرد، دانــای مــووشکاو
وات: «سەردار» بەردەن، مـاڵش وە «ڕەزاو»
وەلێ «عــەمەڵەی»، «ڕوانســەر» یـەکسـەر
جــاگــیرەن لە کــاو قـولەی «تـەنگیبەر»
«ئــەمیر» و هــامڕاش، درەنگ نــەکـەردن
کــمیسوون کـریا، شـەور جـەنگ کـەردن
«ئــەمیر ئـەحمەدی»، ئـاگـا لە کـار کـەرد
ئــیرادەی غـارەت، ئـێڵ «سـەردار» کـەرد
واتش: وە «کریش»[1] مـەخفی نـەك زایـەر
چـــوار هــەزار نــزام، سـپان عــەشایەر
ســەید «حــبیباللە»ی دانــا بــی حـالی
«ئــەمیر» کــەردەن قــەس، غــارەت والی
نــامە نــویسا، بــەو ســوخەن ســەنجی
لە بــەدبەختی بـەخت، داش وە هـەجیجی
فـەرامـۆشش کـەرد، کـەفت وە نـاو کـۆڵان
وە دوو ڕۆژ وەحاڵ، شی وە «چـواردۆڵان»
نامەش دا وە دەس «موحەمەد ساڵح خـان»
مـــوتالعەش کــەرد، ئــەژدەهای دەمــان
نووسابیش ئەر هـەی، نـوور بـینای عـەین
«موحەممەد ساڵحخان»، ئاغەی «سەید حوسەین»
حـــەفتهەزار ســـپا، ســـەفئارا کـــریان
دەســتوور غــارەت، ئــێوە پــێش دریـان

---

١- ناوی ئەفسەرێ فەرانسەوییە.

ئامان سەد ئامان، دەخیل سەد دەخیل
گۆڵ نەخوەن وە قەوڵ، بورهان و دەلیل
هەنی جەی بابەت، بێ تەدبیر مەبان
هۆشیار بان ئامان، غەفلەت گیر مەبان
وات: وە هەجیجی، مسار بدۆ لە پای
کۆسە ناوەرۆت، پەی چی دێر ئامای
ناغافڵ سەدای، تیر تفەنگ هات
دەرو دۆڵ و یاڵ، سارا وە تەنگ هات
قەقەی موسەلسەل، ڕەگبار و تەك تەك
دەدەی تۆفانی[1]، یەك لە بان یەك
شەهنەی «شنیدەر»[2]، ناڵەی «کۆساری»[3]
«شاوە» نیشت لە شین، زایەڵە[4] و زاری
دەنگ «چواردۆڵان»، ناڵەی «تەنگی خاو»
دڵ ئەر جەسەنگ بی، مەکەردش وە ئاو
زیرەی ئەتفالان، قیژەی ژن و مەرد
مەپێچا لە کاو کۆی «هەلاڵە زەرد»
ژنان مەوەردن، تفەنگ پەی مەردان
مەردان خۆ مەدان، لە گولەی هەردان
دە، پانزە نەفەر، جەنگی جەم وەردن
شێرانە چون شێر، شەور جەنگ کەردن
وە عەقیدەی پاك، نام حەق بەردن
شێرانە پەی جەنگ، دەس بەر ئاوەردن

---

١-کەرەسەی جەنگی ئەو ڕۆژەیە.
٢-کەرەسەی جەنگی ئەو ڕۆژەیە.
٣-کەرەسەی جەنگی ئەو ڕۆژەیە.
٤-دەنگی گریان و شین.

قـاو و قـوای قـوو کـەفت لە سـەر کـاوان
نـرکەی تـۆپ قـولەی، کـاوان مـەتاوان
هەر سەدای دەس خوەش، تەقەی تفەنگ بی
قـڕەی مـوسەلسەل، پـەلاشەی سـەنگ بـی
مەغلەتەی مەخلووت، مەغلووبەی جەنگ بی
مـەردان دڵئـاوەر، نـامەرد دڵتەنگ بـی
نـاڵە نـاڵ دەنگ، قـولەی کـۆساران
گـولە هـەر وەك تـاو تـەرزە مـەواران
هـەور لە جـای بـاران، ئـاگـر مەڕێزا
بـۆی پـەرداخ لە کـۆی، «شـاوە» مـەخێزا
لە کـوورەی گـڕەی، گـولەی «شـنەیدەر»
ڕەستاخێزێ بـی، ئـەوڕۆ چـون مـەحشـەر
«فـرج الله بـەگ»، دانـا وە تـەدبیر
چـەنی «عـەلیبەگ»، زەنـندەی دلیـر
«ئیبراهیم[1] مەنمی»، دەس وە تـفەنگ بـی
چـابك و چـالاك، داخـڵ وە جـەنگ بـی
«عەلی عەلی میرزا»[2]، شەنگدان بەست وە پوشت
وە خەنجەر دوشمەن، لە سەنگەر مەکوشت
«عەلی عەلی میرزا»، و «ئەوڕەحمان عەزیز»
هەر دوو چون پەڵەنگ، چالاك و تـوندخیز
«حـەسەن[3] مـەلا مـوستەفا»ی عـاقڵ
نـاوەرد وە خـەیاڵ، خـۆف مـەرگ لە دڵ

١- خەڵکی «مەنمی» بووە.
٢- هەردووکەس لە تایفەی دوو ڕۆیی بوون.
٣- خەڵکی ئاوایی بناوەچ (ڕوانسەر) بووە.

«حەمەمین[1] کەنعان»، با «وەلی کاکی»[2]
لە قەلب سپا، دان وە چالاکی
جەنگی چەن نەفەر لە گۆشە و کەنار
لە سپای دوژمن، مەکەردن قەلار
تەك تەك تفەنگچی، سەرەڕا گەردن
هەی ڕۆ ڕای دوژمن، وە بنڕاکەردن
یەکێ لە ئەقوام، فامیلی سەردار
لەو جا حازر بی، ڕوستەمانەوار
شێر بەچەی شەجیع، بەنی ئاردەلانی
دەس دا وە پەنج تیر، ساخت ئەلمانی
تفەنگچی تەڕدەس، دوور کوژ جەگەردوڕ
ڕوو کەردش وە تیپ، سەمسام «کەلهوڕ»
«سەمسام» ئێدش دی، غوڕا وێنەی شیر
هەی کەردش لە خان، دەس دا وە دەتیر
«موحەممەد سالحخان»، لە مەرگ نەتەرسا
لە ڕێز دەتیر، «سەمسام» نەپەرسا
نەکەردش ئەندێش، پا نیا وە پێش
چمان[3] گورگێ بی، نیشت لە گەلەی مێش
ئی تیپ وە ئەو تیپ، ئی بڕ وە ئەو بڕ
شکست دا وە تیپ، «سوور سووری» و «کەلهوڕ»
«عەلی عەلی میرزا» و «ئەوڕەحمان عزیز»
مەڕێزان لێشان، سەر چون گەلاڕیز

١- خەلکی لادێ بناوەچی ڕوانسەر بووە.

٢- خەلکی لادێ بنچلێی «ڕوانسەر» بووە.

٣- وەکوو.

بـــی وه قـــوای قـــوو دەس دان وه دەمـــدا
ســـپا چـــون تـــۆمار، پـــێچان وه هـــەمدا
ڕەعـــــایەت نـــــزام، کـــــەردن وه زایـــەر
ئـــەغڵەب مـــەشەندن، دەس له عـــەشایەر
وەشت تـــــاو تـــــیر، گـــــوله مـــــەواران
چـــون غـــوڕشت وەشت، هـــەور بـــەهاران
«سولتان کریش خان» خولقش وه تەنگ بی
عـــەزم گـــورێز کـــەرد بـــێزار له جـــەنگ بـــی
ڕای فـــــرار نـــــەوی نـــــەداشـــتن چـــاره
بـــێچاره ئـــەو شـــەو گشت بـــین بـــێچاره
ســـەوار بـــی وه جـــەخت، پـــا نـــه له ڕکـــیو
بـــــه فـــــەرنـــەوی واتش: «هـــاڕنەبیو»[1]
ڕاشـــــان بـــــەسته بـــی، نـــەداشـــتن چـــارێ
ئـــەو شـــەو بـــەردشان، پـــەنا وه غـــارێ
«غوڵامڕەزاخـــان»، «ســـەمسام» شـــەهید بـــی
له زنـــــدەگـــــانی، وێش نـــــائومید بـــی
ڕا لێشـــــان بـــــەستن، بـــی وه چـــارەسەر
گـــــرتن بـــــەرەڕێی، ســـوار له کـــەمەر
بـــــەتیه بـــــی وه بـــالّ، کـــڵاو له ســـەردا
ســـــوار بـــی وه دالّ، له ڕووی کـــەمەردا
تـــــفەنگ و شـــــەنگدان، وه قـــــەتارەوه
یـــــادگاری مـــــەند، وه مـــــەغارەوه

---

١- بەمەعنای ڕاکردن و پاشەکشەیە.

نـــاڵە نـــاڵ دەنگ، شـــین ســـەرکاوان
لاشـــەی بـــێ ســاحێو لاشـخوەر مـەلاوان
بـــی وە واوەیـــلا، کـەس نـەوی وە کـەس
تـــەسلیم کــەردشان، دەس لە بـــان دەس
دەســتوور دان نــزام، بـــاز کـــریا ڕاشـــان
فـــەقەت مـــەکـــەندن، پـــێڵا لە پـــاشان
فـــەلەج و مـــاتەم، مـــاتڵ وە پـــاوە
نـــــەتاوان پـــایە، بشـــۆن وە ڕاوە
مەردان ژەندن تـەپڵ، شـادی و بـەشارەت
ژنـــان ئـەسپ و زیـن، بـەردن وە غـارەت
چـــون گـورگ وە گـەلە، قـەلار مـەکـەردن
پـــیادە و ســـوار، ســەرەوخوار کـــەردن
ئەسپ و زین و بـەرگ، بـێساحیب هـەزار
تفەنگ کەفت وە بـار، فـیشەك وە خـەروار
«سەرگەڕ»[1] کەفت لە دەور، «داڵ»[2] لە کەشان کەش
پـــەڕو بـــاڵ وســـتن، لە دەوران لەش
لاشەی «ئەسپ» و «مەرد»، پەڕباران کەردن
بـــاڵ وە ســـایەبان، زامداران کـــەردن
نـــەویەن نـــمەبۆ، لە ڕووی ڕۆژگـــار
وەی تەورە جەنگێ، یـەك لە ڕووی هـەزار
ئەو حەول‌و حەوشە، یەکـــەر وە تەنگ هات
ڕای عـــبوور بـــڕیا، لە بـــۆی فـــەتەنات

---

١- باڵندەی لاش خورە.
٢- پیشین.

ئــــەگــــەرچ فــەردم، ئـیغراق ئـامێزە

خـــــیلافش نــــیەن، بـــــزانــــن ڕێــزە

ئــوردوو شـەل و پـار، زەخـمی مـەینەتی

یــــاوان وە ئــــەمیر، لوخت و پــــاپەتی

عــەشایەر هــەرکـەس، پـەی وڵات وێش

پـاشیا و پـەشێو بـین، خـار و خـاتر ڕێش

بــە جــام فــریب، نگـاکــەرد «ئـەمیر»

بــەنای بـازی کـەرد بــە تـاس تـەزویر

وات: بــە «شــرفالمــلك» ئـەولاد والی

گۆش دەر وە گـوفتەی، ئـەمرم بـەر حـالی

تــــەئمین نــــامەیە، پــــەی یــــادگاری

بـــنوسە دێـــهات، مــەندە و فــراری

عەفوو دەر هەر یـەك، بـەیۆ وە جـای وێش

خاترشان جەم کـەر، بـێخۆف و ئـەندێش

فــراری هــەرکەس، لە هــەر جـایە هـەس

زنــدەگــی وێــشــان، نــەدەروون لە دەس

عــــەفو عــــمومی، مــــەدەروو پــێشان

ئــومێدەوار بسان، وە جــاگــەی وێشان

وە قــــەید قــورئان، بـاوەران وە پــەس

بــواچــە ئــەمیر، مەیل خـاسیش هـەس

«شـرفالمـلک» فـەوری وە ئـەمر «ئـەمیر»

بە ئینشای شیرین، نـامەش کـەرد تـەحریر

کــــەدخوداواری، ئــــەعیان و ئــەشراف

جـەم دان ئـاوەردن، یـەك یـەك لە ئـەتراف

تـا یـەك مـاه «ئـەمیر»، لە «ڕوانسـەر» بـی
فـەقەت تـەوەجوش، دەفـع خـەتەر بـی
تـەنها یـەك هـەزار، سـەربازش مـا بـی
ئـەسڵەحەی وێشـان، لە دەس نـەدا بـی
دەسـتوور دا «ئـەمیر»، خـار خـاتر ڕەنـج
ئـاوەردن مـێعمار، مـاهر پـەرێش پـەنج
واتش: بـە ئـوسووڵ، بـرج بسـازۆن پـەنج
وە فنوون جـەنگ، خـاس تـر لە شـەترەنج
پەنج برج موستەحکەم، وە ئوسووڵ سازان
پـەی دفـاع وەخت، سـەخت سەربازان
هەر پـەنج بـرج سـازان، دانـای مـەعنەوی
«قـوله» و «قـەڵاگـە»، و لە «تـەپە قـەوی»
«کـووورەخانە»کـەو کـاو «هـیڵەوڕ»
مەدرەوشان لە دوور، هـەر بـە وێـنەی دوڕ
پـەی خـاتر جـەمی، ئـەمیر لەشکـەر
پـۆس‌بەنی کـریا، دەور «ڕوانسـەر»
بەعد ئەمیر لەشکـەر، لە «ڕوانسـەر» چـوو
مـەئمووریەتەش، دا وە «گـریگوو»[1]
سەرهەنگ «گـریگوو» بـا سـوڵتان کـریش
داشـان بـە مـەردوم، ئـەمنی و ئـاسایش
«گـریگوو» جـامەی تـەزویرش پـۆشا
پـەی گـرتن «سـەدار»، مـەردانـە کـۆشا

---

١- ناوی ئەفسەرێکی ئەجنەبیە.

چەند کەس لە ئەشراف، نامی قەبیلە
وە قەید قورئان، کەرد وە وەسیلە
وە دانەی نەیرەنگ، ڕەنگ ئامێزی کەرد
پایەی دۆسیشان، خاس پەی ڕێزی کەرد
ئەرقەزا لە چەرخ، بدۆ باڵ و پەڕ
دانایان دەور مەبۆن لاڵ و کەڕ
سەرهەنگ «گریگوو» با چەندین سوار
سەوار بین وە عەزم، دیدەن «سەردار»
«سەردار» حازر بی، وە مەلاقاتش
یاوا وە پسلەی، ئەوەڵ نەهاتش
واتش: بە «سەردار»، مەشووم وە «تاران»
ماوەرووم حوکمێ، خاس‌تر لە جاران
خەیاڵان خام، لە دڵ خالی کەر
وە خەیاڵ ڕاحەت، پەی وێت والی بەر
بە شەرت شەرەف، بورهان و دەلیل
وە قەید قەسەم، «قورئان» و «ئینجیل»
بەوتەور دان وە هەم، دەست برایی
نەبۆن تا بە ڕۆی، مەردەن جیایی
«سەردار» حازر بی، وە بێ‌دردسەر
بە هەمرای سەرهەنگ، هات وە «ڕوانەر»
ماشین حازر بی، فەوری ئاورەدن
«سەرهەنگ» و «سەردار»، پەی «تاران» بەردن
سەردار لە «تاران»، کەفت وە مەترسی
مەبغووز نەزەر، ئومەرای کورسی

حاڵی بی «سەردار» یەقین بی پەرێش
دەستگای دەوڵەتی، بەدبینەن جە لێش
کەفت وە تەقالا، پەی ڕستگاری
بین وە هام دەستش، دوو کەس دیاری
هەر دوو پایەبەرز، نامی و مەشهووری
یەکێ «مەقسوودی»، یەکێ «تەیمووری»
بە شەو وێنەی ڕۆ، ڕۆشن بی ڕاشان
بێ ڕا ڕاکەردن، تا وە «کرماشان»
حەمیدە[1] خانم، «شرف الملوك»
مەعرووف نامی، لە چەندین بلووك
دارای شەرافەت، با وەقر و نەجیب
نەجیبەی ناجی، بە تاریخ تەرکیب
ماڵ و مەنزڵش لە «کاشتەر»[2] بی
لە ئامای «سەردار»، وێش باخەبەر بی
دەستوور دا فەوری، دانای پڕ کەماڵ
کەفت وە تەدارك، تەهیەی ئیستقباڵ
پەنجشەمە شەو بی، نەزدیك بە زەواڵ
«سەرداره رەشید»، وارد بی وە ماڵ
مەردم لە ئەتراف، وە دیدەنی هات
ئاوەردن وە بار، دەها سوور سات
خان و خەوانی، لە چەندین لاوە
جەم بین بار کەردن، شین وە «چاڵاوە»

١- ژنی «سەردار ڕەشیدی ئەردەڵان» بووە.
٢-گوندی سەر بەشاری کامیاران کە مەرقەدی حەزرەتی «عکاشە» لەوێیە.

خــەیاڵ تــەسخیر، «ڕوانســەر»ش بــی
وە هــیچ وەج پــەرێش، مــیەسەر نــەبی
ئــیڵ «دوو ڕۆیــی»، چــەندین خــانەوار
«با شۆکی» جـەم بـین، لە دەور «سـەردار»
«کــریش» وە خــەیاڵ، ئــینتقام وێش
لەکــە بســەردارۆ، لە ســەر نــام وێش
نــزام دا ســەرباز، پــیادە و ســوار
حازر بی دیسان، پەی جـەنگ «سـەردار»
سـەرتاسەر «زەڕنـە» تـا «چـەشمە سـفید»
ســەربازان پــۆشان، وە خــۆف و ئومید
«ســەردار» چـون «نـادر»، دانـای دڵـنەواز
دیش خـەیمەو خـەرگای، نـزام سـەرباز
فەرمان دا فەوری، بـە «سـوڵتان مـوراد»[1]
مــەردانــە مــەردی، بساوەرۆ وە یساد
چــەن نــەفەر جـەنگی، تـفەنگچی عـاقڵ
بـوەر چــەنی وێت، هـیچ مـەبەر مـاتڵ
زوو لە ســـەر پـــلە، بـــیاوە پــێشان
ڕاگــەی «لۆن» وە تــەنگ، بگـێرە لێشـان
«ئـــاسوڵتان مـــوراد»، بـەور دەریسادڵ
دوو مــاە و یــەك ڕۆژ، بی وە قـەرەوڵ[2]
چـەنی چـەن نـەفەر، تـفەنگچی تـەڕدەس
ڕاگەی دوو هەزار، سەرباز کەرد وە بـەس

---

١- یەکێ لە ئەمیر هێزانی ئازای «سەردارڕەشید» بووە.
٢- چاودێر ـ نگابان.

وەلێ فکــر عــێڵ، ســەردار بــاتڵ بــی
بــەتاڵ بــین وە دڵ، وەخت حــاسڵ بــی
فکرش کەرد «کــریش»، فــەوری وە ئــاسان
یــەك نــەفەر لە ســەمت، والی «لوڕســان»
با نامەی جــەعلی، کیاست پــەی ســەردار
بــە نــەوعێ ســەردار، پــەی نــەورد وە کــار
«سەردار» سەریەس کەرد، عێڵش کەرد وادار
بــار کــەردن یــەکســەر، لە دەور «ســەردار»
بــی وە چــارەسەر، پــاشیان و پــەریش
ئــەمر هــێرش دا، بــە فــەوری «کــریش»
«سوڵتان موراد» بی، لەو دەربەندە ســەخت
سەرەڕای ئوردووی، «کریش» گەرد وە جەخت
دە نــەفەر بــا دووهــەزار جــەنگ کــەردن
خــولق ســەرباز و نــزام تــەنگ کــەردن
با «مــیرزا مــوراد»[1] جــەنگ شــێر کــەردن
هــەرڕۆژ چــەن نــەفەر، ئــەسیر مــەکــەردن
«سوڵتان موراد» سەخت، پەشێو بی حــاڵش
ئــــەسابەتش کــــەرد، گــــولە وە بــاڵش
«سەردار» دی بەرگەشت، وەی تەور ئیقباڵش
ئــــەمر کــەرد بــەردن، مــاڵ و مــناڵش
«ســـەردارە ڕەشـــید»، بــەرشی لە چــادر
گێڵیاوە پەی جــەنگ، نــامی چــون «نــادر»

١- یەکێ لە سەر پەلانی هێزی «سەردار ڕەشید» بووە.

وات:«غوڵام حوسەین»[١]، پشت مەدە وە جەنگ
مەردانە جەنگ کەر، دڵ ساوەر وە تەنگ
«غوڵام حوسەین خان»، پشتش دا وە سەنگ
مەردانە جەنگ کەرد، بە وێنەی پەڵەنگ
سەخت«ئەحمەد عەسکەر»، با «شوکری چاوش»
پای نوردووی «کریش»، کوان وە ساوش
«موحەمەد ساڵح خان» نەکەردش درەنگ
هەڵوی وە هەڵمەت، دەس دا وە تفەنگ
«شێخ مەجید» مەکەرد، جەنگ وە بێ‌قەرار
مەر «ڕوستەم» لە جەنگ، بۆ «ئەسفندیار»
نامی «ئەمین بەگ»، تیژتر لە شایەن
چون باز لە شکار، ژەرەژ بی تایەن
هەڵۆی تاریکی،[٢] شاباڵش گۆشا
ڕووی ڕۆژ وە شاپەڕ، سیای وێش پۆشا
نە کەسێ کوژیا، نە کەسێ گیریا
شکار دەسی، وە شکار کریا
سوار بی «سەردار»، چەنی تفەنگدار
لە تەنگ «گولیجی»[٣]، شەو گرتن قەرار
نە نەهار نە شام، سوبح سەحەری
هیچکام نەوەردیم، ئاغە و نۆکەری

---

١- غولام حوسەین خان ئەردەڵان برازای «سەردار ڕەشید» بووە.
٢- مەبەست شەوە.
٣-کەژی بەرانبەری شوانکارەیە سەر بەشاری جوانڕۆ.

ئـــاگـــا بــی وە کـــار، «حـــەبێ خـــان» زانــی
کـــەفت وە تـــەدارەك، تـــەهیەی مـێهمانی
وات: وە میر ئـاخورِ چـەن ئـەسپ و قـاتر
ئـــــاوەردن کـــــەردن، ئـامادە و حـــازر
ڕۆن و بـــرنج و چـــەند گـوشت و پـەروار
دەسـتوور دان بـەردن، نـان و ئـارد وە بـار
بـــەگ و بـــەگزادە، تـــفەنگچی و ســـوار
بـــە تـەور کـۆمەك کـیاست پـەی سـەردار
ڕەســـــــم ئـــــیحترام، بـــــەردن وە ڕاوە
ڕەوانـــەش کـــەردن، تـــا شـین وە «پـاوە»
«موحەممەد ڕەشیدبەگ»، نوور دیدەی «سان»
کـــــەردش ئـیستقباڵ، والی «کـــوردسان»
ئـــەعیان و ئـــەشراف، عـــولەمای «پـــاوە»
کـــــەدخودا و ڕایـــەت، لە چـــەندین لاوە
جـــەم کـــەردن بـــەردن، لە هـــەر وڵاتـــێ
هەر یەك پەی «سەردار»، سـەر و سـەوقاتێ
مەحز مـەسڵەحەت، چـەند ڕۆژ لە «پـاوە»
خـــەستەگـــی بـەر کـەرد، لە «پـاوە» مـاوە
واتش: بە «سەردار»، «مـوحەممەد ڕەشـید»
ئـــــــومێدەوارم، نـــــــەبی نـــــائومید
ئـــیستدعام ئـــێدەن، والی «کـــوردسان»
واجــــبەن کـــەری، دیـــدەنێ لە «ســـان»
«ســـەردار» بـــە مـــەرام، مـوراد مـەقسوود
وە عەزم دیدەن، «سان» شی وە «نەوسوود»

«سوڵتان» جە ئامای، «سەردار» بی حاڵی
زوو تەشریف ئاوەرد، وە ئیستقباڵی
چەنی فەرزەندان، فەرماش بە سالار
خەیرەمەقدەمش، عەرز کەرد بە «سەردار»
دەست تەوازوع، سەردار دا پێشان
مننەت تەشریف، فەرمایش کێشان
چەند ڕۆژ لە «نەوسوود»، سەردار بی ماتڵ
مورادش لە لای، «سان» نەبی حاسڵ
«غوڵام حوسەین خان»، «غوڵام عەلی خان»
هەر دوو شێربەچەی، بێشەی ئەردەڵان
برازای «سەردار»، تازە ڕەسیدە
گرامی‌تر بین، لە هەر دوو دیدە
خزمەت گوزاران، شایستە و لایق
هەمیشە لە جەنگ، فاتح و فایق
لە بەین سوحبەت، والی «کوردسان»
ڕووی خەتابش کەرد، وە «جەعفەر سوڵتان»
مەنزوورم ئێدەن، وێنەی زاڵ زەڕ
ڕانمایم کەر، لە خەیر و لە شەڕ
ئەر موافق بی، چەنیم وە تفاق
خەیاڵم کەردەن، بشۆم وە «ئێراق»
جەواب دا «سوڵتان»، سان سام سەنگی
وە شەرتێ نەبۆ، پەرێم وە نەنگی
ماچووم بەڵەدێ وە بێ بەهانە
هەر ئیمشەو وە جەخت، کەرووت ڕەوانە

ئەمری فەوری دا، هەر بە شەو «سەردار»
بنە بار کردن، سەوار بی سوار
سەوار لە دنبال، بەڵەدێ لە پێش
ڕاهی بین چون شێر، نەکەردش ئەندێش
بە شۆخی و سوحبەت، بە خەندە ومەزاق
تا یاوان وە شار، «پێنجوێن» «ئێراق»
حکوومەت «پێنجوێن»، چەنیش یاری کەرد
بە مێهرەبانی، مێهمانداری کەرد
نامەی بە «مەلیك»،[1] نووسا «شێخسەعید»
تەشریف فەرمایی، «سەردارە رەشید»
مەلیك لە مەزموون نامە بی حالی
تەشریف ئاوەردەن سەردار والی
مەلیك سادات، ئەشرەف شەریف
فەرمانی فەوری دا، وە «شێخ لەتیف»
«شێخلەتیف» بە لوتف، جلوەو جەلاڵش
حازر بی ئاما، وە ئیستیقباڵش
خوەش بی «سەردار» و شێخ وە یەك یاوان
هەر دوو پەڕەی لەب، چون گوڵ شکاوان
چەنی هەم هەر دوو تەوازح کەردن
سەلام و سەفا بە وازح کەردن
بە گەرمی و نەرمی، دەست هەم گەردن
دەست نەوازش، وستن وە گەردن

---

١- مەلیك مەحموود.

«سەردار» چەنی شێخ، شێر شێرشکێن
چەند ڕۆژ ئیسراحەت، کەردن لە «پێنجوێن»
بە مەیل و مەرام، بە شادمانی
حەرەکەت کەردن، پەی «سلێمانی»
«مەلیك» بە قودرەت، قەدر کەماڵش
تەشریفش ئاوەرد، وە ئیستقباڵش
دوو عالی مقدار، ساحێب قەدر و شان
مەلیك «عێراق»، والی «کوردسان»
وێنەی پەروانان، بێ‌پەروا و بێ‌غەم
شاد بین بە شۆڵەی، دین دیدەی هەم
مووزیك سەلام، مەلیکی ژەندن
سروود سەنای، سەرداری وەندن
هەر دوو نابغەی، ڕووی ڕۆزگار بین
هەر شەو لە شەورو ڕۆژ لە شکار بین
چەند ڕۆژ بە وەشی و شادی و بەشارەت
ویاران، یاران، غەم دان بە غارەت
«سەردار» لە خەڵوەت، وە یاد ئاوەردش
پەی «مەلیك» یەك یەك، دەرددڵ کەردش
«مەلیك» بە مەرام، مەقوود والی
فکرش کەردەوە، وەختێ بی حالی
«مەلیك» لە جەواب، «سەرداره رەشید»
وات: بەستەن، نیەن، لە ڕا، ڕای ئومید
مەقدوورم نیەن، سەرباز و عەسکەر
بدەم بوەری، پەرێ «ڕوانەر»

وەزع سیاسی، مـن شـیرین نـیەن
چون دموڵەت «ئینگلیس»، لێم خوەش‌بین نیەن
سەلاحەت ئـێدەن، چـون بـاش دلێـران
دووبـاره تـەشریف، بـوەر وە «ئـێران»
«سەردار» لە «مەلیك»، هیمەت خواهی کەرد
«مەلیك» بە مەعزوور، «سەردار» ڕاهی کەرد
چـەند شـەبانەڕۆ، ڕا نـەبڕاوە
ڕاگـە تـەی کـەردن، یـاوان وە «پـاوە»
«حـەمیدەخانم»، خـاس تـر لە بـولبوڵ
تا «سەردار»ش دی، لەب بازکەرد چون گوڵ
ڕێـزنا ڕازان، ڕێـزەی شکـەرڕێز
شیرین چـون شیرین، شـابانووی پـەروێز
وەش ئامایی وەش، بـە دڵخـواهـی کـەرد
ئەو شەو تەهیەی شام، شـەهەنشـاهی گـەرد
بـەر داوە زوڵـفان، دێـز مـوشکین بـاف
چون ڕەش‌مار وە بان، میل سیمای سـاف
خـەت ئـەبرووان، وا کـەرد خـەتاتی
نـەقش بـەست لە ڕووی، نـوقرەی نـەباتی
چـەرخش دا وە چـەم، چـون بـاز ئـاڵۆز
بـە شـێوەی شـیرین، شـەیدای شکـاردۆز
ڕەونەق دا بە ڕەنگ، ڕەنگینش چـون گـوڵ
دڵـداری «سـەردار»، وێش مـەدا وە دڵ
گۆشوارەی تەڵای، زەردش کەرد وە گـۆش
دڵ ئەر لە سەنگ بێ، ماوەردش وە جـۆش

بــــەیازەی بــــەیزای، بــاڵای نــەمامش
جــــەڵاڵ جــــیلوەی جــەمین جــامش
شکەست وە بەرزی، نەی‌شەکەر نەی‌دا
خــەجاڵەت وە جــام، جــەمشید کەی‌دا
بێ‌گەردی گــەردەن، چــون بەیزای بلوور
چــون شــەمع خــانان، مەدرەوشا لە دوور
تــیتەی جــەواهــێر، دانــەی زەبەرجەد
کەمەرەی زیــبای، زێــوش بەست وە قەد
مــــرواری غــــەڵتان، بــاهوو بــەند لاڵ
شــیرین سفەتان، بە نــاز بەست وە بــاڵ
دانــەی دەنــدانــان، یەك‌یەکــی چــون دوڕ
ئاراستەی ئۆستای، سونع ساحێب سڕ
زەردی گۆی زەنــەخ، وێــنەی تەڵای نــاب
شــەڕ مــەکــەرد چــەنی، لیزگ ئــافتاب
بە ڕووی لوتــفەوە، شــیرین شــەرم شــەور
فەرماش: بە «سەردار»، حــاتەم‌تایی تــەور
لە کــــار مــــوشکڵ، مــەبەر هــەراســان
نــــیەن مــوشکڵێ، حــەل نــەبۆ ئــاسان
ئــەگــەر مــەیلت بۆ، خــەیلێ وە ئــاسان
تــــەشریف بــەر وەلای والی «لوڕســـان»
بــە شــەور و تــەدبیر، «ئــەبوو قــەدارە»
شــایەد بــاز کــەرۆ، پــەرێت ڕای چــارە
دەستوور دا سەردار، نــۆکــەران جــەم بــین
وا جەم بین چــمان، پــەروانــە و شــەم بــین

«کەدخودا عەزیز»، «عەباس کلانتەر»
با «میرزا ئەحمەد»[1]، دانای دڵاوەر
«قولی» و «عەلی ئەسکەر»، کڵاو سفید بین
نەوکەر مەخسووس، «سەردار رەشید» بین
هەر بە شەو «سەردار»، کارسازی کەردش
«غوڵام حوسەین خان»، بە هەمڕا بەردش
بەر شین لە «پاوە»، ڕاهی بین ئەو شەو
تا سفیدەی سوبح، بێ خوەراك و خەو
هێمان شەو لە ڕۆژ، خاس نەبی زایەر
شین وە «داروەسەر»، دیارگای دایەر
«سەردار» وە دووریین، وە کونجکاوی
بە ئەستۆ گەرتش، خاك «سنجاوی»
سەردار دووبارە، دێویا دەردش
یاوا وە گەردوون، هەناسەی سەردش
بێشەی «سنجاوی»، هەزار شێرش بی
نامی سەرداران، سەنگەرگێرش بی
شێرێ چون «سەردار، موقتەدر» بەڕاس
نەویەن نەمەبۆ، بکە ریش قیاس
«سەردار ناسر» و «سالارە زەفەر»
هەر یەك شاهێ بین، وێنەی «ئەسکەندەر»
«سالار موکەڕەم»، وە ئیکرامەوە
بەو گشت فەراسەت، فکر و فامەوە

---

١- مەبەست میرزا ئەحمەد داواشی‌یە.

ئاگا بی «سەردار»، تەشریف ئاوەردەن
شەل و شەکەت و شەو خاو نەکەردەن
کیاست ئاوەردن، فەوریِ وە مەنزڵ
پەی پەزێرایی، فەهیم فازڵ
ئەورۆژ لە قەڵای، «سالار موکەڕەم»
خەفتن بە ڕاحەت، بێ خەیاڵ و غەم
«ساڵحە خانم»، تۆشە تەهیە کەرد
وە سەد مەعزەرەت، پەی «سەردار» ئاوەرد
«سەردار» لە «سالار»، هیمەت ستانا
سەوار بین وە جەخت، یا عەلی وانا
مەشیان وە ڕاوە، شەوان تا بە ڕۆ
بە ڕۆ مەگەرتن، مەکۆ لە هەر کۆ
بە شەو تەی کەردن، ئەو گشت مەحاڵە
ئاخر وە هەر حاڵ، شین وە «دێواڵە»
ئێڵ «عەمەڵە»، والی دین وە چەم
شوکر حەق کەردن، فارغ بین لە غەم
دی‌یان دوو هەزار، خەیمەی ڕەنگارەنگ
هۆر دریان هەر یەك، بەڕەنگێ قەشەنگ
شەو بی شەمئارا، چراخانێ دین
هەر ماڵی ساحیب، دیواخانێ دین
سەرسام بی «سەردار»، والی «کوردسان»
لە ئێڵ و ئەحشام، والی «لورسان»
پشت ماڵەی والی، دوو هەزار ماڵ بی
گشت گەپ و گەورە و خان «توشماڵ» بی

وە پرسان پرسان، وە حاڵ بین حالی
پەیدا بی ستوون، ئەیوان عالی
کەدخودای دەرماڵ، مەسئوول نازر
پەی پەزێرایی، فەوری بی حازر
مێهمانانش دی، گەپ و شایستە
سڵام سەردارش، کەرد وە ئاهیستە
دەستێ چەنیش دا، «ئا میرزا عەباس»
حاڵیش کەرد و وات: وە یەك لەحنێ خاس
بواچە مێمان، «والی»، «والی» یەن
والی «کوردسان»، نامی عالی‌یەن
کەدخودا وە لای، «والی» تەشریف بەرد
تەشریف فەرمایی، «والیش» حاڵی کەرد
ماشین ئاوەردن، «والی» بی سوار
هەر بەو شەو تەشریف، بەرد وە لای «سەردار»
«سەردار» بە «والی»، خاس وێش شناسان
دەست وە گەردەن بین، ڕووی یەکتر بۆسان
چەند جار والی کەرد، سڵامش تکرار
وە ئیکرامەوە، فەرماش بە «سەردار»
ئیڵ و قەبیلەم، بێ‌نیاز کەردی
ئەی «والی» چون من، سەرئەفراز کەردی
خاك «لوڕستان» وە گوڵشەن کەردی
دیدە و دڵ بەدین، وێت ڕەوشەن کەردی
قەدەمت وە بان، دیدەم ئاوەردی
یا خوا بە خەیر بای، موشەڕەف کەردی

هــەر دوو هــەر والی، هــام قــەرین و شــان
یــەکــێ والی «لوڕ»، یــەکــێ «کــوردسان»
شــین بــە دیــواخــان، مــەخسووس والی
فــەرش بــی وە مــەفرەش، ســجادە و قــالی
مــــێز و ســــەندەڵی، مــوبڵ و مــوخەتا
والی بە «سەردار»، دەربەست کەرد عەتا
خــەدەمە، خــادم، دەســتگای ئــابداری
دان و دایــــەرەی، دەسگــای ســەرداری
چــەندێ بــە شــادی، سەردار و «والی»
ویــــاران وە هـــــەم، وە تـــــەبع عــالی
وە حــــوسن نــیەت، والی بــا ســەردار
ئــــارەزۆ کـــــەردن، بشـــۆن وە شکــار
کــەفت وە تــەدارەك، خــاستر لە جــاران
والی دەســــتوور دا، بــە مــیر شکــاران
مــــــــیرشکار دەرلاد، وە ئـــــەمر والی
قـوشچی بـاشیان، یـەك یـەك کـەرد حـالی
قــــوشچیان قــــوشان، وە بــــێبەهانە
ئــــاوەردن وە بــەر، گشت لە قــوشخانە
«قــرقی»، «قــەرەقوش»، «بــاڵەوان» و «بــاز»
«هەڵۆی» وە هەڵمەت، «چەرخ» چابك گــاز
شــاهێن شـمقاڕ، چـەنگ تـیژ و بـاڵشۆڕ
ئــــامادە کــــەردن، پــەی شکــار پــۆڕ
«تــرمتە»ی تــەیار، «واشــە»ی دوم درێـژ
چــابك و چــالاك، قـولاوەی چـەنگ تـیژ

دمای سەید و سەیر، سەفای کۆگنەردی
«والی» بە سەردار، فەرما بە مەردی
ئەگەر مەیلت بۆ من خەیاڵم هەن
هەرچی لە «ئێراق»، موڵك و ماڵم هەن
بە ڕەسم پێشکەش، بە تۆمەسپارووم
فەقەت تەوانای، دەعوا نەداروم
سەردار قەبوڵ کەرد، خواهی نەخواهی
والی سەردارش، بە مەیل کەرد ڕاهی
ڕاهی بین وە جەخت، هەی ئەتڵان کەردن
ئاوی تاڵ و سوڵ، هەڵەتان وەردن
چەنی بەڵەدێ، یەڵغاردان وە دەو
نە وە ڕۆ ئارام، نە شەو کەردن خەو
هەی کەردن لە ئەسپ، کێشاشان شەلاق
دمای چەند ڕۆژێ، یاوان وە «ئێراق»
نۆکەران دڵ خوەش، «سەردار» بە دڵشاد
بە شادی کەردەن، یاوان وە «بەغداد»
پەی سەفای سوورەت، حومامێ کەردن
غوبار خەستەگی، ڕا لە ڕوو بەردن
«سەردار» تەشریفش، وە لای نەقیب بەرد
شەرح حاڵ وێش، عەرز نەقیب کەرد
«نەقیب» وە گەرمی، وا دا دڵداریش
سەردار حاسڵ کەرد، ئومێدەواریش
«نەقیب» دەستوور دا، پەی مێهمانداری
شایستە و لایەق، شان سەرداری

لە دەوڵـەت سـەراش، پـەی پـەزێرایی
جـا تـەهیە کـەردن، خـاس بـە دڵـخوایی

لە دوای چـەند ڕۆژێ، پـەزێرایی کـەرد
سەردار وە «نەجەف»[1]، ڕاهـنمایی کـەرد

ئەو وەخت «ڕەزاخان»، حەزرەت ئەشرەف بی
زەوار حـەزرەت، شـاه نـەجەف بـی

فەرماش «ڕەزاخان»، حـەزرەت ئـەشرەف!
تـەشریف ئـاوەردەن، وە بـارگەی نـەجەف

«سـەردار» شـنەفتش، وەش ئـاماش بـە دڵ
ڕەنگـین بێ ڕەنگش، ڕەنگـینتر لە گـوڵ

«والی» فـرسەتش، غـەنیمەت زانـا
عـەزم «نـەجەف» کـەرد، دلێـر دانـا

وە ئـیرادەی حـەق، گـیان نـیا لە کـەف
شـی وە بـارگای، «نـەجەف ئـەشرەف»

مـتەوەلی پـاک، زات مـوبارەك
گەردش پـەی سـەردار، تـەهیە و تـەدارەك

پەی چێش تەی کەردی، ئی ڕاگەی دوورە
پـەی چـی ئـامانی، چـێشت مـەنزوورە

«والی» شـەرح حـاڵ، پـەی مـتەوەلی
عەرز کەرد و واتش: تـۆ بـی و یـا «عـەلی»

---

١- عولەمای «نەجەف» و «کەربەلا» بە ڕاسپیری «سەید حەسەنی مودەریس» لە لای دەوڵـەتی «ئێران» شەفاعەتیان بۆ «سەردار ڕەشید» کرد وە بە ڕێزو حورمەت و بۆ «تاران» بە ڕێ کرا، و پاش ماوەیە بە ئەمری «ڕەزاخان» لە قەسری قەجەر زیندانی کرا.

هەر تەور سەڵاتەن، دانای مەعنەوی
بوەرەم وە لای، «ڕەزای پەهلەوی»
قەوڵ شەرافەت، چەنیش بستانە
چەنیم نەگیرۆ، بڕو بەهانە
بە هەر تەورێ بۆ تەئمین بدۆپێم
ئەمرێ سادر کات، بشۆم و جای وێم
متەوەلی ئەمر، سەردار قەبووڵ کەرد
شفاعەت نامەی، نەوەی ڕەسووڵ بەرد
داش بە «ڕەزاخان»، خواهی نەخواهی
قەوڵ عەفووش دا، بە ڕەسم شاهی
ئیفتیخار حوزوور، بەخشا بە «والی»
متەوەلی خاس، سەردار کەرد حالی
«سەردار» وە حوزوور، «ڕەزاخان» بەردش
بە گەرمی ئیکرام، لە «سەردار» گردش
وات: تەئمین گیانی، مەدەرووم وە حەق
بە حەق خودای، بەرحەق موتڵەق
بەو شەرت حازر بی، بە ڕەزای «ڕەزا»
دی دەست کۆتا کەیت، لە کوشت و قەزا
ئەوەها تەئمین، مەدەرووم وەپێت
بشۆ دڵ وەش بەر، لە سەر جاگەی وێت
وەلێ مەبۆ وێت، زوو بەی پەی «تاران»
دوور گیرە چەنی، گرۆی بەدکاران
«سەردار» قەوڵش دا، هیمەت خواهی کەرد
«ڕەزاخان» چەنیش، لوتف شاهی کەرد

«سەردار» وە دڵ خوەش، شی وە لای «نەقیب»
یەك یەك شەرح حاڵ، وێش وات وە تەرتیب
نەقیب شوکر زات، بارئیلاهی کەرد
بە نەحو ئەحسەن، سەردار ڕاهی کەرد
فەرما هەمراهان، سەردار بین حازر
یەك یەك خەڵعەت کەرد، بە دیبای فاخر
«سەردار» چون شاد بی، وە ئیقباڵ بەخت
ئەمر کەرد یاران، سوار بین وە جەخت
یەکسەر سوار بین بە دەواندەو
نە وە ڕۆ ئارام نە شەو کەردە خەو
ڕاگەی چۆڵ و هۆڵ، بەڕ بیاوان
تەی کەردن هەتا، یاوان وە «ئێران»
شەکەت و هیلاك، خەستە و هەراسان
دمای سێ حەفتە، شین وە «دووریسان»
«موحەمەدبێگ» فەوری، دانا و دڵنەواز
دووریسان یەکسان، ئاوەرد وە پێشواز
«حەمیدە خانم»، چەنی فەرزەندان
شاد بین بە سەردار، بە شادی و خەندان
چون پەروانە و شەم، دەور دان لە دەورش
بۆسان دەس و پای، توهمەتەن تەورش
دمای چەن ڕۆژێ، ئیسراحەت کەردن
فەرما موحەممەدبێگ، ئەدیب ئاوەردن
وات: بە «موحەممەدبێگ» فەهیم فازڵ
«مانی» تەرز تەور، ئەدیب عاقڵ

ئەگەر نەمردم، حەق مەدووت وە دەس
چەئێد زیادتر، زەحمەت وەسەن وەس
«موحەممەدبێگ» فەرما هەر چێت مەنزوورەن
ئەمر کەر «سەردار»، ئەمرت زەروورەن
فەرما «انشاالله»، ئێدن خەیاڵم
بار کەرووم بەرووم، ماڵ و مناڵم
«موحەممەدبێگ» فەوری، مەردم کەرد حالی
جەم کەرد لە قاپی، «والی» ئەهالی
«سەردار» دەستوور دا، خادمە و نەوکەر
چەنی ئەهالی، «دووریسان» یەکسەر
خواحافیزی کەرد، بار کەرد یەك بارە
بارئەنداز نەکەرد، تا وە «شوانکارە»
بە فەوری تایفەی، «ئەحمەد کەیانی»[1]
کەردن پەی «سەردار»، تەهیەی مێهمانی
وات: بە دێهباشی موحەممەد[2]، «سەردار»
دیت چ زوڵمێ کەرد، چەرخ چەپ رەفتار
بە سەد سزا و زام، سەختی و دەر وە دەر
باز بە وێرانە، شین وە «ڕوانسەر»
«داواشی» جەواب، وە عەززو تەمکین
عەرز کەرد بە سەردار، سلێمان نگین:
«والی» والا شان، حاتەمتایی تەور
توانای تاریخ، شاهان ڕووی دەور

---

١- ناوی تایفەی بە ناو بانگ لە لادێ «شوانکارە» سەربەشاری جوانڕۆ.
٢- مەبەست باوکی میرزا ئەحمەد داواشی‌یە.

یــەکــایەك شــاهان، نــامی مــەعنەوی
«کورش» و «داریوش»، تـا وە «پـەهلەوی»
چەرخ چەنی هیچ‌کام، تـا سـەر نـەوەردەن
یـەکسـەر گـرفتار، چـەرخ چـەپگەردەن
کــەس لە زنــدەگــی، وێش ڕازی نــیەن
چەرخ بە ڕاست پەی کەس، لە بـازی نـیەن
وەعــدەش بـەعیدەن، وەفـاش نـەیرەنگەن
سەڵاحش کینەن، سـوڵحش پـەی جـەنگن
کەس لە جەور زوڵم، چەپ گەرد نەڕەستەن
شەش دەر لە شـاهان، دنـیا گشت بـەستەن
بـازهەم شـوکرش بـۆ، چـەرخ وە کـاممان
نــیمە چــەرخــێ وەرد، وە مــەرامــمان
فــەرما بــە خــانم، «سـەردار» یـەکسـەرە
مــــاڵ دێــــهباشی، بــــا وێت بــــوەرە
من ئیمشەو حەتمی، مـەگـێڵووم وە پـەس
فــەقەت ئــی قسـە، وێت بـزانـی و بـەس
ئــارەزووم دیــدەن، «حســامالدّینە[1]»ن
جــای سـدق و سـەفا و عـیلم و یـەقینەن
تــــەئمین گــــیانی، بــــدەرۆ وە پــــێم
مـەشووم وە «تـاران»، وە سـەر قـەوڵ وێـم
ئــەگــەر بــە «تـاران»، سـەفەر بکـەرووم
«ئـەحمەد داواشـی»، چـەنی وێـم بـەرووم

---

١- شێخ حسامالدین.

بــە ئــەسڵ و نــەسەب بــەرزە و دیـاری
ڕاحـــــــەتیم مــــــەدۆ لە گـــرفتاری
ئــێڵ و عــەشایەر، «ڕوانســەر» یـەکسـەر
بــە ئـەمر دەوڵـەت، بـا چـەندین ئـەفسەر
بـــەگ و بـــەگـزادە، پـیادە و سـوار
ئـــیستیقباڵ کــەردن، گـردین لە «ســەردار»
«سەردار» قاپی لوتف، لە ڕووشان باز کەرد
هەر یەك وە مەرام، وێش سـەرئەفراز کـەرد
ئــەمر کــۆچش دا، «ســەردارە رەشــید»
خـــانمان وێش، ڕەد کسـەرد وە ئــومید
خــانم و خــاتوون، خــەدەمە و نــەوکەر
بـار کــەردن بـەردن، ڕوو بـە «ڕوانســەر»
«سەردار» فەرماش وە، «غوڵام عەلی خان»
نـــــەمام نـــــەوبەر بـاغچەی ئــەردەڵان
لە ســـەردی و گـــەرمی، مـەبەر هـەراسـان
مـەوەرووت چـەنی، وێـم وە «کـوردسان»
ئــــەڵبەت، «ئـــیفتیخار»، فــەهیم فــازڵ
بـە هـەمراە بـەرووم، پەی حـەل مـوشکڵ
«ئــەحمەد داواشــی»، «شــیانی» وە هــەم
«کەرەم خان» چەنی، کـەدخودا «ڕوستەم»
پـــــەنج ســــوارە بــین، ئـــەوان ئــامادە
«شــیانی» و «ئــەحمەد»، وە پــای پــیادە
ئــەو شـەو وە بێ شـام، بێ‌خشە و کشـە
خــاو حــەرام تـا ڕۆ، یـاوایـم وە «دشـە»

«دشــــە» چــۆڵ و هــۆڵ، بــێ ئــابەدانــی
ســـــوار بــین و شــین، بــێ بــەرقلیانی
ڕاکـــــەردیم ئــەوڕۆ، بــێ ئاو و بــێ نان
وە زەحمەت بـەر شـین، لە «هـاڵ هـەمان»
لە «شێخان»تەواف، «سوڵتان ساق» کەردیم
خـــاك بــارگاش، وە مــوشتاق وەردیــم
لە باغچەی «سـوڵتان»، تـفێ تـەڕ وەردیم
ڕەفــع ئــارەزووی، ئــەورامــان کــەردیم
لە «کــوڕەمیان» وە جـەخت شـین وە بـان
لە «شوشمێ» وەرشین، هەتا «سۆسەکـان»
ئــاوایــی خــاڵی، گشت لە هــەوار بــین
چەند نـەفەر لە بـاغ، مـەشغووڵ کـار بـین
فــەوری ئــاوەردن، نــان نـوخشەی جـۆ
وە چ لەزەتـــێ، واردیـــم چـــەنی دۆ
یـــاوایـــم وە بـــەڵخە، ســالار لهـۆن
ویەردیم لە «گوڵپ»، شین وە «بـاغە کـۆن»
شـــیخ المشـــایخ قـــطب الطـرایــق
«مــوحەممەد بـەها»، شـایستەی لایـق
جـــەماڵش مـــەدا، تـانە لە خـوەرشید
ئــاما وە پـێشواز، «ســەردارە ڕەشــید»
«ســەردارە ڕەشــید»، پـیادە بی لە زین
دەست وست وەگەردن، شێخ ساحیب دین
هـەر دوو لە شـادی، شکـۆفان چـون گـوڵ
بـــەر ئاوەردن خـار، غـەمان گشت لە دڵ

هەر دوو چون بوڵبوڵ، مەست وە لەقای گوڵ
یـــاوان وە خـــزمەت، مـــورشید کـــامڵ
«عەلی»[1]، «عەلی» تەور، بـەحر عـەنایەت
حـــاتەم تـــەرز تـــەور، کـەرەم بێ‌غایەت
دوڕێ بـــی لە نـــوور، حـــەق سرشتە بـی
مـەدام نـوور حـەق، لە ڕووش وەشـتە بـی
پـــیر بـــێ‌نەزیر، ڕەوشـــەن زەمـــیر بـــی
پـــەی وامـانـدەگـان، مـەدام دەس‌گـیر بـی
جـــادار بـــەرحـــەق، «بـــەهاءالدیـــن» بـی
وازع چـــرای دیـــن، «حـــسـامالدیـن» بـی
ئـــاسایش بـــەخش، شـــفای زامـــەت بـی
ڕەهـــنمای ڕاســـی، ڕای قـــەیامەت بـــی
فـــەرماش مـــەنزڵێ، ڕەوزەی ڕزوان ڕەنگ
پـــرشکۆو شـــەوکەت، شـاهانە و قـەشەنگ
ڕازانـــــان بـــــە ڕەمـــز، مـــێمان‌سەرایـــی
شـــیرین‌تر لە کـــاخ، فـــەڕەبەخش شـــایی
پێش خزمەت «سەردار»، بـەرد وە کـاخەوە
ســـــەردار کـــاخش دی، وە دەمـــاخەوە
پشت دا وە پشـــتی، مـــوخەتای «چـــینی»
ئـــاراســـتە بـــە مـــۆر، «حـــسـامالدیـــنی»
لە «باغە کۆندا»، سێ ڕۆژ، ڕاحـــەت خـەفت
لە دوای سێ ڕۆژە، سەردار ناخوەش کەفت

---

١- ناوی شێخ حسامالدین پیری سۆفیان

کیاستن دوکتور، لە «هەڵەبجە» هات
سەردار لە گرەی گریپ دا نەجات
«سەردار» سڵامەت، سەرش گرد وە ڕاس
بێ ئەندازە کەرد، لە دوکتور سپاس
وات وە «ئیفتیخار»،[1] «والی» بێ دریغ
تەشریف بەر عەرز کەر، وە حەزرەت شێخ
ڕای هات و نەهات، گرتەنم وەپێش
مات و ماتڵم، خار خاتر ڕێش
کلید قاپی، موشکلات پێشەن
هام لە خۆف گیان، تەکلیفم چێشەن
«ئیفتیخار» شنەفت، شکۆفا چون گوڵ
تەشریف بەرد وە لای، مورشید کامڵ
یەك یەك فەرمایش، سەردار والی
عەرز شێخ کەردش عارف عالی
چون فرشتە لەب، باز کەرد وە تەوحید
بدەر مزگانی وە «سەردار ڕەشید»
خەفەت نەوەرۆ خەم نەدۆ وە دڵ
موڕادش لە لای حەق مەبۆ حاسڵ
تەئمین گیانی، مەدەرۆ وە پێش
بشۆ وە «تاران»، نەبۆ خاتر ڕێش
مەواچوون «عوسمان»[2]، وە سەهل و ئاسان
ڕەوانەش کەرۆ، تا وە «کوردسان»

---

١- لەقەبی شیخ موستەفای حسامی (ئیفتخار مەشایخ) کە ١٠ ساڵ لەزیندان ڕەزاخان داحەبس بووە.
٢- مەبەست شێخ «عوسمانی نەقشبەندی» کوڕی شێخ حسام‌الدین.

«ئیفتیخار» مەتڵەب، یەك یەك بی حالی
فەرموودەی شێخش، عەرز کەرد بە «والی»
سەردار شنەفتش، وەش ئاماش وە دڵ
خاوێ ڕاحەت کەرد، ئەو شەو لە مەنزڵ
شێخ فەرما بە شێخ، «عوسمان» خوەش‌خۆ
نوور بینایی، دوو دیدەی بابۆ
بە ڕەسم ڕسووم، تەریقەی خاسان
بە حوسن نییەت، خاسەی خەواسان
بار کەرە بەرە، ئابداری و بنە
بە هەمڕای «سەردار، ڕەشید» تا «سنە»
سەر ئیتاعەت، ئاوەرد و خەمان
شی وە لای «سەردار»، فەوری «شێخ عوسمان»
بنە و ئابداری، بار کەردیم بەردیم
بە ڕاحەت لە «زەڵم»، شام شەو وەردیم
سۆفیان وە نار، وەجد و سۆزەوە
بەو کزەوسۆزەی، جگەردۆزەوە
گشت لە شەوق شێخ، چون پەروانە و شەم
بێ‌خەیاڵ خەتمێ، کەردن وە بێ‌غەم
باب تەعارف، پەی شێخ و سەردار
ئاوەردن وەردیم، نۆبەرەی خەیار
«شیانی»[1] لە سەردار، دەرلاد بە زەروور
مەرەخەسی واست، بە عوزر مەعزوور

---

١- خەڵکی شاری «پاوە» بووە.

مــەرخــەسش کــەرد، فــەوری «شـیانی»
گــێڵاوە وە پــەس، هــەر ئــەو بــەیانی
نــام حــەق بــەردیم، بــنەڕ کــەردیم بـار
تــەنگ و زیــەرتەنگ، کـێشان بـین سـوار
لە پــــلە و مـــلەی، «مــەلا[1]مـوستەفا»
ســەرکـەفتین و شـین، وە جـەور و جـەفا
مـــن وە پـــیادە، ئـــەوان وە ســـوار
هــەر تــاشین وە بــان، کـەل «کـەماجار»
نـــەفەسێ کـــێشام، دیــایم وە زەروور
«کەرکووك» و «موسڵ» و سارای «شارەزوور»
دیار بـی «بـەغدا» و «بـەسرە» وە دووربـین
«هــەولێر» و «کــەلار»، تـا وە «خـانەقین»
لە دمـــای ســـەیر و ســـەفای ئـــەو دەرە
ســوار بــین لوایـن، لەو جــا یـەکـسـەرە
شـــین وە دامــەنەی، شــیرین کــۆساری
هـــانی و هـــانی‌یاو گــوڵ و گــوڵزاری
وەنــەوشە و ســۆسەن، چـنوور و شەوبۆ
هـــەڵاڵە و نـــەرگس، یـــاسەمەن کـۆکـۆ
لە دەور چـــەشمە، هــەر یــەك وە ڕەنگێ
مـەدرۆشان بـە ڕەنگ، شـێوەی قـەشەنگێ
«ئاوسفید» چون دوڕ، زەڵاڵ خوەش ڕەنگ
مــەتافا بــە تــاف، لە ســووراخ ســەنگ

---

١- مەلا موستەفای بەرزان ڕابەری شۆڕشی گەلی کورد.

«عـەوڵاخان» «دزڵـی»، لەو دامـەنەی شـاخ
بــە تــەپردەماغی، کــەردە بــی چــەرداخ
چــەنی چــەنئەفەر، تــفەنگچی تــەپردەس
تــەشریفش ئــاوەرد، وێـنەی پـیل مـەس
هــات وە ئــیستقباڵ، بــە تــەور ئـیهزاز
عەرز کەرد بە «سەردار»، سەرو سـەرئەفراز
مەعلووم «شێخ عوسمان»،[1] شێخیش یەقینەن
نـــوور دوو دیــدەی، «حســامالدیــنە»ن
بە هەمرای «سەردار»، تـەشریف ئـاوەردەن
قــەدەمش بــە خــەیر، مـوشەپەف کـەردەن
مەخسووسەن «سەردار»، بە سەرداری وێش
ئـــــومێدەوارم نـــــەبۆ، خـــاتر پێش
مـــــەبۆ نــــەهارێ، مـــەیل کـــەرن وەرن
بـــەعد بـــە سڵامەت، تـەشریف مـەوەرن
مەمنوون لە گەرمی، خەدمو خـوڵك و خـۆت
نـــــەهار مـــــەوەریم، وە یــانەی بــابۆت
وات «عبداللهخــان»: جـەناب «شـێخ عـوسمان»
بەدرەقەمان کەر، تـا مـاڵ «مـەحموودخان»
چــــاك مــــەردانــەی، وێش دا لە کــەمەر
وە فەرموودەی شێخ، فەوری کەفت وە بـەر
ڕاهـــــی بـــــین بــە ڕاە، پــیادە و ســوار
یــاوان وە دزڵـی، شـێخ چـەنی «سـەردار»

---

١-کوڕی شێخ حسامالدین بووە.

«عبداللە» تەشریف، وە لای بابۆش بەرد
ئامای مێهمانان، عالی عەرزش کەرد
ساز و دهۆڵێ، مەحز ئیفتخار
ژەندن بە خەیرەمەقدەم پەی «سەردار»
«مەحموودخان» فەرماش، ئاوەردن نەهار
مەیل کەردن وەردن شێخ چەنی «سەردار»
بەعد سەرف نان، نەهار و چایی
خواحافزی کەردن، فەوری بین ڕایی
«عەولابێگ» بە مەیل، وەش ئامایی کەرد
«سەردار» لە دەربەند، «دزلی» ڕایی کەرد
هێمان گوم نەوی، خوەر لە پەناگا
یاوایم وە قەڵای، سان «قەڵاگا»
شین وە دیواخان، چ شڕ و وڕێ
لەپێ گلێم و پلاسە شڕێ
«سان» دەستوورش دا، ئاوەردن شامێ
چ شامێ چون وێش، نە پوخت و خامێ
هەر کە مەکەرد، سەیر، وە تەرز و تفاق
تا لوقمە مەوارد، مەکەرد ئیستفراق
نەخەفتیم ئەو شەو لەبەرکەیك و موور
ویارایم هەر حاڵ، زندانی دەستوور
سەحەر خوەر کێشا، گۆشەی چون ئاهر
فەرش گەرمی وست، لە بەڕو باهر
بنەبار کەردیم، هەر بەو بەیانی
بێچایی بێنان، بێ بەرقلیانی

ئــەوان ســوار بــین، خــوار و خــۆف لە دڵ
وە من نـیشان دان، مـلەی «ســوور کــەوڵ»
لە پـــــایین مـــــلە، دەرە و دوڵـــێوەن
بـــەڕو بـــیاوان، چـــۆڵو هـــۆڵی وەن
مـــەویەری مـــەشی، بـــاغ و ئـــاوێ هـــەن
دوور لە ئـــابادی، یـــەك ئـــاسیاوێ هـــەن
هەر کام زوو یاوایم، ئەر شـەو بـۆ ئـەر ڕۆ
مـــــەبۆ بگـــــێریم، لەو یـــاگـــە مـــەکـــۆ
وە لێــمان یــاوا، ئــەر شــەو بـۆ ئـەر ڕۆ
مـــــەبۆ بـــــنیشین، تـــا یـــۆتەرمان بـــۆ
شەلاقشان کـێشا، هـەی کـەردن لە ئـەسپ
مــن وە پـیادە، چـون «ئـازەر گـوشەسپ»
وە پـــــای بـــێپێلا، ڕاهـــی بــیم وە دەو
کـــۆ وە کـــۆ مـــەشیام، چـــالاکتر لە کــەو
تەی کەردم کـوان، سـەخت دوور مـەنزڵ
تــا یـاوام وە بـان، مـلەی «سـوور کـەوڵ»
ســـەرم ســـوڕ مـــەندەی، زات بـاری بـیم
چ ئـاوێ لەسـەر، مـــلەی جـــاری دیـــم
مــــەکـــنیا لە ڕێـــز، مـەڕێزا چـــون دوڕ
یـــەخ مـەکـەرد لە دەس، لە نـیمەڕۆی بـڕ
لەتـــیف وێـــنەی کـــەف، بـــەرف ســـەرکاوان
مـــــەواتـــی شـــەماڵ وە نـــەسیم تـــاوان
ســـــەیر و ســـــەفای ئـــەو، ئـــاو و بـــەنەنە
مـــــەواتـــی ڕێـــزەی، کـــۆی ســـاراوەنــە

چــــەندکەفێ وەردم، لەو ئـــاوە ســەردە

دەم و ددانـــــم، هــــێمان پـــڕ دەردە

هەڵ نـیشتم هــەر وەك، هـەرەس لە ســەردا

دی دەســـم لە دەس، زنـــدەگـــی بــەردا

تــــەنیا و نـــابەڵەد، بـــێ ئاو و بـــێ نان

پـــاپەتی کــــەفتمە، بـــەڕ و بـــیاوان

ســاعەت ســێ لە شــەو یـاوام وە بـاغێ

هــیچ نـەدیم بە غـەیر، شـۆڵەی چـراغـێ

هــەوا مــونقەلب،[١] تــاریك و تــار بـی

چـــەم چـــەم نــەوێن و ڕاە نــادیار بـی

وەخت بـی مشـەوەش، بـۆ فکـر و هـۆشم

تــــەقەی نــاڵ ئـەسپ، ئــاما وە گـــۆشم

تـــا خـــوڕیم ســوار، کــێن و چ کــارەن

«کــەرەم خــان» واتش، شـێخ و ســەردارەن

«کەرەمخان» واتش: «ئــامیرزا[٢] ئـەحمەد»

یـــا خـــودا هــەرگیز، نــەناڵی وە بــەد

تـــــەنها و پـــاپەتی، وە پـــای پــیادە

چـــون شـــێر شکـــارت، کــەردەن بە وادە

«سەردار» وەش ئـاماش، لە بێباکـی مـن

ئـــــافەرینش کــــەرد، لە چـــالاکــی مـــن

هــــەوا تــــۆف تــــەڵخ، ســـەخت دڵ لەرزان

وە چ تــــــەرزێ شـــین، وە «گـــەڵاتەرزان»

١- مەبەست هەورەوه لاو تارێکە شەوو سەرمایە.

٢- ناوی هۆنەرە.

سەحەر سوار بین لە «تاڵەبەران»
نەهار لە «تیژتیژ» شام لە «ئارەنان»
«شێخ» شی وە مەسجد، پەریٚ جەماعەت
«سەردار» لە ماڵێ، کەردش ئیسراحەت
سەحەر خوەر لە کۆ، گۆشە دا نیشان
سەرزەمین وە پەڕ، فەڕ وێش پۆشان
«شێخ» لە خەو هەڵسا، فەرماش بە «سەردار»
مەبۆ مەنسووبان، کەریم خەبەردار
مەخفی دوو بە دوو نامەیە نسووسان
دان وە یەك نەفەر، بەرد پەی «کوردسان»
خانان «ئەردەڵان»، «وەکیلی» یەکسەر
با دەم و دسگا، کەردن باخەبەر
چون ئەوان دڵسۆز، دۆس «سەردار» بین
پەی پەزێرایی، «سەردار» سەوار بین
بەگ و بەگزادە، خان و خەوانی
«ئاسەف ئەعزەمی» و «موشیر دیوانی»
«میرزا عەلی خان»، با «میرزا جافر»
کەمەر بەستە بین، ئامادە و حازر
شێخ موجتەهد، ئیمام «مەردۆخ»[1]
فازڵ کامڵ، پسڕ کەماڵ شۆخ
موفتی موفتیان، قوزات قازی
پەی دیدەن «شێخ»، گشت شین وە ڕازی

---

١- مامۆستا «موحەممەد مەردۆخ».

خـــورد و کـــەڵان، و ئـــوناس و زکـــوور
لە شـــار بـــەرئامان، وە شـــادی و ســروور
دەروێش و سـۆفی، پـۆشان ڕووی زەمـین
بە یا «غەوس» یا «غەوس»، یا «حسام‌الدین»
ســـەیید و دەســـتەی، عــولەما وە ســـەف
دەروێش یا «عـەلی»، مـەدەد، دای لە دەف
بـــە زکـــــر و تـــەوحید، وە تـــەهلیلەوە
وە تــــــەپڵ و بـــــەیداخ، وە دەفـــــیلەوە
سەیحە مـەکـێشان، گشت لە شـەوق شـێخ
وا بــــی «ئـــاویەر» بـــەر بـــەیۆ لە بـێخ
«شێخ» چەنی «سەردار»، با جەمعێ خاسان
نـــام حـــەق بـەردن، ڕوو بـە «کـوردسان»
وە بـــــــەدرەقەوە، ئـــــامان دێ وە دێ
وە ئـــــیهزازەوە، هــــــەتا وە «ســـەرنوێ»
«سەرنوێ» یەکسـەر، تـا سـارای «کـەمێز»
غوڵ غوڵە و غەوغا چون ڕۆی ڕەسـتاخێز
ســـــەیید و شـــێخ و ئـودەبای شـــەریف
ئـەعیان و ئـەشراف، سـان دان وە ڕەدیـف
«شێخ» وە شەهامەت، «سەردار» وە تەمکین
وە ئـــــیکرامـــەوە، پـیادە بـین لە زیــن
«شێخ» چـەنی مـوفتی، خـوەلاسەی کـەلام
تەشریف بەرد وە جەمع، عولەمای ئـەعلام
«سەردار ئنتسار»، پـەی «سـەردار ڕەشـید»
فـــــەرما نــــەوازان، ســـــروود ئـــومید

«سەردار» وە مەرام، ئومێدەواری
کەردش لەو سەردار، سپاسگوزاری
بەعد با ئەعیان، نوجەبا و نەجیب
دەست مووبەت دان، یەك یەك وە تەرتیب
«والی» بە گەرمی، با ئەعیان شار
تەوازوع کەردش، بێ حەد و شومار
بە سەفا و سەلام، بە مەیل و گەرمی
دەست یەك گرتین، گۆشان وە نەرمی
وەکێڵی تەهیەی، نەهار گەردە بین
ئەسباب و ئاشپەز لە پێش بەردە بین
ئەو ڕۆژە داشان، عەجەب نەهارێ
بە تەکمیل نەهار، دوو سێ هەزارێ
بە «والی» واتش، «سەردار ئینتسار»:
بفەرما تەشریف، بوەریم وە شار
گشت وە یەك سەدا، نام حەق بردن
ئەعیان و ئەشراف، حەرەکەت کردن
وارد بین وە شار، دەس دەس و سەف سەف
سەردار تەشریف بەرد وە ماڵ «ئاسەف»
وات: «میرزا ئەحمەد»، جایە بدەن پێش
خەستەن دەخیلەن، بەد نەگزەرۆ لێش
پەی پەزێرایی، بە تەور تەکمیل
سپردن بە دەست، «نایب ئیسماعیل»
خوەش گوزەشت لە ئەو ماڵە شەریفە
لە پەزێرایی، «خاتوون حەنیفە»

وە شەوان لە کەیف، بەیت و هۆرە بیم
وە ڕۆژا سوار، ئەسپە بۆرە بیم
یەك و دوو حەفتە، ئیسراحەت کەردم
یەك نان و ئاوێ، وە ڕاحەت وەردم
شەوێ نیشتە بیم، وە سەرئەفرازی
چەنی هامدەمان، مەکەردم بازی
«نایب ئیسماعیل» چەنی «معمارپوور»
تەشریف ئاوەردن هەر دوو وە زەروور
«نایب ئیسماعیل»، یاوا وە مەنزڵ
شکۆفا و غونچەی، لەب باز کەرد چون گوڵ:
سەردار دەستوورش، دان وە «معمارپوور»
بشۆ وە مەنزڵ، «نایب» بێ‌قسوور
«ئامیرزا ئەحمەد»، بێدار کەر لە خەو
وە دەوان وە لام، باوەرە ئیمشەو
منیچ هەر ئەو شەو، مەردانە دەستوور
شیم وەلای سەردار، چەنی «معمارپوور»
«والی» بەو ڕازان، شیرین‌تەر لە قەن
فەرماش فەرزەنم، فەرزتەر لە فەرزەن
بەرحەسب دەستوور، «ڕەزای پەهلەوی»
وارس تەخت و تاج خەسرەوی
وە ماشین «سەردار ئینتسار» وە جەخت
حەرەکەت کەریم، بشیم وە پای‌تەخت
خەیاڵم ئێدەن، بە تەندرووسی
بەرووت وە هەمڕای، وێم وە خسووسی

«إنشـاالله» مـن هـەم، بـە قـەدر کـافیت
ئـــەگـــەر نـەمردم، مـەدەم تـەڵافیت
تـۆو «کـەرەمخان»، «کـەریم» نـۆکـەرم
ڕازی، نـــاڕازی هـــەرسێ مـــەوەرم
«ئاکـەریم» بـەرووم، ئـەڵبەت پـەی کـاران
«کەرەم خان» وە ئەسپ، بـەیۆ وە «تـاران»
سـەحەر خـوەر لە کۆ، بـەر ئـاما وە بـەر
ڕۆشن کەرد وە نوور، سەحرا و دەشت و دەر
فـەوری بـە دەسـتوور، «سـەردار ئـینتسار»
ئـاوەردن مـاشین، وە جـەخت بـین سـوار
«سـەردار» لە مـەردم، خـواحـافزی کـەرد
بە سەر شاد وە تۆی ماشین تەشریف بەرد
وات: وە «ئیسمایل»، مـاشین ئـاگـر کـەرد
تـەن وە دەس تـەقدیر ئـیلاهی سـپەرد
مـاشین ئـاگـر بی، نـام حـەق بەردیم
ڕوو بـە «هـەمەدان»، حـەرەکـەت کـەردیم
شـەو لە «هـەمەدان» ئـیسراحـەت کـەردیم
سـەحەر سـوبحانە بـە ڕاحـەت وەردیـم
پـەوسە پـەی تـەقدیر، حـەیی لایـەنام
مـاشینمانِ لەنگ بی، لە مـینگەی ئـیمام
بیست و چوار ساعەت، ماشینمان لەنگ بی
لە لەنگـی مـاشین، خـولقمان تـەنگ بـی
ڕانـــندە تـــەواو مـــاشینش وازکـەرد
بێعەیب کەرد و بەست، پەروانش سازکەرد

فەوری ئاگـر کـەرد، خـاس تـر لە جـاران
حـەرەکـەت کـەردیم، یـاوایـم وە «تـاران»
ماشین لە کووچە و پـەس کـووچە بـی ڕەد
تا شـین وە دەرمـاڵ، «حـاجی مـوعتەمەد»
«حـــاجی اســـدالله، خـــان مـــوعتەمەد»
پـــەزێرایـــی کـــەرد، بێ حـەساب و حـەد
لە دوای یەك حەفتە، خاس وە خـاتر جـەم
شین بین وە مـێهمان، «سـەردار موعەزەم»
«ئاسەف» لە «سەردار»، خوەش ئامەد کەردش
وە ئـــیکرامـــەوە، وە مـــەنزڵ بـــەردش
فەرماش بە «سـەردار» جـەناب «ئـاسەف»
بشـین وە دیـدەن حـەزرەت ئـەشرەف
ئـــەسباب ســـەفەر، کـەردن جـەمئاوەر
وات: «عـبداللهبـێگ»، دورشکـە بـاوەر
دورشکەی شـەخسی، «ئـاسەف» ئـاوەردن
قـەدەم خـەیر وە تـۆی، دورشکـە بـەردن
من هـەم شـیم وەلای، دەس دورشکـەچی
دورشکەچی فـەوری، دەس دا وە قـەمچی
«سەردار» و «ئاسەف»، چون بـاش دلێـران
دەستوور دان هەی کەرد، ڕوو بە «شەمێران»
تەفریحەن تـەشریف، تـا «قـولهەك» بـەردن
پـەشیمانۆ بـین، عـەقەب گـەرد کـەردن
«سەردار» فکرش کەرد، پەی حەل موشکڵ
ســـەڵاحش زانـــا، بـــەیۆ وە مـــەنزڵ

وە ئـــەندێشەوە، وە بـــیم و ئـــومید
خەو نەکەرد ئەو شەو «سەرداره ڕەشید»

وات: «میرزا ئەحمەد»، جام جەمئاوەر کەر
دورشکەی مەخسووس، پەیدا کەر باوەر

فەرما دورشکەچی، نامش «نادر» بی
بە ئەمر «سەردار»، فەوری حازر بی

«نادر» دروشکەش بەرد، وە بەرە بەرە
سوار بین و شین، وە دوو نەفەرە

یاوایم وە «تەجریش» نەهارێ وەردیم
هەتا ساعەت سێ، ئیسراحەت کەردیم

سوار بین و شین، هەر دوو وە ئازاد
هەی کەردیم لە ئەسپ، تاوە «سەعدئاباد»[1]

بە شادی و سروور، بە کەیف و دەماخ
وە دەماغەوە، پیادە بین لە کاخ

خاستر لە حاتەم، بەور دەریادڵ
بێ پەروا فەرما، ڕەئیس قەرەوڵ

ڕەئیس قەرەوڵ، فەوری بە گوستاخ
موعەڕەفی کەرد، «سەردار» بەرد وە کاخ

سەردار شی وە کاخ، نموونەی بەهەشت
لە دوای گوفت و گۆی، زیاد هاتە دەشت

ڕەئیس قەرەوڵ، بانگ کەرد بە ڕووی باز
هەر یەك چەند لیرە، بەخشا بە سەرباز

---

١-کاخی سەعدئاباد.

بــــێ‌خۆف لە ئــازار، گــرۆی بــەدکاران
خوەر غرووب نەکەرد، یاوایـم وە «تـاران»
«سەردار» لە شـادی، واتش: ئـەی فـەرزەن
دیــارە هــەسارەی، شــانس‌مان بــەرزەن
حەزرەت ئەشرەف[1]، لە رووی عـەنایەت
لوتــفش بــی چــەنیم، ئـیمڕۆ بێ‌غایەت
وات: هەر دووشەممە، قـەوڵ شـەرەفی دەر
وێت وە مــەجلسەین، مــوعەڕەفی کــەر
لە نــاو ســەرداران، «ئــێران» نــادر بــەر
بــە ڕەزای ئــەمرم، هــەر ئـان حـازر بەر
«سەردار» تـا چـەند مـاە، لە شـار «تـاران»
بــە شــادی و نشــات، بــە وەش ویـاران
نســان نــەما، «تــاران»، کــوودەتا کــریا
«ئــەحمەد شـای قـاجار»، دەر کـریا بـریا
یــەك حــەفتە «تـاران»، وە ئـیغتشاش بـی
تــا ســر ســرِی، بــەدکاران فــاش بــی
دەســتەی نــاڕازی جــمیان جـەم وەردن
ڕوو بــە مـەجلسەین، هـوجووم ئـاوەردن
ژن وە یا «حوسەین»، مەرد وە یـا «عـەلی»
ئــیجتماع کــەردن، پــەی شــۆرای مـلی
نــامەی دەعــوەتی، ئـاما پـەی «سـەردار»
ســوبح ســاعەت نــۆ، بشــۆ وە دەربــار

---

١- مەبەست ڕەزاخانە.

فــــرقەی نـــاڕازی، ئـیـغفاڵش کــەردن
پــــەی شـــــەرەفیابی، بــەتاڵش کــەردن

سـوبح سـاعەت نۆ، «تـاران» وە تـەم بـی
خـــائن و خـــادم، داخـــڵ وە هــەم بـــی

بە چووب و چماغ، بە سیلە و بـە مـوشت
بە شـەق و شـەلاق، سـەنگ و پـارە خشت

پـــولیس وە نــەرمی، مــەردمیش وە ڕەق
مــەداشــان وە هــەم، وە شـەلاق و شـەق

نــاغافڵ سـەدای، بـــۆق مـاشین هـات
چ هـــات، چ مـاشین، شـێر غـوڕین هـات

«ڕەزای پەهلەوی»، پـەیدا بـی چـون شـێر
دەست دا وە شــەمشیر، زەنــندەی دلێــر

بە «گوم شەو دوور شەو»، وە پشتە شەمشیر
هــەی کـەرد لە مـەردم، شـێر شـێران گـیر

مـەردوم وە ئـاجور، سـەنگ و پـارەخشت
پـــــێچان گـریبان، «ڕەزاخـــان» وە مشت

بــــە نــــاسزاوە، لە ڕووی نـــادانـــی
شکـــایەت کــــەردن، لە بــەر بــێ‌نانی

«ڕەزاخــــان» وە نــــەرم، وە مــیهرەبانی
واتش: مـــــەترسن، لە بــــەر گــــرانـــی

ئــەگــەر نــەمردم، نـان ئـەرزان کـەرووم
مــــیلەت لە زلەت، نـەجات مــەدەرووم

خــەشن وێـنەی شـێر، دڕنـدەی بـێ بـاك
وە شــــەهامەت شـی، تـا مـەجلس وە تـاك

«بـــــبندید در ایـــــن تـــویله را
بـــرونـشان کـــنید ایـــن قـبیله را»[1]

مـەردوم «تـاران»، وە مـەردی خـەسان
«تـاران» تـەسلیم بـی، مـەجلسان بـەسان

حـــوکم حکـــوومەت، نـزامـی دریـا
«تـــاران» ســەرتاسەر، پـۆس‌بەنی کـریا

سێ شەو و سێ‌ڕوژ، «تاران» وە تـەنگ بـی
شەو و ڕۆش خامۆش، چون شەوە زەنگ بی

نـــە تـەقەی گـاڕی، نـە ئـوتوومویبل
نە شەهنەی ئـەسپان، دورشکـەی شـەکـیل

نـە سـەدای سـروود، ئـاوازە و مـووزیك
نـەئەهات لە گـۆش، لە دوور یـا نـزیك

نە چـرپەی پـووتین، نـە کـیفەی چـارشەو
نـــە ئـــاغە کـنار، خـانم پـیادەڕەو

دەنگ ڕەقـــیبان، بـــڕیا لە گـــوزەر
وەك شـــار خـامۆشان، کـەس نـەهاتە دەر

مـجلسان بـەسان، شـۆرشان بـەتاڵ بـی
وەکیلان وەیـلان، حـاڵشان بـەد حـاڵ بـی

خـادمان بێ‌غەم، خـەسمان خـەستە بـین
بـازاڕیـان کـەساس، دوکـان بـەستە بـین

حـوکم سـادر بـی، وا دەسـتوور دریـا
خـائینان لە خـاو غـەفڵەت گـیر کـریا

---

١- وتەی ڕەزا شا بووە.

هـەوچی بێهەو بـی، تـاك و تـووك کـریا
مـــوخالیف نـــەما، پـاك و پـووك کـریا
لە دوای ســێ ڕۆژە، دریـــا ئـــازادی
کـــووچە و خـــەیاوان، بـــی وە ئـابادی
وە پـارچـەی سێ ڕەنگ، باڵ بـەیداخـان
ڕازیـــاوە «تـاران»، بـــی وە چـــراخـــان
ڕەقـاسان بـــە ڕەقس، خــوەش ئاوازەوە
مـــەڕەقـان بـــە دەم سـۆز و ســازەوە
وە هەر جا مەدیای، سـەراسـەر سـەیر بـی
گــۆشە وە گــۆشە، پـەرچـەم و دەیـر بـی
تاق نـەسرەت بـەسیا، بـە دیـبای ڕەنگین
«تـاران» بـی وە خـولد، فـردەوس بـەرین
نـــان وە بـار بـریا، مـەنزڵ وە مـەنزڵ
مـوهر «پـەهلەوی»، کـریا بـی چـون گـوڵ
مـیللەت وە نـیعمەت، خـاس بێنیاز بـی
دەر مەجلس بەڕووی، مـەجلسیان واز بـی
ئـــارای عـــوومی، وا تـەشکیل کـریا
ڕەی شـــاهی وە نـاو «ڕەزاخـــان» دریـــا
یـەك «مـوحسین» نـامێ، کـوردسانی بـی
پـــولیس مـــەخفی، شـــەهرەبانی بـــی
هــات وە لای «ســەردار»، وە ئـیکرامـەوە
عەرز «سـەردار» کـەرد، بـە ڕووی فـامەوە
وات: جـــەمعێ جـەمن، لە شـــەهرەبانی
مـــونتەزرتن، خـــان و خـــەوانـــی

ڕەئیس نەزمیە، ها لە ئینتزار
تا مەلاقاتێ بکا لە سەردار

بەڵام مەتاوی، تەنها نەفەرێ
باوەری چەنیت پەرێ خەبەرێ

بە گەرمی و نەرمی، بە چەرب زوبانی
«سەردار» وادار کەرد، پەی شەهرەبانی

«والی»[1] وە بەندە، وەی تەور دا دەستوور
وات: «ئەحمەد» چەنیم، تۆ بۆ دوورو وە دوور

تا شین وە حەیات، نەزمیە غافڵ
فەوری دەستوور دا، ڕەئیس قەرەوڵ

ئیجازە نەدان، من بچم وە ناو
فەقەت سەردارم، هەر مەدیا وە چاو

تا بەردن وە دەر، ئوتاقێ بەستە
دیسم کە ئاوەردن، کلیل یەك دەستە

ئوتاق باز کریا، سەردار شین وە ناو[2]
من جواو کەردن، بە تەور ناحەساو

من تەنیا کەفتم، «ئاکەریم» گوم بوو
«کەرەمخان» وە ئەسپ، لە «تاران» دەر چوو

«سەردار» گیریا و ماوە تەنیا خوەم
ئەشێ شەرح حاڵ، بەدبەختیم بدەم

---

١- مەبەست «سەردار ڕەشید».

٢- «سەردار ڕەشید» ماوەی هەژدە ساڵ تا خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی لە زینداندا ڕایان گرت، دوای ئازاد بوونیش تاکاتی مەرگی (١٣٤٢) هەر لە ژێر چاو دیری یان دا بووە.

مـن مـامۆ لە مـاڵ، «سـەردار موغەزەم»
نان بی وە غوسسە و خوەراك بـی وە غـەم

هـەر کـەسێ نـانی، ئـەسەند ئـەموێنی
وە حـــەسرەتەوە، ئـە کـەفتمە شـوێنی

کـەس نـەوی خـزمەت، بکـا وە سـەردار
مـــەوازبـــی وێت بـۆ شـام و نـەهار

وە ئـــیلا ئـــەو وەخت، ڕۆزگـــارم بـی
تـــەمەنم لە بـیست، وەخت کـارم بـی

نـانیان نـەدا پـێم، ئـەمبرد بـۆ سـەردار
ڕۆژێ دوو دەفـــعە، لە شـــام و نـەهار

نـــانیچ نـــە ئـەوەن، وافـر و خـاس‌و
دوو بـرشت نان و جـامووڵکەی مـاس‌و

ئـــەیانوت فـرەس، بـەسیە نـانەکـەی
خوەیشت تێر ئەخۆی لە پاش‌خوانەکـەی

ڕووت و قووت کـەفتم، داڕزیـام وەك گـاڵ
لیـــباسم دڕیـــا، کـــراس تـا شـواڵ

وەك مـــوجەسەمە، بـێ‌حاڵ و هـەواڵ
وە سسەر بـێ‌زوان، ئـەگـەڕیام وەك لاڵ

ئـــەچوومە مـــەتبەخ، بـــزان و نـەزان
ئـــەگـــەڕیام بـۆنان، لێـوارەی قـازان

بـێ‌نان وە بـرسی، وە بێ پـارە و پـووڵ
سـەر بـی وە گـزگڵ، مـل بـی وە مـەفتوول

بـیم وە ئـیسکلت، وشکـۆبیم لە پـۆس
نـــەمیانئەناسی، چ دوژمـــن چ دۆس

دەس بی وە مەقاش، دەست وافوورکێش
ڕان تەق و ڕەق بوو وەك ئاسای دەروێش
نە هۆش و نە گۆش، نە فیکر و نە فام
لە سەرم پەسیا، دەر دونیا تەمام
چارەم ناچار بی، ئەما ڕای تەدبیر
استغفرالله، خودام شی لە ویر
لێو وشك و بێ خوێن، زوان وەك پڵاس
ڕەنگ لە ڕووم، بڕیا، وەك دیو دەواس
نە شۆخی و سوحبەت، نە قسە و نە باس
نە عیشق و نە شەوق، نە هۆش و حەواس
لووت هەڵپێکیاگ، چاو قووڵ و بێ نوور
تەشخیسم ئەما، نزیك یا لە دوور
دگان تەق و ڕەق، هەر چەقەی ئەهات
وە حەق و ناحەق، هەر تەقەی ئەهات
نە ڕووی سواڵم بی، نە عادەت دزی
پاڵ دام وە پاڵشت، کەساسی و کزی
ماە ئازەر بی‌و، سێسەد و چوار[1]
کەفتم و تۆڕ دام، بێ ڕای ڕۆزگار
بێ یار و یاوەر، بێ هەواڵ پرسی
شەش مانگ لە «تاران»، مامۆ وە برسی
مات و مەلوول و داخین و پەشێو
خوار و غەمین و بار غەم وە لێو

---

١- ١٣٠٤کۆچی هەتاوی.

یەك ڕۆ وە مەئیووس، ئەگەڕیام خجڵ
بڕیا بێ ئومێد، زندەگیم لە دڵ
ڕاگەم کەفت وە ناو، باغە ئەناریٚ
دیم شەخسیٚ تەنیا، ها لە پای داریٚ
سڵامی کردم، سەری هەڵوڕی
هەواڵ پرسی کەرد، وە زوان کەڵهوڕی
وت: خەڵك کوورەیت، مەشغووڵ چ کاریت؟
دەردت، مەرەزت، ئەڕا ئەوگاریت؟
وتم: لە مەرەز، ئەڕا ئەپرسی
من دەردیٚ نەیرم، بە غەیر لە برسی
وت بوویش بزانم، ئەڕا هاتیتە؟
کارت چە بیە، مەر نەهاتیتە؟
وتم: من هەمڕای، سەردار ڕەشید بیم
سەردار گیریا و من نائومید بیم
وا دڵداریسم دا، وە ئارەزۆی دڵ
وە دڵ دەسم گرد، بەردم وە مەنزڵ
وت: خوڵا مەرگم، بیەیت وە کەڵهوڕی
شرو پڕم گشت، لە بەرم دڕی
ئەو یەك دەس لیباس، تەواوی دا پێم
نەهار، چڵاوو کەواوی دا پێم
نامت ئەڕام بووش، با نەچیت لە هووش
مەبادا نامت، بکەم فەرامووش
وتم: پێم ئێژن، «ئەحمەد داواشی»
وت: منیچ «فەرج خان، مەنش باشی»

ئــجازە بگــر، هــەر ڕووژ لە «ســەردار»
تــەشریف بــار وە لام، چ شــام چ نــەهار
هــــەر ئـــان دڵت بـــوو کــلت کــەمەوە
بــــەند بــــەدبەختی، مــــلت کــــەمەوە
وتــــم: دڵــــم هــەس وە ســـەرئەفرازی
وە شــــەرتێ «ســــەردار»، نــەبۆ نــاڕازی
شــوونت مــەزانــم، خــوەم مــامە شــوونت
عەرز «ســەردار» کــەم، وە عــەزم چــوونت
یـــە مـــاوا و مــــەنزڵ، یــە ئــوتاقمە
تــــەعارف نــــیەکــەم، یــە ئــەخلاقمە
وت: من و «ئــەمیر، مــەخسووس» کــەڵهوڕ
«ســــەردار مــوقتەدر»، شــیر شــیران دڕ
بــــەبر بــــەبر دڕ، «ســــالار زەفــــەر»
تــەحت نــەزەریم، هــەر چــسوار نــەفەر
مــانعی نــەیری، ئــەر ڕووژ بــوو ئــەر شــەو
هەر ئــان تــواســتی، تــەشریف بــارە و بــەو
دە تـــــوومان پـــوول، ســفیدی دا پــێم
چــمان یــەك عــاڵەم، ئــومیدی دا پــێم
هــاتم بــۆ مــەنزڵ، بــە شــادی و ســروور
گـــوڵ لە دەمـــاغم، ئــەواریــا لە دوور
نــەوکەران ئــاسەف، لە دەورم جــەم بــوون
مــنیان دی، مــات و مــەبهوت غــەم بــوون
وتــیان: کــێ دای پــێت، ئــی گشت لیــباسە
وا پـــاك و تـــازەو تـــەمیز و خـــاسە

وتم: جەوانێ دانا و جەوانمەرد
نووسیم بۆی جواو کاغەزێ وە فەرد
دای پێم لە سڵەی، فەردم بێ‌قەیاس
بە ڕەسم پێشکەش، چ پووڵ چ لیباس
وتیان: شاعێری، بانەزم و فەردی
وتم: ئەڵبەتە، وە زوان «کوردی»
داوایان لێم کرد، هەر یەك بۆفەردێ
هەر یەك وە ئێشێ، هەر یەك بۆ دەردێ
منیچ هەر یەکێ، وە مەقام خوەی
وتم: بۆی فەردێ وە مەرام خوەی
مەخسووس «حەسەن خان»، شێر بەچەی بابان
با شەئن و شەرەف، نامی و نوکتەدان
وە عززەتەوە، با وەقر و وەقار
وتی: پێم «ئەحمەد»، مەبەر خاتر خار
خاس تر لە برای، مێهرەبانمی
لە شام و نەهار دی هاوخوانمی
چووم بۆ لای «سەردار» وەو ئەساسەوە
بە کەیفو دەماغ وە لیباسەوە
«سەردار» خوەشی هات، حەزی کرد وە دڵ
شکۆفا شێوەش، شیرین‌تر لە گوڵ
هەواڵی پرسی، جواوی فەرز بی
بەڵێ ماجەرام، «واجب العرض» بی
بەیان واقعیم، عەرز سەردار کرد
سەردارم لە کار، خوەم خەبەردار کرد

«سەردار» وە شیرین، شەکەر ڕازەوە
نەوازش فەرما، بە ڕووی بازەوە
حەبسم مەوەقەت، کارم مەجهووله
«داواشی» بۆ تۆ مات و مەلووله
«فەرەج خان» بێرە بکەم دیداری
هیچ بێ مەیل نیەم وە ئیفتیخاری
بە ڕەزای «سەردار»، بە شادی و باشی
فەوری هاوردم، «خان مەنش باشی»
تا سەرداری دی، «فەرەج خان» وە مەیل
عەرز تەعزیم کەرد، خان خاتر کەیل
سەردار نەوازش، کەردش وە نەرمی
دەست «فەرەج خان»، گوشا وە گەرمی
وات: «ئەمیر مەخسووس»، «سەردار موقتەدەر»
وەزعیان چۆنەن، با «سالار زەفەر»
«سنجابی» و «کەڵهوڕ»، چوار نەفەریم
لە باغ دوساخ، تەحت نەزەریم
«سەردار» وات: من و «خان قەرەداخ»
هاین لەم ئوتاقە، حەبسین وە دوساخ
ئەڵبەت بۆ «ئەحمەد»، پا و پلی ئەکەیت
وەچ وەسیله، خاس کلی ئەکەیت
ئەسپ «سەردار» و «سالارەزەفەر»
ئامادە کەردن، پەی ڕاگەی سەفەر
ئەمانەت ئەدەم، وە «کاکە مووسی»
مەوازبی وێت، خاس وە درووسی

خزمەت کاری وێت، خاس‌تر لە نۆکەر
ڕوانەی بکات، تا وە «ڕوانسەر»
فەرمووی: مەمنوونم، لە ئیلتفاتت
خوەشم پێ‌گوزەشت، لە ملاقاتت
انشا الله «ئەحمەد»، سوبح ساعەت هەشت
ئەنێرم فەوری، بسینێریتە دەشت
«سەردار» وە حەزین، «فەرەج خان» عاجز
هەر دو دڵتەنگ بین، لە خودا حافز
«سەردار والی»، بەنی‌ئەردەڵان
دەس بەرد بازی کرد، قوڵف چەمەدان
چەند دەس لیباسی، جوراجۆری بوو
تووسی و عەنابی و مشکی و مۆری بوو
فەرمووی پێم «ئەحمەد، کامیان بۆت خاسە؟
کام پەسەند ئەکەیت، لەم گشت لیباسە؟
فەوری جواوم‌دا، وا وە شتابی
عەرزکەردم قوربان، ڕەنگ عەنابی
بۆ یەك «قل هو الله»، کردی‌و وە بەری
کەندی و دای وە من، لە ڕووی سەروەری
فەرمووی: ئەژنەفی، حەرفم خاتر جەم
ئەچیتە خزمەت، «سەردار موعەزەم»
ئیجازە ئەگریت، دەسی ماچ ئەکەیت
خوداحافزت، زووتر قاچ ئەکەیت
دەست سەردارم، ماچ کرد وە گریان
دڵ ئەر لە سەنگ‌بی، مەکەرد وە بریان

سوورەتمی ماچ کرد، دەسمی گرد وە دەس
بە ڕەزا و ڕەغبەت، کردمی مەرەخەس
مەرەخەسیم خواست، لە ئاسەف ئەعزەم
لوتفی پێم فەرموو فراوان نەك کەم
«خەسرەو»ی هەنارد، فەوری هاتە ڕێم
بۆ خەرجی ڕێگە، دوو تمەنی دا پێم
تا گەیم وە باغ، دیم «کاکە مووسی»
حازرە با ئەسپ، خاسەی خسووسی
«فەرەج خان» تەشریف، ئاوەرد وە مەعقووڵ
دا پێم جفتێ کەوش با سی‌تمەن پووڵ
فەرەنجی‌یە، خاس، «سالارە زەفەر»
قرمزی باڵدار، دا پێم کردمە بەر
دوو گۆش کاکەمووسی گرد وە دەس
فەرمووی ئەڵبەتە، خاس هەوەست هەس
«ئامیرزا ئەحمەد»، تا وە «ڕوانسەر»
خزمەت کاری بیت، خاس تر لە نەوکەر
سوار بین وە جەخت، پا نایم لە ڕکاو
نە وە ڕۆ ئارام نە شەو کەردیم خاو
هەی کەردیم لە ئەسپ، تون خێز ناڵدار
ڕەهوار رابسڕ، خاس تسر لە باڵدار
ئەو ڕۆ ڕاکەردیم، خوەلاسەی کەلام
شەو مەنزڵمان بی، وە مینگەی ئیمام
ئەوڕۆ سوار بین، بەرشین لە پای تەخت
پازدە شەبو ڕۆ، مەڕانایم وە جەخت

یاواین وە «سەحنە»، ئاخر وە هەر حاڵ
باڵ ئەسپان دایم، مەیلەو «چەمچەماڵ»
دوازدەی زمسان، عەید یاران بی
هەوا موخالف، نمنم باران بی
بی وە ڕەفیقمان، «ئامیرزا سەفدەر»
خوڵکمانی کرد، خاس چون برادەر
کاکی وتی وەخت، سەیدمە ئیمشەو
فرسەتە ئەچم، عەیدمە ئیمشەو
ئیجازە بدە، «ئامیرزا سەفدەر»
سوبح زوو تێمەوە بەر لە لیزگ خوەر
وت: ئەچی بچۆ، موشفیقت نیەم
چون هاو مەرام، و ڕەفیقت نیەم
تۆ مەچی وە ماڵ، دۆس حەقیقیت
«ئامیرزا ئەحمەد»، ناکا ڕەفیقیت
ئەوشەو خوەش گوزەشت، لە ماڵ «سەفدەر»
نیشتیم نەخەفتین، تا وادەی سەحەر
گا بەیت گا هۆرە، گا کتاب خوانی
مەردم دەعوەت بی، گشت وە مێهمانی
«سەفدەر» سەوقاتی، بۆم گرد و زایەر
کشمیش شیرین، سەوز «مەلایەر»
یەك جفت جۆراب، با جفتێ دەسکەش
وتی خوەش هاتی، باز ئەچیت وە خوەش
«کاکە مووسی» هات، سوار بین وە تاو
نەهار نیمەڕۆ، بردیم وە «دەراو»

خـــواردمـــان نـــەهار، لە مـــاڵ «قـــازیان»
شـــام شـــەومان بـــرد، شین وە «رازیـان»
لە مـــاڵ «عـەلی ئـاغە»، ئـەوقاتم تـاڵ بـی
خەستە و نـیمەگـیان، حـاڵم بـەدحاڵ بـی
ســـەحەر بـــێدار بین، ســوبحانە وەردیـم
هەی کەردیم لە ئەسپ، نام حـەق بـەردیم
شـــەل و شـــەکـــەت و شـــێویاگ و شـــڕ
وە هەر حاڵ غرووب، شین وە «قولەنگ بڕ»
«کـــــاکـــــی» وت: بـــرا، کـــارمان خـــراوە
دۆســـــێ شـــــناسێ، نـــەیریم لەی نـــاوە
مـــن وتـــم شـناس، خـاسم هـەس دوورە
«ئـــەودەلیە ســـوورە» نـــامی مـــەشهوورە
ســـەڵاحمان ئـــێدەن، هـــەر یـەند تـەدبیرە
هـــەی کـــەین نـــەوێسین، تـــا «جـلۆگیرە»
ئەسپان داین وە بەر، هـەی کـەردیم وە دەو
گـــەیینە مـــەنزڵ، ســـاعەت ســێ لە شـەو
«ئـــەو دەلی» هـــەڵسا، لە خـەو بـێدار بـوو
چـــــمانێ خـــــوەری، لێ ئـــاشکار بـــوو
نـاشتامان کـــرد و فـــەوری بسین ســـوار
وە ســوحبەت کــردن، تـا وە «شـاەگـودار»
ڕووی یـەکتر بـۆسـاین، وەك بـرای گـیانی
ئەسپ خـوەی دا بـەر، بـۆ «قـلیچ خـانی»
مـــــن وە پـــیادە چـــون شـــاتر وە شـاد
نـــــەهارم هـــاورد، وە «مسکـــین ئـاباد»

«شرف‌الملوك» بەو میهرەبانی
خوەش هاتی فەرموو وە خوەش زبانی
لە دوای تەکریم و عەرز سڵامی
لەب بازکەرد چون گوڵ، وە خوەش کەلامی
هەر ئیمڕۆ باوکت، وە خەیاڵ تۆ
هاتگە ها لەگرە، بۆ هەواڵ تۆ
دانیشە ئیستە، ئەنێرمە شوێنی
ساق و سڵامەت، بێت و بیوێنی
هەناردی فەوری، موژدەیان بۆ برد
باوکم لە خوەشی، فەوری غەشی کرد
خۆم هەڵسام و چووم، شاد بووم بە دینی
تا دیم و کەفتم، بۆسام زەمینی
ئەو هەم منی دی، چون گیان شیرین
شوکر حەق کەردش، پیر ساحیب دین
دەردم دەوا بی، ساکن بی‌ئێشم
شاد بیم بە دیدار، ئەقرەبا و خوێشم
پەردەی هەم و غەم، پارە بوو دڕیا
تێر نانم خواردو ئاواتم بڕیا
بچین وە سەر بەحس، «پەهلەوی ئێران»
چۆن ئابادی کرد وێرانەی وێران
نەزم نزام دا، قودرەت وە لەشکەر
کەفت وە فەراسەت، دانشگا و ئەفسەر
پەیمان ئیقتساد، لە گەڵ هەمسایە
بەسا و ئیرانی، گەیان وە پایە

دەستوور بهداشت، دا وە بهداری
شار و خیاوان، کەردن گوڵکاری
جادە و خەت ئاهن، کێشا شار وە شار
بۆ بازارگەرمی، کەسەبە وتوجار
تا سێسەدو دە، لە رووی هۆشیاری
مەشغووڵ بی وەکار، مەملەکەت داری
فکر کەرد «ئێران»، گشت عەشایەرە
کشت مەزرەعەی، دایەر بایەرە
با شەور و تەدبیر، ئەمیران دەور
دەستوور مەخفی، سادر کەرد وەی تەور
بە ڕەمز سڕی، تۆڕ دام ئەفسوون
دایان لە دەهۆڵ ساز کمیسوون
لە غەرب تا مەشرق، جنووب و شماڵ
وات وە ئەمیران، بافەڕو ئیقباڵ
سەردار سەر ئێڵ، «فارس» و «تورك» و «کورد»
لە «لەك» و لە «لوڕ»، لە گەورەو لەورد
مەخسووسەن سەفحەی، غەرب ئەکرادی
شار و دهکدە و وادی وئابادی
«سەقز» و «سابلاخ»، «بانە» و «مەریوان»
نەوار مەرزی، شار «هەورامان»
خەتەی «خانەشوور»، تا وە «شێخ سڵە»
«سەرقەڵاو» «جەیران»، تا وە «ئەزگڵە»
«زهاو» و «سەرپێل»، «قەسر» و «خەسرەوی»
وە ئەمر مەتاع، «ڕەزای پەهلەوی»

دەســـتوور خــەلع ســلاح گشت دریــا
«ئــێران» ســەرتاسەر، خــەلع ســلاح کــریا
«ئێران» ســەرتاسەر، گشت بــا خــەبەر بــوو
بــەنای کــمیسوون، مــەرامــی دەر چــوو
وە دام تـــــەزویر، وا ئـــەفسوون کــەردن
لەم خـــەتە مـــەنزوور، کـمیسوون کـەردن
وتـــیان کـــمیسوون، فــەرز و واجـــبەن
وا وانــموود کــەرد، پــەی مــەواجــبەن
کــەدخودا و نــۆکــەر، بەگ و بەگزادە
خــان و خـــەوانــی، گشت بــین ئــامادە
لە ســێسەد و دە، بیست و هــەشت ئــازەر
کـــمیسوون کــەردن، نــزام و ئــەفسەر
دەســتە وە دەســتە، وە بـێ چــەن و چــوون
نــوختە وە نوختە، چــوون بـۆ کـمیسوون
بەعزێ دەعوەت نــەو ئــەچوون وە نــاحەق
خۆیان داخڵ کــرد،وە چــەند شــەڕە شــەق
منیچ دەعوەت، بووم، ئــەڵبەت بــا تــفەنگ
شکــاری دوورکــوژ، دانســقەی فــەرەنگ
لەگەڵ ئاغایان، گشت چووین بۆ «قــەڵا»[1]
نـــــاغافڵ کــــەفتین، وە داو بـــــەڵا
«یــاوەر ســەمیعی»، خــاسمی ئــەناسی
فـــەوری لەو داوە، کـــردمی خــەلاسی

---

١- مەبەست قەڵای جوانڕۆیە.

چــون بــەینێ پــۆسی، لە ڕوانســەر بــی
لە حــاڵ و ئــەحواڵ، مــن بــاخەبەر بــی
سەرسەوز و بۆرچین، کەوك و مورغ و مێش
شکــار مــەکــەردم، مــەوەردم پــەرێش
بــانگی کــرد و هــات، یــەکنەفەر وەکــیل
تــوفەنگم دا پــێی، بــێ بــەڵگە و دەلیـل
مــەخفی وتــی پــێم، دەر چــۆلە «قــەڵا»
زوو وە ســـــڵامەت دەرچـــــۆ لە بســـەڵا
دەرچــووم لە قــەڵا، ڕێگــە بەن و بەس
گــرتمیان فــەوری، هــاوردمیان و پەس
چــوار دەور «قــەڵا»، وە پــۆست سەرباز
بــەسیابی نــەوی، ڕای عــبوور وە بــاز
دەســــم دا وە دەس، دوو نــەفەر دژیــان
ڕوانەم کەردن، تا وە «خــوەش مــەکــان»[1]
وەخــتێ بــەرئامان، لە تــۆی کــمیسوون
نــۆکــەران زەلیــل، ئــاغایان زەبــوون
ســـر کــــمیسوون، وا بســـەرمەلا بـــی
«قــەڵای جــوانــڕۆ»، وە «کــەربەلا» بـی
شـــتوور شـــیرین، شـــین فــەرهاد بـــی
واوەیـــلا و ڕۆڕۆ، داد و بـــێداد بـــی
یەکجار «حەبێ خان»، پەی فەرزەندانش
پـــیاپەی مـــەکــەند، لەب و دنـــدانش

---

١- ناوخۆشگان لە نزیکی جوانڕۆ.

نـــاحەقش نـــەوی، دڵ زەدەی غـــەم بـــی
فـــەرزەنانش گشت، وێـــنەی ڕۆســـەم بـــی
«سەلما» پەی «وەکێڵ»، «فاتمە» پەی «ڕۆستەم»
ئـــەسرین خـــوێنین، مـــەڕێزان وە چـــەم
«ئاسە» پەی «عزیز»، «ئاهوو» پەی «حەسەن»
«جەهان» پەی «حوسەین»، مەکەردش شیوەن
ڕاســـتی پـــەی دەرمـــان، یـــەك دەردەدارێ
لە کـــــوردەواری، نـــــەما ســـــەرداری
بـــــەیگزادە پـــەشێو خـــانان وە خـــجڵ
وە پـــــای پـــیادە، کـــەفتنە بـــەرف و گـــڵ
چـــوار چـــوار بەستن، سەرباز دایە بەر
وە شـــەق و شـــەلاق، تـــا وە «ڕوانســـەر»
وە نـــاز تـــەنپەروەر، خـــان و خـــەوانـــی
پـــــا وە بـــێ پـــێڵا، بـــەرف تـــا زرانـــی
ســـــەید و شـــــێخ و ئـــاخوند و مـــەلا
کـــێشان وەك یـــەسیر، دەشت «کـــەربەلا»
کـــــێشان وە کـــەشان، خـــاتر پـــەرێشان
بـــاڵ بـــەستە و خـــەستە، تـــا وە «کـــرماشان»
حـــەبسی کـــمیسوون، «ئـــەزگڵە» یـــەکســـەر
گـــــردن هـــاوردن، ئـــەو لەمـــان بـــەدتەر
وەك گـــــەلە وە گـــــەل، کـــــریانە گـــاراج
بـــــڕیا نـــەمەند ڕای، تـــەدبیر و عـــیلاج
ســـێ ڕۆژ لە گـــاراج، بـــێبەرگ و پـــۆشاك
خەستە و نیمەمەرگ، کەفتن لە ڕووی خـــاك

بــرا پــەی بــرا، فــەرزەند پــەی پــدەر
ڕەستاخێزێ بی، ئەوڕۆ چون مەحشەر
«کرماشان» یەکشــان، واوەیـلا و شین بی
تەم غەم پۆشا و کەس نەوین بی
لە دوای ســێ ڕۆژە، دەســتوور سادر بی
مــاشین ســەوقی، حسەبسی حــازر بسی
وە تــرك و وە تــۆف، وە بــەرف و باران
وە مــاشین ســەرباز، بــریان بۆ «تاران»
هەیڕۆ لەو وەختە، شین وە تۆی ماشین
بسی وە بــاوکەڕۆ، گشت دایــان لە شــین
ماشین کەفتە ڕێ، بەو زەلزەلەی سەخت
وەچ ســەخڵەتێ، گــەیین وە پای تەخت
یــاوان وە «تــاران»، وە خــاتر نــاشاد
مــەحبووسین بــەردن، وە عشــرەت ئاباد
مــەغرب و مــەشرق، جنووب و شــوماڵ
گشت وە کــمیسوون، دریــا گــۆشە مــاڵ
«سەقز» و «سابڵاخ»، «سەردەشت» و «بانە»
ئــــــاوەردن وە زەرب، زۆر تــــازیانە
وەك گــــەلە وە گــــەل، بــۆ قــەساوخانە
قــەبووڵیان نــەکــرد، عــوزر و بــەهانە
«ســـەردارە ڕەشــید»، هــات وە نــاویان
چــاوی کــەفت وە وەزع، نــاحەساویان
ســـەردارانسی دی، بــاڵ بەستەو حەزین
ســەری تــەکــاندا، هــەر وە پێ کەنین

لە دوای یەك حەفتە، لە باغ وەحش بین
گشتیان جەم کردن و تەوهین و قین
گشت لە باغ وەحش، متەوەحەش بین
مات و مەبهووت و بێ گیان و لەش بین
فێشتەر بی فشار، خوف و بیم یان
تا دەستوور دریا، بۆ تەقسیم یان
گشت لە یەك برین، پارەو پەیوستە
گرۆ وە گرۆ، دەستە وە دەستە
مەئموور مەخفی، سەوقی بی تاین
نەپرسا لە کەس، خادم و خاین
ئاوەردن ماشین، سەوقی وە جارێ
بێ خەبەر لە یەك، هەر یەك بۆشارێ
وە پەرت و پەلا، بەردن بۆشاران
بەعزێ مستەوجب، ماوە لە تاران
تا مدەی دە ساڵ، لە حەبا خەفتن
ئەڵبەت بەعزێك یان، گۆڕ غەریب کەفتن
بەو تەور بی تەقدیر، سڕ سوبحانی
هەڵ گرِیا ئاگر، جەنگ جەهانی
«ئاسیا» و «ئەفریقا»، و «ئورووپا» یەکسەر
گۆشە وە گۆشەی دونیا گرتە بەر
لە بڵێسەی بەرز، گاز ئاگر خێز
سارا سووزان بی، سەما تەم ئەنگێز
دوود و دەمەی تۆپ، بی وە هەور شەڕ
پۆشا ئاسمان، دونیا پەڕ تا پەڕ

لە نالەی کووس و ساز و بەرگ جەنگ

دونیا و مافیها، بی‌وە شەوەزەنگ

لە گڕەی تۆپ و تانك و تەییارە

ئاگرواران بی، دونیا یەك بارە

چەندین دەوڵەتی، ڕازی و ناڕازی

تەسلیم بین وە ئەمر، «ئەڵمان نازی»

«هیتلر» لە «ئاڵمان» سەدرئەعزەم بی

شەڕجۆی شەڕئاشۆی وێنەی ئەو کەم بی

سامان و سان دا سپای «ئەسکەندەر»

وست وە مەترسی، دونیا سەرتاسەر

یەك جار ئوروپا، شەرق و غەرب یەکسەر

خاو حەرام هەر شەو لە تاو «هیتلەر»

گاز خەفەکون بووم ئەژدەری

ناو ناوشکەن سپای «هیتلەر»ی

فەرمان شەڕدا، هەر وەك شێر نەڕ

ئەمر حەملەدا، لە بەحر و لە بەڕ

«ئینگلیس» و «رووس» و «ئەمریکا» یەکسەر

گشت بوون وە یەکێ بۆ تەنیا «هیتلەر»

پەی جەهانگیری، «هیتلەر» تەنگش بی

لە چەندین لاوە، جبهەی جەنگش بی

«لنینگراد» گرد، جەنگ کەفتە «مسکۆ»

«شەورەوی» بێ‌شۆ، ئاوەرد وە ستۆ

نەخشەی مەرامی، تەسخیر «رووس» بی

بی وە نەخش ئاو تەرحش مەعکووس بی

بـــێ جەنگ و داوا، بـــێ کــــینەتووزی
«ئـێران» بـی وە پـێڵ، فـەتح فـیرووزی

وە ئـاگـر جــەنگ، دونـیا بـی وێــران
لە ســـێ لاگـــۆشەی، کـێشا وە ئـێران

«ئینگلیس» لە جنووب، «شەورەوی» لە غەرب
«ئەمریکا» لە شەرق، داخڵ بین وە حـەرب

هەر سێ وە «ئێران»، قـەوڵ شـەرەفی دان
تـــەرەفەین ئـــەعلان، بـــێ تەرەفی دان

لەم بەینا «ئێران»، مەحفووز بوو لە جـەنگ
مینای سیاسەت، خـوەی نـە دا لە سـەنگ

وا بـی سـیاسەت، کـەس نـەوی وەکـەس
. مەحبووسین لە حەبس، کریان مـەرەخەس

هــەر ســێ دەوڵــەتە، ڕەئـییان دا لە بـان
وە شـــاه نـــەمێنێ، ئـیتر «رەزاخـــان»

بـــە عـــەقڵ و تـــەدبیر، وە فـــەراسـەتیان
بـــوودەنی نـــەقس و بـــۆ ســـیاسەتیان

هـــەر ســـێ دەوڵــەتە، بــۆیان دانــیا
«ڕووس» و «ئـــــەمریکا» و «بـــریتانیا»

لەم ســێ دەوڵــەتە، هــەرکـامیان خـاسە
ئـــینتخابی کـــە، ســـەلاحەت واســـە

زەرووره دەســــتوور، مــەخفی بــخوێنی
نـــەقدەن لە ئـــێران، نـــاوێ بـــمێنی

«ڕەزاخـان» وتـی، وە بـێ چـوون و چـەن
بــە ڕەزا و ڕەغـبەت، ئـەچم وە «لەنـدەن»

دەستووریان دا وە، جڕناڵێ ئینگلیس
بەرعەکس «لەندەن»، بەردن وە «مووریس»
لەو جەزیرەی سەخت، خار خەتەرناك
تۆشەی وەتەنی، بی وە مشتێ خاك
هەر شەو تا بە ڕۆ، هەر ڕۆ تا وە شەو
وە پەژارەوە، بێ خوەراك و خەو
هەر ڕۆژ تا وە شەو هەر شەو تا بە ڕۆ
داد مەکەرد مەوات: هەی ئێرانم ڕۆ
گۆشە وە گۆشە، ئاگر بەدبەختی
خستیە مەترسی، «ئێران» وە سەختی
شای تازە جلووس، ئەر چی جەوان بی
گیر سیاسەت، دێو دەمان بی
جادوان وە جەخت، وا جادوو کەردن
برا پەی برا، وە عەدوو کەردن
هەر سێ دەوڵەتە، لە «ئێران» مەندن
توخم سیاسەت، خاس خوەیان شەندن
تەمام سەرداران، «ئێران» سەرتاسەر
گشت غەنی کەردن، وە قەند و شەکەر
وا شیرازەی کار، «ئێران» لە دەس چوو
کەس بی وە ناکەس، ناکەس وە کەس بوو
سڕ سیاسەت، ئاشکار کەردن
خائنانیش دەست، شەڕ بەر ئاوەردن
گرۆی بەدکاران، وە بەدی بازدا
وە شەخسی دەستور، خەلع سەربازدا

شەخسی وە خەیاڵ، یەختەرمە و تفەنگ
ڕۆژ لە نزامی، کەرد وە شەوەزەنگ
نزامی و سەرباز، گشت دەروەدەر بین
بێ سپەهبود و بێ سەرلەشکەر بین
فەرق نەما لە بەین ئەفراد و ئەفسەر
پاشیان پەشێو بین، بی وە چارەسەر
سەرباز لە تەنگی گشت لە حەول گیان
بڕنەوی ئەدا یەکێ وە دوو نان
کار بەدکاران، یاوا ئینتها
«ئێران» بەرد وە بان، پرد پەرتگا
پادشای جەوان، ئاگا بی لە کار
دی «ئێران» یەکسەر، بووگە شەوی تار
کەفتە ڕای چارەی، بورهان و دەلیل
بە هەمرای چەنکەس، ئێرانی ئەسیل
هەر ڕۆ کمیسوون، چارە بی و تەدبیر
«فروغی» کەردن، وە نوخوستوەزیر
لە بێشەی مەجلس «فروغی» چون شێر
مەترچ کەرد سوحبەت بێ پەرواو دلێر
وات: موتەفقین، بەرخیلاف قسەوڵ
لە «ئێران» ژەندن، ئەوەن ساز و دەوڵ
وەتەن خوای شەریف، لە پەردەی غەفلەت
دەرهاتن وتیان، وە هەر سێ دەوڵەت
مۆر و مەدرەکی، بێ تەرەفیتان
ئەو قسەوڵ و ئەقرار، با شەرەفیتان

یەك یەك چون دانە، گوم لە گۆش کەردن
وەقر و قەدر و قەوڵ، فەرامۆش کەردن
تاکەی لە «ئێران»، تاخت و تاز ئەکەن؟
درگای بەد بۆ کەس، ناکەس واز ئەکەن
«ئەمریکا» و «ئینگلیس»، یەکەیە وەردن
جەواب موستەشار، تزاری کەردن
«قەوام» وە دەستوور، شا شی وە «مسکۆ»
تا لەگەڵ «ڕووسا»، بکا گفت و گۆ
قەرارداد نەفت، بەستن وە مەجهوول
وەلێ مەجلسەین، نەکەردن قەبوول
«ئیستالین» ئەعلان، تەهدید ئامێزێ
کەرد وە حەرارەت، شەرارەت خێزێ
واتش: وە ئەرواو، قەور «لنین» قەسەم
وە پێشەوایان، پاك دیسن قەسەم
ئەر نەخەفێنن، ئی هەراو جەنجاڵ
ئێران پاك نەکەن، لە گەرد ئەشغاڵ
«شەورەوی» بێ سەور، بێ‌شەور و تەدبیر
حازرە بۆ هەر، قەزا و دار و گیر
«قەوام» بە دڵ شاد، ئاما وە «ئێران»
موژدەی نەجات دا، وە باش دلێران
ئەو کاتە «قەوام»، موژدە ئاوەردش
سیاسەت وا بی، ئیستعفا کەردش
شەخسێ فەهمیدەی، نوتاق فازڵ
بە ناو «موسەدق» غەیوور و عاقڵ

بــۆ نــەجات «ئــێران»، هــەر وە پــەلەپەل
شکــــایەتی کــــرد، وە «بــــەینەلملەل»
لایــــحە و مــــەدرەك، بــورهان و دەلیــل
ئەعلام کەرد فەوری، «روزوڵت» و «چرچیل»
چەنی «ئیستالین»، هــەر سێ بێقوسوور
«ئــــێران» تــــەخلیە، بکــەن وە زەروور
حــەیفە بشکــێنین، حــەڵقەی شــەرەفەین
«ئــێران» بــێ وە پــێڵ، بــەین تــەرەفەین
مــــەئموور ســیاسی، بــخوێنین وە زوو
«ئــێران» خــاڵی کــەین، لە هــەر ئارەزوو
«مــوسەدق»[1] زانــای، ئــاگــا و ڕۆشــنبیر
نــەفتی مــللی کــرد وە شــەور و تــەدبیر
شــــووم و شــــەرەریان، بــــڕیا بــێگانە
«ئێران»یان جێهێشت، لە دوای وێرانــە
بــەند ئــینحسار، خــارجــی لە نــەفت
بــڕیا و پــارە بــوو لە دەســیان داکــەفت
ئــاگــر بــەدبەختی، بــەربوو بــە وڵات
«ئــازەربایجان»، بــۆی بــۆسۆی نــەهات
ئــــاتەش ســــووزان، «ئــــازەربایجان»
ســۆزنا بــە ســۆز، دڵ و جــەرگ و گــیان
دووکــەڵی خــاتر، شــەهەنشا تــەنگ کــەرد
مــودبرانــە وێش، ئــیرادەی جــەنگ کــەرد

---

١- دوکتور موسەدق.

فـــەرمان دا فـــەوری، وە فـــەرماندەهان
گشت ئـــامادە بـــین، وەك پـــیل دەمـــان
دریـــا لە شـــەیپور، ئـــەفسەران وەپـــێش
پێش وە پێش مەچیان، هەر کەس پەرێ وێش
تـــۆپ و تـــۆپخانە، مـــوهممات جـــەنگ
وە فـــــەرمان «شـــا»، بـــەردن بـــێ‌درنگ
شـــاه بـــەرگ جـــەنگی، وێش لەبـــەر پـــۆشا
ســـپا مـــــوجەهەز، جـــۆشا و خـــرۆشا
ئـــەفسەران یـــەکسەر، چـــون ئـــاگر پـــارە
دەس دان وە ســـــلاح، تـــۆپ و تـــەیارە
لە شـــــماڵ‌غەرب، ســـەر بـــەر ئـــاوەردن
«ئـــــازەربایجان»، ئـــــیحاتە کـــــەردن
ئـــە فـــــەران چـــون شـــێر، وە گـــیان فـــدایـی
قـــەتع کـــەردن ئـــاهەنگ، ســـاز جـــودایـی
ئـــارامش بـــەخشان، وە شـــار «تـــەبریز»
خســـــتیانۆ ئـــاغۆش، «ئـــێران» عـــەزیز
کـــەمێ بـــوو لە بـــاس، جـــەنگ جـــەهانی
ئـــەڵبەت نـــە ئـــەوەڵ، بـــەڵ جـــەنگ ســـانی
لەم دار و گـــــیرا، ســـەرداریش بـــەر بـــوو
وەلێ ڕشـــتەی کـــار، لە دەســـی دەر چـــوو
زنـــــدان و پـــــیری و ســـەختی ڕۆزگـــار
تـــەوانـــا و هـــێزیان لێ ســـەند بـــە یـــەکجار
ســـــەرداری لایـــەق، بـــاش و دڵســـۆزوو
نـــیشانەی مـــەردی، و غـــیرەتی هـــۆزوو

ڕۆسەم ئاسا خوەی، لە وەخت کارزار
دونیا لە دوژمن، مەکەرد تەم و تار
تۆفان سپاش، وە هەر لا مەشەند
کاو و کۆ وێنەی، یەك لە بێخ مەکەند
دەستەی تفەنگچیش، مەشیان وە سەنگەر
پەی سەد کافی بی، تەنیا یەك نەفەر
چابك سەواران، داو دیدە و توندڕەو
ڕۆ لە دوژمنان، مەکەردن وە شەو
لەشکەر مەوج مەدا، چون دریای جەیحوون
بەرق ئاسا لە خەسم، مەدا شەبیخوون[1]
ئومێدەوارم، کە وا گەلی کورد
بەسەرهات سەردار، بخوێنن بە ورد
ئەرچی کارێکی بچووك و وردە
بەڵام مێژوویەك بۆ گەلی کوردە
تا بۆ چارەی دەرد، دەرمان بسازن
لە ڕێی خەباتا، خۆیان نەبازن

---

١- «ڕەزاشا» کە زانی بە زۆر ناتوانێ هێزی کوردان بشکێنێ لە سیاسەتی زەڕ و تەزویر «حیلە» کەڵکی وەر گرت وە هەندێ لەسەرانی عەشایەری فریۆ دا وەپاشان بە هاوکاری ئەوان هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکانی کورد وەپاش سێ شەوو سێ ڕۆژ گولە بارانی شاری «ڕوانسەر» «سەردار ڕەشید» پاشەکشەی کرد بۆ خاکی «عیراق» وە ڕۆژ نامچەی «وطن» لە لایەن «ئیران» بە بۆ نەی ئەم زاڵ بوونەوە بە سەر هێزی کورداندا لە ژێر سەر دێری «سرود فاتحانە» لە ژمارەی ٢٥ حوتی ١٣٠٢ی هەتاوی نووسیویە:

ساقی بیار بادە مطرب بزن چغانە — کامروز روز عیش است بی‌عذر و بهانە
اردوی لشکر غرب بانتظام کامل — برگشتە از «روانسر» منصور و فاتحانە

## مەرسیەی مامۆستا «شێخ محمّد سعید نقشبندی» بۆکۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی»

کاکی عەزیزم، کاکە «ئەحمەد» گیان!
شاعێر ئەدیب، دانای پڕ عرفان
نوکتەزانی ڕۆژ، فەردی زەمانە
محبوب القلوب خوێش و بێگانە
بولبولی باغی، عیشقی حەقیقی
وەسفی ناکرێ، نەبوو ڕەفیقی
خودای لێ ڕازی بی، تەسکینی دڵان
لە هەر مەجلسێ گوڵچینی گوڵان
بەزلە گۆی دەهرو، تەڕاز گوفتار
خودا بیبەخشێ یەزدانی ستار
ڕەحمەتی لێبێ، کۆچی دوایی کرد
یەقین بزانە، ڕەزای خودای برد
ڕۆژی سی‌ویەکی، برجی شەشەم بوو
ساڵی پەنجاونۆ لە دنیا دەرچوو
خودای لە گەڵبی، ئیمانی پاکی
نووری ڕەئفەت و کرداری چاکی
بەڵکوو لە سایەی، فەخری کائینات
ئێمەیچ هەر وەها، بگرین ڕێی نەجات
تا ڕۆژی لەقای، مەحبووبی ڕەحمان
لە شەرارەی گەرم، عەزاب یەزدان

لە بـــۆ وابـــەستە و فـــەرزەندان ئـــەو
داوای خوەش‌بەختی ئەکەم ڕۆژو شـەو
ڕیگـــەی ڕاســی دیـن وەگـیانو وە دڵ
بـــێ‌خەتا بگـــرن تــا ئــاخر مـــەنزڵ
تـــا ڕۆحـــی پـاکـی، ڕازی بـێ لێ‌تـان
نـــەکـــوو دڵ‌تـەنگ و ئـازوردە پـێ‌تان
ئێمەی دڵ خەستە، دوای کۆچی یـاران
تەنهای بێ ڕەفـیق، غـەم وەکـوو بـاران
هـــــەرتاوێ، تــــاوێ، تـــۆفانی‌دەکـــا
مــــاڵ و کــاشانەی دڵ فــانی دە کــا
ڕۆژێ لە ڕۆژان، کــــــاتێ لە زەمــــــان
دیت کە وا ئـەجەڵ، پـەی دەریـافت‌مان
گـــــەڵای بــــــەرگمان، وا لە دار کـــنیا
هـەستی و ئـەختیار، لە دەسـمان سـنیا
ڕۆژێ کــــە تـــەنها عـــەمەڵ حـــەساوە
ژن، مـــــناڵ و پـــــووڵ فــــــڕەدە لاوە
یــا خــودا بـاران ڕەحـمەتێ بـارێ[1]
وە سەر مەزرەعەی، ئوممەت‌دا بارێ[2]
«ســــعید» نگـــەران مـــەبە لە کـــۆچی
نـــازانـــی ڕۆحـی کـە شـادە بـۆ چـی؟

★ ★ ★

٥٩/٧/٢ ی هەتاوی شەوی هەینی «مراوا»

---

١- یەدفعە ـ یەجار.
٢- ببارێ.

## مەرسیەی مامۆستا سەیید «موحەممەد[1] تاهر سەیید زادەی هاشمی» بۆ کۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی»

دوڕ شەهوار بی دوڕ شەهواربی
«ئەحمەد» خەزانەی دوڕ شەهوار بی
نە نە، وێش وێنەی بەحر زوخار بی
سەد خەزانەی دوڕ تێشدا دیار بی
چەنی بوانۆش دانەی لاڵ شناس
ئەو وێش هۆر مەدا دانەی بێ قەیاس
نە دەریای قولزم سینەی سافوێش
بە غەواس زەین پاك پاك ئەندێش
بەرماوەرد قەتار دانەی بێ‌قسوور
درخشان وێنەی شۆڵەی شەمس پوور
درێغ ئەو ئوستاد دانای سوخەن‌سەنجا
ئەو نادرەی دەور کیمیای کۆی گەنج
جا دار وە حەق «خانا»ی خاس خەیاڵ
کەلامش بازار «شەفیع» کەرد بەتاڵ
کەی «ئەلماس» چون ئەو سوخەن پەرداز بی؟
کەی «وەلەد» چون ئەو شەکەرین ڕاز بی؟

---

١- مامۆستا سەیید تاهری هاشمی مامۆستای ئاینی و زانای بە ناو بانگ هونەرو ئەدیب و مێژوو زان خەڵکی گوندی «دەولەت ئاوای» ڕوانسەر یەکێ لە هاوەڵانی نزیك و خۆشەویستی «میرزا ئەحمەدی داواشی» بووە کە زۆر جار نامەیان بە شێعر بۆ یەك‌تر گۆڕیوەتەوە.

«تورکەمیر» شاکر مەرتەوخانەش بی
«حەیدەر» فدای تەبع ئوستادانەش بی
«شاکە» جە واتەش خار خامۆش بی
«مەنسوورخان» پەرێش حەڵقە نەگۆش بی
واتەی شیرینش شۆرمەوست نە دڵ
مەر واتەی ئوستاد «بێساران» مەنزڵ
بە جا بی ئەر شەم پەیش بۆ پەروانە
نمەك سەند جە شێعر «وەلی دێوانە»
بەیتش «مەولەوی» وەش دەماخ مەکەرد
بوڵبوڵ شەیدا و شێت داخی داخ مەکەرد
کەلامش نە هەوج زیبایی و خووبی
ویەرد نەپایە و مایەی «یەعقووبی»
بەڕاستی «قادر» بەستەی سەیدش بی
«یوسف» کەمانکەش «سەیدی» سەیحش بی
تا ماما بە نوتق بەو شیرین باسی
سەنگ مەدا وە قاڵ «خاڵۆی کۆماسی»
«قادری» تەریق «تاڵەبان» مەشرەب
کردەوە شەریف «شافعی» مەزهەب
مورید دەرماڵ «غوث‌الاعظم» بی
چو بی سینە ساف ئەو وێنە کەم بی
ئاخ چەند جار جە ویرئەو حەیران مەندم!
ماشاالله وە زەین حافزەش وەندم
چون شنۆی بەهەشت تا مەیاوا پێم
مەوستم ئەو تۆف نەوجوانی وێم

ماوەردش ئەو ویر پەردە وە پەردە
وادەی سالان و عومر ویەردە
ئاخ چەند جار جە ویر ئەوحەیران مەندم
ماشاالله وە زەین حافزەش وەندم
دەك شادیش جە حەق لایەزالی بۆ
مەر تەبەش جە نۆ هەرسات عالی بۆ



## ٢

مایدەم تەباهەن مایدەم تەباهەن
کەریم مەزانی مایدەم تەباهەن
ڕووم وێنەی دەفتەر کەردەم سیاهەن
مووم سفید جە هەوڵ مەترسی ڕاهەن
پیری و زویری کەردەو ناکەردە
بار تاوانان جە حەد ویەردە
وە سەمین تازاو شەرمەساری وێم
بە لوتفەکەی وێت بۆ نەگێرە لێم
تا بارۆ وە یاد هامفەرد فەردم
هۆر دۆ جە قاپێت ناڵەی نەبەردم
یا دانای داوەر یاحەیی سەمەد
جە ئەزەل عالم بیت بە واتەی «ئەحمەد»
چەند هەزار ساڵ پێش جە خەلق ئەروا
جە خەلق ئەجاد دونیاو مافیها

مەزانات «ئەحمەد» چەند بەیت مەسەنجۆ
جە کێ مەبۆ شاد جە کێ مەڕەنجۆ
مەزانات ژمار قافیەو فەردش
تاو کوورەی دڵ هەناسەی سەردش
هەر بەو عیلم وێت یا دانای غەفوور
کەرەم کەر وە مەیل بویەر جە قوسوور
ئاخر وە ئیخلاس نام تۆش بەردەن
چەند جار وە قاپیت موناجات کەردەن
وەسف حەبیبت وەندەن پەی یاران
شاد کەردەن دەروون جەرگەی خەمباران
ئیسم دۆسانت ئاوەردەن وە یاد
ئەسرینش واران کەردەنش فەریاد
خوسووس بەردەن نام سلطان الرجال
شاباز لاهووت «غوث» «بەغداد» ماڵ
جە بادەی تەوحید سەرمەست مەدهۆش
شاهان سەرپەنا قطب ڕەف ڕەف دۆش
گدایان هاودەم سولتانان قاهر
بەو عبدالجبار «شیخ عبدالقادر»
یا ڕەب تۆ بە حەق شێوەی پاک ئەو
بۆ جە عشق وێت سینەی چاك ئەو
بەو شۆڵەی ئەنوار شۆخی شێوەی ئەو
بەو گرد ئەولیا پەرێش لێوەی ئەو
بەو حەڵقەی تەدریس بەحس و فتوای ئەو
بەو زکرو تەوحید جلوەو جەلای ئەو

بـــا لوتـــفت چـــەنیش لایـــەزالی بـــۆ
رۆ جـــە رۆ فـــێشتەر پـــایەش عـــالی بـــۆ
بوویەر جە «ئەحمەد» ئەحمەدەن نامش
چون شیرین شێعرەن تاڵ مەکەر کـامش



٣

«ئەحمەد» داخ‌و دەرد «ئەحمەد» داخ‌و دەرد
مەرگت پـەی دۆسـان بـی وە داخ‌و دەرد
هیجرانت نە تـەرح تـۆف هـەوای سـەرد
ڕەونـــەقش نـــە ڕووی نـــۆ گـــوڵاڵان بـــەرد
فـــەسڵ نـــۆ پـــاییز وادەی مـــەینە وەخت
دووریت شەند نە دڵ یـاران زام سـەخت
پایان دای وە ڕەسم شادی و شۆرو شەوق
داخ پەی تۆ سەدجار وە گـەردەنم تـەوق
کـــــێ بـــــڵاونۆ دلێـــــران کـــــورد
زەڕیـــن ڕکـــابان ســـاحێب دەست بـــورد
کـــێ واچـــۆ تـــاریف مـــوشکین کـــڵافان
سەرتا پـا بـێ عـەیب بـۆ عـەنبەر نـافان
کـــێ هـــۆر دۆ وە ســـۆز وادەی مـــوناجات
وە قـــاپی ڕەفـــیع خـــوداوەنـــد حـــاجات
کـــێ وانـــۆ مـــەدیح «فـــخرالمـــرسلین»
مـــــەحجووب لا ریب «رَبّ العـــالمین»

هـەنی کـێ بـەرۆ چـەنی جـەزبەو حـاڵ
لاڵـە وە دەرگـای «غـوث» بـەغداد مـاڵ

بە ڕاس هەی «میرزا»ی دوڕ فـرۆشەکـەم
«نیای بار خـەم وێت نـە دۆشـەکـەم»[1]

تـۆ نـە خـاو خـۆش مـن مـەدهۆشەکـەم
تـۆ تـەسلیم نـۆش مـن ژار نـۆشەکـەم

وە ئـایر دووریت دڵ پـڕ جـۆشەکـەم
گـا نـەزایـەڵەو گـا خـامۆشەکـەم

چـون نـەمەیۆدەنگ تـۆ نـە گـۆشەکـەم
وە بـاتن پـەرێت سـیاپۆشەکـەم

ئومێدەن وە سـەوت نـاڵە و سـۆز عشـق
وە پـڕتاو تـیر جگـەر دۆز عشـق

وە گـدای هـەستی جـەکـەف دادە عشـق
وە مەست بێخود نەشئەو بـادەی عشـق

وە شۆڵەی ئـەنوار زوڵـمەت زدای عشـق
وە شـادی دایـم مـەینەت فـەنای عشـق

وە وادەی سـوبحدەم کـزەی لەرز عشـق
وە وەخت ئـێوار نـاڵەی بـەرز عشـق

وە سـروەی نسـیم بـۆ عـەنبەر عشـق
وە هـاژەو واران پـڕ تەئسیر عشـق

لوتـف حـەق چـەنیت لایـەزالی بـۆ
پـایەت نـە مـەجلس پـاکـان عـالی بـۆ

١- ئەم مسراعەی لە شێعرەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی» هێناوە.

## بەشێ لە مەرسیەی ماموستا «محی‌الدین صالحی» بۆ کۆچی دوایی «میرزائەحمەدی داواشی»

میرزام خامۆشەن، میرزام خامۆشەن
خامۆشیش جە نۆش نۆمالی نۆشەن
وجوودم جە جۆش دووریش بێ‌هۆشەن
ئەدیبان پەرێش کوڵ سیاپۆشەن
ماتەم پەخش بیەن وە دەشت‌و دەردا
خاک کەردەن وە سەر کۆو هەردو بەردا
چەشمەو کۆساران قەڵاخی کەردەن
چەمان پڕ ئەسرین دڵان پڕدەردەن
باغان بێ ڕەونەق گوڵان ڕەنگ زەردەن
گەڵاڕێزانەن چون تۆشان مەردەن
بوڵبوڵ جە گوڵشەن شیوەنش سەردا
بەرەزا پەشێو وە ڕووی کەمەردا
حەفتاد ساڵ خزمەت وە مەردوم کەردی
مەداڵ جە مەیدان شاعێران بەردی
ئامیرزا ڕۆحت وە جەنەت شاد بۆ
نۆماڵیت وە ڕەحم خودا ئاباد بۆ
مەحفووز بای جە سای خودای ئەکبەردا
شاد بای وە شادی ڕای پەیغەمبەردا
«میرزا»م مانگ مێهر ساڵ پەنجاو نۆ
هەزارو سێ‌سەد لوا وە گڵکۆ

## بەشێ لە مەرسیەی «موحەممەد عەلی[1] سولتانی»
## بۆ کۆچی دوایی «میرزا ئەحمەدی داواشی»

چەنی تەبیعەت خەزانش کەردەن
تەشریف وە سەرای خامۆشان بەردەن
ئەنجومەن ئارای تاڵەبان تەریق
شووریدەی شەیدا مرید سدیق
باش ئوستای چەمەر قەدیم سەرداران
مەرهەم پەرێ زام خاتر پڕخاران
چەندین دانە و دوڕ مەکنوونت سولتەن
نە سینەی سەردت چەند ڕاز نەهولتەن
پیر نەشئەی جام حەقیقەت تۆبیت
مرید سادق تەریقەت تۆ بیت
سەنگ سەبووری دڵەی کۆس کەفتەم
نەپای سەنگ سەرد وە ئارام خەفتەم
نەمەیووم نە دڵ تۆ بلاونۆ
وە نەزم چەمەر سەنگ بتاونۆ
ئیتر گوڵ ڕوخان وە بۆنەی کێوە
وە شەوق گوفتار کێ ببان لێوە

---

١- «موحەممەد عەلی سولتانی» کوڕی «موحەممەد تاهێر بەگ» وە یەکێ لە نووسەران و ئەدیبانی گەلی کوردەکە لە «حەدیقەی سولتانی»دا بەشێ لەژیان نامەوچەن شێعرێ لە شێعرەکانی «میرزا ئەحمەدی داواشی» لەچاپ داوە وەهەر وەهالە سالی ١٣٥٩ یادنامەیەکی بۆکۆچی دوایی هونەر نووسیوە. دۆسایەتی و عیلاقەی زۆری لەگەڵ شاعیردا بووە وە ئیستاش مامۆستای زانستگای «تارانە».

تا سەدات ماما چون هەزارەی مەست
مەعشووقە فەورەن ویش مەدا لە دەست
تەبع بولەندت بولەندتەر لە«قاف»
لەحن ڕەوانت چون مانگە شەو ساف
ئازیزا جە دووریت دیدە پڕهوونم
وە ئەفلاک یاوان کزەی دەروونم
نازاران وە شێعر تۆ مەویان شیرین
سەرداران وە نەزم تۆمەویان رووئین
ئیستە سەر نیای تۆ وە سەنگ سەرد
کەم شەرتان دەهرتۆشان نە یاد بەرد
نەمەردی میرزام مەستی زان جامت
سەبتەن نە دەفتەر ئەدیان نامت
یارەب بە خاتر «ئەحمەد موختار»
وە حەق ڕاسی ئەسحاب و ئەنسار
بویەر جە گونای «داواشی ئەحمەد»
حەشرش کەرچەنی دۆس «موحەممەد»

کرماشان ١٣٥٩ هەتاوی






گڵکۆر مەزاری خوالێخوش بوو «میرزا ئەحمەدی داواشی» لە مەقبەرستانی «أویس القرن»







به شی له وه سیه ت نامه ی خوالی خوشبوو

## «میرزا ئه حمه دی داواشی»

ئه حیانه‌ن ئازیز ئه گه‌ر من مه‌ردم
گیان جه رای توغرای زڵفت سپه‌ردم

ئه‌مجا ژه‌و ده‌مدا شۆخ نازارم
ئه‌شریف بار وه پای سه‌نگ مه زارم

وه حه‌سره‌ته‌وه نو نه‌مامه‌ی نۆم
په‌نجه‌ت بماڵه وه خاک گڵکوم

ده‌م بنیه‌ر وه بان گڵکوی تازه‌که‌م
واچه هه‌ی شه‌هید تیر نازه‌که‌م

ئه‌رچی بێ‌سووه‌ن له‌ی سه‌ر وه‌خته‌دا
زاری که‌ی وه بان خار سه‌خته دا

وه‌لی بۆ به‌یاد ویه‌رده‌ی وه رین
نه چه‌مان مه‌ست بریژه ئه‌سرین

به‌ل قه‌تره‌ی ئه‌سرت بگنۆوه رووی خاک
وه حه‌سره‌ته وه خاک که رۆ نمناک

جه‌و ده‌م په‌ی مه‌ڵهه‌م زامان خه‌سته‌م
وه گڵکۆوه وه مه‌گنو وه جه‌سته‌م

به وینه‌ی ئه‌نفاس «مه‌سیحای مه‌ریم»
ئه‌حیام مه‌که رو قه‌تره‌ی ئه‌سر چه‌م